# ژیانی منداڵیم

## چارلی چاپلین

وەرگێڕانی لە فارسییەوە

**فەرشید شەریفی**

**پێداچوونەوەی**

**ڕەسووڵ سوڵتانی**

**هەولێر - ٢٠١١**




دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی

**ژیانی منداڵیم**

**نووسینی:** چالی چاپلین

**وەرگێڕانی:** فەرشید شەریفی

**نەخشەسازی ناوەوە:** ڕەوان

**بەرگ:** هۆگر سدیق

ژمارەی سپاردن: (٧٠١) لەساڵی ٢٠١١

نرخ: ٣٠٠٠

چاپی یەکەم: ٢٠١١

تیراژ: (٧٥٠) دانە

چاپخانە: ڕۆژهەلات (هەولێر)

زنجیرەی کتێب (٥٨٦)

ماڵپەر: www.mukiryani.com

ئیمەیل: info@mukiryani.com

# ناوەرۆك

ئەم کتێبە وەرگێڕانێکە لە:

ژیانی منداڵیم- نووسینی چارڵی چاپلین- وەرگێڕانی لە فەرەنسیەوە بۆ فارسیی: مـحەمەد قازی- تاران- ١٣٥٧هەتاوی. ١٩٧٨زایینی.

زۆر شت هەن ژەنگ هەڵدێنن و
بیر دەچنەوە و دواییش دەمرن
وەکوو تاج و سەوڵەجان و
تەختی ژێر پێی پادشاکان.
زۆر شتی تری دنیاش هەن
نارزێن و بیر ناچنەوە و هەرگیز نامرن
وەکوو شەپقە و گۆچانەکە و پێڵاوەکەی
شارلی شاپلین
«مامۆستا شێرکۆ بێکەس»



سوپاس و پێزانینی تایبەتیم بۆ سەرجەم کارمەندانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم بە تایبەتیی کاك ئازاد بەرزنـجی و مامۆستا رەئووف بێگەرد کە بەوپەڕی دڵسۆزییەوە گەلەك هاریکارییان کردووم.

سوپاس و پێزانینی زۆر تایبەتیشم بۆ هاوڕێی خۆشەویستم کاك رێبوار هەڵەبـجەیی، کە کاروباری هەندێ لە کتێبەکانی بۆ راپەڕاندووم و زەحمەتی زۆری کێشاوە و ئەو کارەشی تەنیا لە رووی دڵسۆزیەو لە پێناوی خزمەت بە فەرهەنگ و ئەدەبیات و زمانی کوردیدا بووە. هیوادارم نـموونەی زۆر بێت.

فەرشیدشەریفی

## پێشەکیی وەرگێڕی کوردی:

«... وردە وردە خەریکە برسیم دەبێت. چاوێکم لە دۆلاَبەی خواردنەکان کرد، هیچم تیا نەدۆزییەوە..لە ماڵ چوومە دەرەوە و ئەو دوانیوەڕۆیە خۆم بە تەماشاکردنی بازاڕەکانی ئەو دەور و بەرەوە خافلاَند..... بە تاسەیەکی زۆرەوە تەماشای جامـخـانەی دووکانەکانم دەکرد و بە حەژمەتەوە تەماشای هەڵمی گۆشتە برژاوەکان و کەبابە بەتامەکانی بەراز و پەتاتە سوورکراوەکانم دەکرد. چەندکاتژمێرێك سەیری ئەو کاسبکارە گەڕۆکانەم دەکرد کە شەربەت(گیراوە) و خواردنەوەی جۆراوجۆریان دەفرۆشت. ئەو خۆخافلاَندنە، تۆزێك ئارامی و سووکنایی پێ بەخشیم و بۆ چەند ساتێك ئەو برسێتییەم لەبیرچۆوە وا تەنگی پێ هەڵچنیبووم...

... کاتێك گەڕامەوە بۆماڵەوە، شەو داهاتبوو. لە دەرگام دا، بەڵام کەس وەڵامی نەدامەوە. هەموویان چووبوونە دەرەوە. زۆر هیلاك و ماندوو بووم و... چرای هەموو دووکانەکان یەك لە دوای یەك دەکوژانەوە، جگە لە چرای دەرمانـخانە و مەشرووب فرۆشەکان نەبێت" منیش زۆر هەستم بەبێ دەرەتانی و دەستەوەستانی دەکرد.... تەنیا شتێك کە دەمویست ئەوە بوو بڕۆم بنووم... لە پلیکانەکان هاتـمە خوارەوە و لە ماڵ چوومە دەرەوە. ئیتر ماندوو نەبووم. ئارام بووبوومەوە..... ».

ڕەنگە ئەو چەند دێڕەی سەرەوە بەس بێت بۆ ئەوەی کەسێك حەز لە خوێندنەوەی ژیاننامەی نووسەرەکەی بکات. هەر بەڕاستیش ژیاننامەیەکی سەرنـجڕاکێشە و ئەوە دێنێت ئینسان ئەگەر بۆ تاقە جارێکیش بووە، بیخوێنێتەوە.

ئەم کتێبە وەك لە ناو و ناوەڕۆکەکەیەوە دیارە، ژیاننامەی هونەرمەندێکی گەورەی دنیای سینەمایە کە خۆی نووسیویەتی و زۆر شتی لەم کتێبەدا بە وردیی نووسیوەتەوە و پێم وایە پێویست بە ناساندنیشی ناکات، بەڵام بۆ بەخشینی هەندێك زانیاریی زیاتر لەسەر نووسەری کتێبەکە، بە پێویستم زانی ئاماژەیان



پێ بکەم. ئەویش ئەو شتانەن وا چارلی خۆی ئاماژەی پێ نەکردوون و منیش بە پێی توانا لە چەند سەرچاوەیەکی جیاجیاوە کۆم کردوونەتەوە و دەیـخەمە بەردەستی خوێنەر، بە تایبەتی ئەوانەی هۆگری دنیای سینەما و بە تایەبەتیش کۆمێدیەنە گەورەکەی جیهانی سینەمان" واتە چارلی چاپلین.

سەبارەت بەم وەرگێڕانەش دەبێ بڵێم ئەم کتێبە ئەوەندەی من بزانم لە لایەن چەند کەسێکەوە وەرگێڕدراوەتەوە سەر زمانی فارسیی و منیش ئەوەی وەرگێڕی کوردی فارسی نووس، مـحەمەدی قازیم کردە سەرچاوە، کە بەلامەوە وەرگێڕانێکی باش و جوان بوو و هەوڵ دراوە وەرگێڕانێکی سادە و ئاسانی لێ بە دەستەوە بدەین. ئەو ژێرنووسانەی هی وەرگێڕە فارسەکەن، بە شێوەی کورتکراوەی (و. ف) و ئەوانەی ئێمە نووسیومانن بە شێوەی کورتکراوەی (و. ك) دەسنیشان کراون. هەروەها لەو شوێنانەی کە بە پێویستم زانیبێت هەندێ رستە زیاتر روون کەمەوە، لەبەر ئەوەی تێکەڵی دەقەکە نەبن، لەناو هێمای ﴿... ﴾دا نووسیومن و پێوەندیی بە وەرگێڕی فارسەوە نییە.

## کورتەیەکی ژیانی چارلی چاپلین:

ساڵی١٨٨٩ لە لەندەن لە دایك بووە.

ساڵی ١٨٩٠ لە تەمەنی یەك ساڵییدا دایك و باوکی لە یەکدیی جیا بوونەتەوە.

ساڵی ١٨٩٥ واتە لەتەمەنی ٥ ساڵیدا بۆ یەکەمـجار چووە سەر شانۆ. چوونە سەر شانۆشی لە کاتێکدا بوو کە دایکی تووشی کێشەیەك هات و لە جیاتی ئەودا چووە سەر شانۆ بۆ درێژەدان بە نـمایشەکەی و چارلی خۆی دەڵێ:«لە راستیدا یەکەم دەرکەوتنی من هاوکات بوو لەگەڵ دوایین دەرکەوتنی دایکم لە شانۆدا».

ساڵی ١٩١٠ تا ١٩١٢ لەگەڵ فرێد کارنۆدا گەشتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکای دەست پێکرد. لەو کاتانەدا چاپلین لەگەڵ«ئستەنلی لۆرێل»کۆمێدیەنی بەناوبانگ پێکەوە لە ژوورێکدا دەژیان و دواتر لۆرێل گەڕایەوە بۆ بەریتانیا، بەڵام چاپلین لە ئامریکا مایەوە.

لە ساڵی ١٩١٤وە لە ستۆدیۆکانی کیستۆندا دەستی بە کار کرد و هەر لەوێش فێری تەکنیکی فیلمسازی بوو. چارلی سەرەتا لە فیلمەکاندا وەك کەسێکی ئاسایی دەردەکەوت و سەرنـجێکی ئەوتۆی خەڵکی رانەدەکێشا تا زۆر بە رێکەوت، جلێکی نائاسایی لەبەر کرد کە پێك هاتبوو لە پانتۆڵێکی پان و پۆڕ و جووتەپێڵاوێکی گەورە و قاتێکی تەسك و تەنگ و شەپقەیەك کە بە لای خۆیەوە زۆر جوان بوو و ئیتر دوای ئەوەش بوو بەو چارلی چاپلینە ئێسك سووکەی وا هەموو کەسێك خۆشی دەویست.

ساڵی ١٩١٥ «وێڵگەڕ»ە خوێن شیرینەکەی خوڵقاند.

لە ساڵی ١٩١٧وە بە شێوەی پرۆفیشناڵ لەگەڵ کۆمپانیای کیستۆندا دەستی بە کار کرد.

ساڵی ١٩١٦ لەگەڵ کۆمپانیای فیلمسازیی **mutual** دا گرێبەستێکی واژۆ کرد بۆ بەرهەمهێنانی ١٢ فیلمی کۆمێدیایی و هەمووشیانی بە ١٨ مانگ تەواو کرد.

ساڵی ١٩١٨ کۆمپانیای تایبەتیی خۆی لە هالیووددا دامەزراند.

ساڵی ١٩١٨ بۆ یەکەمـجار ژیانی هاوبەش پێك دەهێنێت.



ساڵی ١٩١٩ لەگەڵ ژمارەیەك لە هاوڕێکانی لەوانە: ماری پیکفورد »، «داگلاس فایربەنکس »و «دی گریفیت »، یەکێتیی هونەرمەندانیان دامەزراند کە تا سەرەتاکانی دەیەی پەنـجا سەرۆکی ئەو یەکێتییە بوو.

ساڵی ١٩٥٢ لە ئامریکا دوور دەخرێتەوە(نەفی دەکرێ) و لە وڵاتی سویس دەگیرسێتەوە و لەوێ نیشتەجێ دەبێت.

ساڵی ١٩٦٤ بیرەوەرییەکانی خۆی نووسییەوە کە ئەم کتێبەی بەردەستانە.

ساڵی ١٩٧٢ بە بۆنەی ئامادە کردنی موزیکی فیلمی«لایم لایت»، خەڵاتی ئۆسکاری وەرگرت. چاپلین بە گشتی بۆ ٢٣ فیلم موزیکی ئامادە کردووە.

ساڵی ١٩٧٥ میداڵی سوارچاکی (شوالییە)ی پێ دەبەخشرێت.

ساڵی ١٩٧٥ لە لایەن شاژن (مەلەکە)ی بەریتانیاوە ناونیشانی«سێر»ی پێ بەخشرا.

ساڵی ١٩٧٧ کۆچی دوایی کردووە. چەند مانگ دوای مەرگی، بە شێوەیەکی نەزانراو و ناڕوون، تەرمەکەی لە گۆڕەکەی دزرا و ون بوو، بەڵام پاش ماوەیەك، هێنرایەوە بۆ شوێنەکەی خۆی.

چارلی فیلمی«پەنابەر»بە باشترین فیلمی خۆی دەزانێ و دەڵێ «هیچکام لە فیلمەکانی ترم ئەوەندەی پەنابەر کاریگەرییان لەسەرم دانەناوە و دڵتەنگیشیان نەکردووم». پەنابەر فیلمێکی کۆمێدیاییە کە تیایدا پەنابەرەکان چاویان بڕیوەتە پەیکەری ئازادیی.

یەکەم فیلمی درێژ و شاکاری چارلی، «منداڵ» بوو کە تیایدا منداڵێکی ونبوو دەدۆزێتەوە و دەیەوێ بەخێوی بکات. دیارە فیلمی منداڵ لە خەم و خەفەتەکانی خودی چارلییەوە سەرچاوە دەگرێت، چونکە یەکەم منداڵی خۆی پاش چەند رۆژ لە لەدایکبوونی و چەند حەفتە پێش دەسپێکردنی دەرهێنانی ئەم فیلمە مردبوو و، رەنگە ئەو رووداوە بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ کاریگەریی لەسەر فیلمەکە دانابێت.

هەندێك لە بیرمەندە کۆمەڵناسەکان کە خوێندنەوەیان لەسەر ژیانی چارلی چاپلین کردووە دەڵێن: ئەو منداڵانەی کە دەکەونە بەر هەڕەشەی بێکەسی و بێ دەرەتانی و هەژارییەوە، هەموویان بەرەوڕووی چارەنووسێکی هاوچەشن نابنەوە. لەکاتێکدا کە هەندێکیان چینە هەژارەکانی کۆمەڵگا پێك دێنن، بەڵام هەندێکیتریان وەك چارلی چاپلین، زیرەك و داهێنەر دەبن.

چاپلین هەرچەند لە کارە هونەرییەکانیدا تەواو سەرکەوتوو بوو بەڵام بنەماڵەکەی تووشی کێشە و گرفتی زۆر بووەوە. چوار ژنی هێناوە و سیانیان بێ دواجار بوون. یەکەم هاوسەری ئەکتەرێك بوو بە

ناوی«میلدرێد هەریس ١٩١٨تا١٩٢٠»، دووهەم هاوسەری ئەکتەرێك بوو بە ناوی «لیتا گرەی ١٩٢٤ تا ١٩٢٨»، سێهەمین هاوسەریشی«پائولتا گادارد ١٩٣٦ تا ١٩٤٢» بوو کە لە فیلمی«سەردەمی مۆدێرن»دا دەوری بینی و دوای ئەوەش ناوبانگێکی زۆری پەیدا کرد. دواجار لە ساڵی ١٩٤٣ لەگەڵ «ئۆنا ئۆنیل » کچی شانۆنامەنووسی بەناوبانگ «ئیگن ئۆنیل» زەماوەندی کرد، کە تا کاتی مەرگی واتە ساڵی ١٩٧٧ پێکەوە ژیان و بوون بە خاوەنی هەشت منداڵ کە یەکێك لە کچەکانی بە ناوی ژراڵدین ئێستاش ماوە و لە تەمەنی ٦٤ ساڵی دایە و یەکێك لە کوڕەکانی بە ناوی سیدنی، ئەمساڵ (واتە ساڵی ٢٠٠٩ ی زایینی) کۆچی دوایی کرد.



## نامە بەناوبانگەکەی چارڵی چاپلین بۆ کچەکەی

نزیکەی ٣٠ ساڵە باس لە نامەیەك دەکرێت گوایە چاپلین بۆ ژراڵدینی کچی نووسیوە و ناوبانگێکی زۆری دەرکرد و منیش لەبەر ئەوەی پڕە لە هەست و سۆز و هەروەها هەندێ پەیامی جوان و ئینسانیشی تێدایە، پێم خۆش بوو وەرگێڕانی دەقی ئەو نامەیە لێرەدا بێنم .

## کچە باشەکەم ژراڵدینی ئازیز!

لێرە شەوە... شەوی نۆئێلە. لە قەڵا بچووکەکەمدا هەموو وەك جەنگاوەرانی بە بێ چەك و چۆڵ نووستوون. نەك هەر خۆشك و براکەت، بەڵکوو دایکیشت خەوی لێ کەوتووە. زۆر بە زەحمەت توانیم بە بێ ئەوەی کە ئەم باڵندە خەوتووانە بەخەبەر بێنم، خۆم بگەیێنمە ئەم ژوورە نیوە رووناکە" ئەم ژوورەی کە ژووری چاوەڕوانکردنی مەرگمە.

من گەلێك لە تۆ دوورم... زۆر دوور... بەڵام چاوەکانم کوێر بن ئەگەر بۆ چرکەیەکیش تۆم لە بیر بچێتەوە. وێنەکەی تۆ لەوێیە لەسەر مێزەکە. هەروەها لەناو دڵمدا. بەڵام تۆ لە کوێیت؟ لە پاریسی سیحراوی و لەسەر شانۆی پڕ شکۆی شانزە لیزەدا خەریکی سەماکردنیت. بەڵێ ئەوە دەزانم و وەك ئەوە وایە لەناو بێدەنگیی ئەم شەوەزەنگەدا گوێم لە ترپەی پێتە و لەناو تاریکیی ئەم شەوە زستانییانەدا درەوشانەوەی چاوەکانت دەبینم.

بیستوومە لەو شانۆگەرییەدا دەوری ئەو شازادە ئێرانییە دەبینی کە لە چنگی خانی تاتاردا دیلە. هەر شازادە بـمێنەرەوە و سەما بکە. ئەستێرە بەو بدرەوشەرەوە، بەڵام ئەگەر پێکەنین و دەسخۆشانەی تەماشاکەران و هەروەها بۆنی عەتری ئەو گوڵانەی کە بۆیان هێناویت، دەرفەتێکی بیرکردنەوەیان بۆ رەخساندیت، لە سووچێکدا دانیشە و ئەم نامەیەم بـخوێنەرەوە و گوێ لە دەنگی باوکت بگرە.

من باوکتم ژراڵدین! من چارڵی چاپلینم! کە منداڵ بوویت، شەوانی شەو لەسەر سەرینت دادەنیشتم و حەکایەتی زۆرم بۆ دەگێڕایتەوە. حەکایەتی شۆخ و شەنگە خەوتووەکەی ناو دارستان. حەکایەتی ئەژدیهای بەخەبەری ناو بیابان. کە خەریك بوو خەو بـمباتەوە، لۆمەی خەوەکەم دەکرد و پێم دەوت: بڕۆ لەکۆڵم بەوە! من لە ناو خەونی کچەکەمدا نووستووم. خەونم دەدی ژراڵدین! ، خەون... خەونی داهاتووی تۆ، خەونی ئەمڕۆی تۆ.

کچێکم لەسەر شانۆ دەبینی، فریشتەیەکم دەبینی کە بە ئاسماندا سەمای دەکرد و گوێم لێ بوو تەماشاکەرەکان دەیانوت: چاوت لەو کچەیە؟ ئەمە کچی هەمان ئەو قەشمەرە پیرەیە! ناوەکەیت لەبیرە؟ چارلی! .

بەڵێ من چارلیم. من لە قەشمەرێکی پیر زیاتر هیچ نیم. ئەمڕۆ نۆرەی تۆیە! من بەو پانتۆڵە پان و پۆڕەوە سەمام دەکرد و تۆ بە جلی حەریری شازادەکانەوە سەما دەکەیت! ئەو سەماکردنانە و لەوە زیاتریش دەنگی چەپڵەلێدانی تەماشاکەرەکان هەندێ جار بەرەو ئاسمانت دەبات. بڕۆ! بڕۆ بۆ ئەوێش، بەڵام هەندێ جاریش وەرەوە بۆ سەر زەویی و چاو لە ژیانی خەڵکی بکە! ژیانی ئەو سەماکەرە گەڕۆکانەی ناو کۆڵانە تاریکەکان، کە برسێتیی تەنگی پێ هەڵچنیون و لەکاتی سەماکردندا قاچەکانیان دەلەرزن. منیش یەکێك لەو کەسانە بووم ژرالدین! .

لەو شەوە ئەفسانەییەی منداڵیی تۆدا کە حەکایەت گێڕانەوەکانی من وەکوو لای لاییەك دەیـنواندی، من هەر بەخەبەر دەبووم و تەماشای دەموچاوی تۆم دەکرد و ترپەی لێدانەکانی دڵی تۆم دەژمارد و ئەو پرسیارەم لە خۆم دەکرد: چارلی! ئاخۆ ئەم بەچکە پشیلەیە هەرگیز دەتناسێتەوە؟. تۆ من ناناسیت ژرالدین. لەو شەوە درێژانەدا چەندین حەکایەتم بۆ گێڕایتەوە بەڵام هەرگیز حەکایەتی خۆمم بۆ نەگێڕایتەوە. ئەوەش بۆ خۆی حەکایەتێکی خۆش و سەرنـجڕاکێشە:

حەکایەتی ئەو قەشمەرە پیرەی کە لە پیس و پۆخڵترین گەڕەکەکانی لەندەندا گۆرانیی دەچڕی و سواڵی دەکرد. ئەمە چیرۆکی بەسەرهاتی منە. من تامی برسێتیم چەشتووە. ئازاری بێکەسی و بێ دەرەتانییم تا سەر ئێسقان هەست پێ کردووە. هەروەها هەستم بە رەنج و ئازاری ئەو قەشمەرە گەڕۆکەش کردووە کە ئۆقیانووسێك لە غروور لەناو دڵیدا پەنگی خواردۆتەوە، بەڵام پارەی خێراتی رێبوارێکی فیزن و لەخۆبایی تێکی دەشکێنێت.

بە هەموو ئەوانەشەوە هێشتا زیندووم و نابێ باسی زیندووەکان بکرێت بەرلەوەی کە بـمرن. چیرۆکی من بە کەڵکی تۆ نایەت. با باسی تۆ بکەین! پاشگری ناوەکەت ناوی چاپلینە! من هەر بەو ناوەوە، چل ساڵ زۆربەی خەڵکی دنیام خستە پێکەنینەوە، بەڵام ئەوان چەند پێ کەنین، من هەزاران ئەوەندە گریاوم.

ژرالدین! پێت وا نەبێت ئەو دنیایەی کە تۆی تیا دەژی، تەنیا سەما و مۆسیقای تیایە و هیچی تر. کاتێك درەنگانی شەو لە شانۆ دێیتە دەرەوە، ئەو تەماشاکەرە دەوڵەمەندانە بە یەکجاریی لەبیر بکە. بەڵام لە حاڵ و ئەحواڵی ئەو شۆفێر تاکسییە بپرسەوە کە دەتگەیێنێتە ماڵەوە. لە حاڵی ژنەکەشی



بپرسەوە“ ئەگەر دووگیان بوو و بۆ کڕینی جلی منداڵەکەی پارەی نەبوو، بە دزییەوە هەندێك پارە بـخەرە گیرفانییەوە.

هەندێ جار بە پاس و مێترۆ بەناو شاردا بگەڕێ و تەماشای خەڵك بکە. تەماشای بێوەژنان و منداڵە هەتیوەکان بکە و بە لانیکەمەوە رۆژێك یەك جار بە خۆت بڵێ: منیش یەکێکم لەوان! کچەکەم تۆش یەکێك لەوانی و لەوەش زیاتر نیت. «هونەر پێش ئەوەی کە دوو باڵ بۆ فڕین بە مرۆڤ ببەخشێت، زۆربەی جار هەردوو قاچەکەی دەشکێنێت». کاتێك گەییشتیتە ئەو رادەیەی کە تەنیا بۆ یەك چرکەش خۆت لە تەماشاکەرانت بە گەورەتر بزانیت، دەسبەجێ شانۆکە بەجێ بێڵە و بە یەکەم تاکسیی خۆت بگەیێنە گەڕەکەکانی دەوروبەری پاریس. من ئەو شوێنانە باش دەناسم. چەندین سەدە شوێنی ژیانی قەرەجەکان بووە. لەوێدا سەماکەرانی وەکوو خۆت دەبینی، جوانتر و شۆخ و شەنگتر و بەگوڕتر لە خۆت! . ئەوێ وەکوو شانۆەکانی شانزە لیزە شەوچرای گەورە و رووناکی بەخشی لێ نییە. چرای قەرەجەکان تەنیا مانگەشەوە و هیچی تر. بڕوانە! باش بڕوانە! ئاخۆ باشتر لە تۆ سەما ناکەن؟. دانی پێدا بنێ کچەکەم! هەمیشە کەسێك هەیە لە تۆ باشتر بێت. ئەوەش بزانە کە لەناو بنەماڵەی چاپلیندا هەرگیز کەسیان ئەوەندە لەخۆبایی و چاوقایم نەبووە کە جنێو بە کالسکەچی (پەیتوونچی)، یان سواڵکەرێکی کەناری رووباری «سێن» بدات! .

من دەمرم بەڵام تۆ دەژیت. هیوادارم هەرگیز بە هەژاریی نەژیت... هەمیشە کاتێك دوو فرانك خەرج دەکەیت، بە خۆت بڵێ کە سێهەم فرانك، هی تۆ نییە و رەنگە هی پیاوێکی بێ ناونیشان بێت کە ئەمشەو پێویستی بە فرانکێك هەیە. پێویست ناکات بەدوایدا بگەڕێیت، ئەگەر حەز بکەیت ئەو هەژارە بێ ناونیشانانە ببینیتەوە، لە هەموو جێگایەکدا هەن. ئەگەر باسی پارە و دراوت لەگەڵ دەکەم، لەبەر ئەوەیە کە زۆر باش شارەزای هێزە سیحراوییەکەی ئەو منداڵە چەتوون و سەربزێوەم. من سەردەمێکی دوور و درێژ لەناو سیرکدا ژیاوم و هەمیشە نیگەرانی ئەو بەنبازانە بوومە کە لەسەر پەتێکی باریك و ناسکدا بەرێگەدا دەچوون. بەڵام کچەکەم با ئەو راستییەت پێ بڵێم: ئەو خەڵکانەی کە لەسەر زەویی ساف و هەمواردان، زیاتر لەو بەنبازانەی سەر تەنافەکە دەکەونە خوارەوە و دادەڕووخێن. رەنگە شەوێك وریشەی گرانبایيترین ئەڵماسی دنیا فریوت بدات و بە دڵنیاییەوە هەر ئەو ئەڵماسە، بەنێکی ناسك دەبێت کە لێی دەکەویتە خوارەوە! دڵ بە زێڕ و زیو خۆش مەکە، چونکە گەورەترین ئەڵماسی ئەم جیهانە هەتاوە، کە بەختەوەرانە تیشك بۆ هەموو کەسێك دەهاوێ و هەموان

به یەکسان لێی بەهرەمەندن. بەڵام ئەگەر هات و دڵت بە هەتاوی روخساری پیاوێك خۆش کرد و گیرۆدەی بوویت، لەگەڵی راستگۆ بە. بە دایکیشتم وتووە لەو بارەوە نامەیەکت بۆ بنووسێت. ئەو باشتر لە من لە مەسەلەی خۆشەویستیی دەزانێت و باشتر لە من دەتوانێت باسی هاودڵیی و راستگۆییت بۆ بکات.

دەزانم کارەکەت زۆر سەختە. لەسەر سەکۆی شانۆدا بێجگە لە حەریرێکی ناسك هیچ شتێکی دیکە لەشت داناپۆشێت. دەکرێ لە پێناوی هونەردا مرۆڤ خۆی رووت بکاتەوە و بە رووتی بچێتە سەر شانۆ و بە داپۆشراوی و پاکییش بگەڕێتەوە. بەڵام هیچ شتێکی تر لەم دنیایەدا نییە شیاوی ئەوە بێت کە کچێك تەنانەت نینۆکی قاچیشی بۆ دەربــخات. «ڕووتی» گەورەترین نەخۆشیی ئەم سەردەمەی ئێمەیە و منیش پیاوێکی پیرم و لەوانەیە ئەم قسانەم بێ بایەخ و پێکەنیناوی بن، بەڵام من پێم وایە دەبێ لەشی رووتی تۆ، هی کەسێك بێت کە رۆحی رووتیت خۆش بوێت. رەنگە وا باشتر بێت لەم روەوە وەکوو دە ساڵ لەمەوبەر بیر بکەیتەوە، واتە سەردەمی پۆشتەیی و داپۆشراویی. مەترسە ئەم دە ساڵە پیرت ناکات... بە هەر حاڵ هیوادارم تۆ دوایین کەس بیت کە پێڕەوی دوورگەی رووتەکان بیت! دەزانم کە باوك و ئەولادەکان هەمیشە لەناو ململانێیەکی نەبڕاوە دان. شەڕم لەگەڵ بکە! بێ بە گژ بیر و بۆچوونەکانــمدا. من منداڵی دەستەمۆ و ملکەچم خۆش ناوێ. سەرەڕای هەموو ئەمانەش بەر لەوەی کە فرمێسکەکانم ئەم نامەیە تەڕ بکەن، دەمەوێ دڵخۆشییەکی خۆم بدەمەوە" ئەمشەو شەوی نۆئێلە، شەوی موعجیزەیە" هیوادارم موعجیزەیەك روو بدات کە بەڕاستی تێگەییشتبیت لە هەموو ئەو شتانەی کە لە دڵمدا بووە و ویستوومە پێتی بڵێم.

ئیتر چارلی پیر بووە ژراڵدین! درەنگ یا زوو دەبێ لە جیاتی جلی شانۆ، جلی پرسە و ماتەم لەبەر بکەیت و بێیتە سەر گۆڕەکەم. هەرچەند حەز ناکەم ئەو عەزیەتیشە بکێشیت و بێیتە سەر گۆڕەکەم، بەڵام هەندێ جار لە ئاوێنەدا تەماشای خۆت بکە و لەوێدا من دەبینیتەوە. خوێنی من لەناو دەمارەکانی تۆ دایە.

هیوادارم تەنانەت ئەو کاتەش کە خوێن لە دەمارەکانــمدا وشك دەبێت، چارلیی باوکت لەبیر نەکەیت.

«من فریشتە نەبووم بەڵام هێندەی لە توانامدا هەبوووبێت هەوڵم داوە ئینسان بم، تۆش هەوڵ بدە ئینسان بیت! ».



## باشترین کاتەکانی ژیان لە روانگەی چارلی چاپلینەوە

- ☐ خۆشەویستی.
- ☐ ئەوەندە پێ بکەنیت ژانە دڵ بگریت.
- ☐ پاش گەڕانەوە لە سەفەرێك، هەزار نامەت بۆ هاتبێت.
- ☐ سەفەر بکەیت بۆ شوێنێکی خۆش و دڵڕفێن.
- ☐ لە رادیۆوە گوێ لە گورانییەکی دڵخوازی خۆت بگریت.
- ☐ لەناو نوێنەکەتدا بیت و گوێت لە دەنگی بارینی باران بێت.
- ☐ کە لە حەمام هاتیە دەرەوە، خاولییەکی گەرمت بۆ ئامادە کرابێت.
- ☐ کەسێك کە بە دەگمەن دەیبینیت، بەڵام حەز بکەیت تەلەفۆنێکت بۆ بکات.
- ☐ لەناو پانتۆڵێکدا کە ساڵی پار لەبەرت دەکرد، بڕێك پارە بدۆزیتەوە.
- ☐ بەرانبەر ئاوێنە دانیشیت و هەندێ کاری پێکەنیناویی ئەنــجام بدەیت.
- ☐ تەلەفۆنی شەوانەت هەبێت و چەندین کاتژمێر بــخایەنێت.
- ☐ بە رێکەوت ببیستیتەوە کە کەسێك تاریفت دەکات.
- ☐ کە لە خەو هەستایت، بتوانیت چەند کاتژمێری تریش بنوویتەوە.
- ☐ گوێ لە گۆرانییەك بگریت کە کەسێکی تایبەتیت بێنێتەوە یاد.
- ☐ لە سەر گردێکەوە تەماشای ئاوابوونی خۆر بکەیت.
- ☐ هاوڕێی تازە بدۆزیتەوە.
- ☐ کاتێك چاوت بە«ئەو» دەکەوێت، دڵت داخورپێت.
- ☐ لەگەڵ هاوڕێکانتدا کاتی خۆش بەریتە سەر.
- ☐ ئەو کەسانەی کە خۆشت دەوێن، بە خۆشحاڵ بیانبینی.
- ☐ کاتی ئێواران لە کەنار ئاوەکاندا پیاسە بکەیت.
- ☐ کەسێك هەبێت بزانیت خۆشی دەوێیت.

- ئەوە بێنیتەوە بیری خۆت کە هاوڕێکانت کارانی چەندە گەمژانەیان دەکرد و تۆش پێ بکەنیت و پێ بکەنیت و.... دیسان پێ بکەنیت.
- ژیان کێشەیەك نییە کە دەبێ چارەسەر بکرێت بەڵکوو خەڵاتێکە دەبێ چێژ و خۆشیی لێ وەربگریت.
- کاتێك ژیان ۱۰۰ بیانووت بۆ گریان نیشان دەدات، تۆ ۱۰۰۰ بیانوو بۆ پێکەنینی نیشان بدە.

ئەمانە باشترین کاتەکانی ژیانن و ڕێزیان لێ بگرین.

فەرشید شەریفی- هەورامان ۲۰۰۹
**Email: baran1356@gmail. com**



## پێشەکیی وەرگێڕی فارسیی:

ژیانی ناودارانی زانست و ئەدەب و هونەر لەو کاتەیدا کە لە لووتکەی ناو و ناوبانگ دان بۆ هەموو کەس روون و ئاشکرایە، چونکە خۆشەویستی خەڵکن و خەڵکیش حەز دەکەن لێیان ئاگادار بن.

بەڵام سەردەمانێك هەبووە هەر ئەم ئینسانە ناودارانە کە رووناکیی کۆمەڵگا مرۆییەکانن، هێشتا بە هیچ کوێ نەگەییون و وەکوو خەڵکی تر بە نەناسراویی ژیاون و تەنانەت رەنگە چەرمەسەری و ناکامی و بەدبەختیی زۆریشیان کێشابێت و بە تەحەمولکردنی هەژاریی و برسێتی هەوڵیان داوە بەربەستەکان بدەنە لاوە و خۆیان بە لووتکەی کۆمەڵگا بگەیەنن.

ژیانی هونەرمەندی گەورەی دنیای سینەما چارڵی چاپڵینیش کە بێگومان یەکێك لە ناودارترین هونەرمەندانی ئەو بوارەیە، لەو رێسایە بە دوور نییە و ئەمڕۆ کەم تا زۆر هەموو کەسێك ئاگایان لە گەشەکردن و گەورەیی ئەو هەیە، بەڵام کەمتر کەسێك هەیە بزانێت کە ئەم هونەرمەندە گەورەیە بۆ ئەوەی ببێتە«چارڵی» لە کوێوە دەستی پێ کردووە. بەختەوەرانە خودی چارڵی هەندێ گۆشەی تەمومژاویی سەرەتاکانی ژیانی خۆی بۆ روون کردووینەتەوە و ئەم کتێبەش دەگەڕێتەوە بۆ هەمان ئەو سەردەمانەی کە کەس چارڵیی نەدەناسی و نەشیدەزانی کە رۆژێك دەبێتە گەورەترین ئەستێرەی سینەما.

هیوادارم خوێنەرە لاوەکان، بە تێڕامان لە دێڕەکانی ئەم کتێبە، چرایەك لە بەردەم رێگای ژیاندا هەڵبکەن .

مــحەمەد قازی

## دەسپێك

پێش دروستکردنی پردی«وێست مین ستر»، شەقامی«کنینگتۆن» تەنیا تووڵەڕێیەکی بچووك بوو. لە ساڵی ١٧٥٠ بە دواوە، جادەیەکی تازەیان چێ کرد کە لە سەرەتای پردەکەوە دەستی پێ دەکرد و لەندەنی دەبەستەوە بە «برایتن»ەوە. کەواتە شەقامی کنینگتۆن، کە من خۆشترین کاتەکانی سەردەمی منداڵیمم تیا بەسەر بردووە، بە هۆی ئەو هەموو خانووە جوانانەی تیایدا بوو، شانازیی بە خۆیەوە دەکرد. ئەو ماڵانە، سەیوان و تارمەگەلێکی ئاسنینیان بەلای شەقامەکەدا هەبوو و سەردەمانێك دانیشتووەکانیان، لەسەر ئەو تارمانەوە، «ژۆرژی چوارەم »یان بینیوە کە بە کالسکەکەیەوە بەرەو برایتن دەڕۆیشت.

لە ناوەڕاستەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا، زۆربەی ئەو ماڵانە، کران بە ئاپارتمان و خانووی کرێ. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەندێك لەو ماڵانە بەو دەردە نەچووبوون و هێشتا پزیشك و بازرگانی گەورە و ئەکتەری شانۆیان تیا نیشتەجێ بوون. بەیانییانی یەکشەممە، لەبەردەم یەکێك لەو خانووانەی شەقامی کنینگتۆندا کالسکەیەکی بریتانی کە ئەسپێکی تێژڕەوی پێوە بەسترابۆوە، دەبینرا کە ئامادە کرابوو بۆ ئەوەی هونەرمەندێك ببات بۆ گەشتێکی پازدە کیلۆمەتری، بۆ «نۆرڤۆد» یان «مۆرتۆن» و لە گەڕانەوەشیدا لەبەردەم مەیـخانەکانی «ئەسپی سپی» و «پەرداخ» و «گڵاس»ـدا کە هەمووشیان هەر لەو شەقامەدا هەڵکەوتبوون، دەوەستا.

لە دوانزە ساڵیدا، من زۆربەی کات لەبەردەم مەیـخانەی «پەرداخ»دا دەوەستام تا ئەو پیاوە ڕێکوپێك و خۆش سەروسیمایانە تەماشا بکەم کە لە کالسکەکانیانەوە دادەبەزین و دەچوون بەرەو لای بەشی باڕی مەیـخانە، کە سوپەرستاری «هۆڵی شانۆ»ش لەوێدا بوو. چونکە ئەوە بەشێك بوو لە بەرنامەی بەیانییانی یەکشەممەیان، کە پێش گەڕانەوەیان بۆ ماڵەوە و خواردنی نانی نیوەڕۆ، دوایین پـێکی خواردنەوەیان لەوێدا بـخۆنەوە. ئاخ... ! ئەو پیاوانە بەو جلە جوان و شەپقە ڕەنگ خۆڵەمێشییانە و وریشە و باق و بریقی ئەنگوستیلە و هەروەها دەرزیی بۆینباخەکانیانەوە، چەند جوانو بەشکۆ بوون! مەیـخانە کاتژمێر٢ی پاش نیوەڕۆی یەکشەممە دادەخرا و مشتەرییەکان یەك لە



دوای یەك لێی دەچوونە دەرەوە و پێش ئەوەی ماڵاوایی لە یەکدیی بکەن، چەند چرکەساتێك دەوەستان و منیش کەیفم پێ دەهات و بە تاسەوە سەیرم دەکردن، چونکە کراسی هەندێکیان بە شێوەیەکی سەیر و پێکەنیناویی، هەڵپۆقیبوو.

کاتێك دوایین کەسیان دەڕۆیشت، وەك ئەوە وابوو خۆر چووبێتە پشت هەورەوە. لەوکاتەدا من دەگەڕامەوە بەرەو لای خانووە شڕ و کۆنەکانی پشت شەقامی کنینگتۆن تا بەردەم خانووی ژمارە٣ی کۆڵانی«پاونێل تراس» و بەو پلیکانە شەق و شڕانەدا سەردەکەوتم تا دەگەیشتمە خانووە بچووکەکەی خۆمان. بیناکە ڕواڵەتێکی زۆر ناشیرینی هەبوو و پڕ بوو لە بۆگەنی جلی کۆن و شۆردراو. بەڵام یەکشەممەی ئەو ڕۆژە، کاتێك چوومە ناو ژوورەکەوە، دایکم لەبەردەم پەنـجەرەکەدا دانیشتبوو و تەماشای دەرەوەی دەکرد. ئاوڕێکی دایەوە و زەردەخەنەیەکی کزی کرد.

ژوورەکە زۆر بچووك بوو، نزیکەی سێ لە چوار مەتر دەبوو تۆزێك کەمتریش، جا چونکە میچەکەشی خوار بوو و نزمیش دەهاتە بەرچاو، هەربۆیە لەوەش کە هەبوو بچووکتر دەینواند. سەر مێزەکە کە پاڵ درابوو بە دیوارەکەوە پڕ بوو لە پەرداخ و قاپ و کەوچکی پیس و نەشۆردراو. لە سووچێکی تری ژوورەکەدا کە دیوارەکەی نەویتر بوو، کۆنە قەرەوێڵەیەکی ئاسنیی لێبوو کە دایکم بە ڕەنگی سپیی بۆیەی کردبوو. لە نێوان قەرەوێڵە و پەنـجەرەکەدا، سۆبەیەکی بچووك هەبوو و لەبەردەم قەرەوێڵەکەدا مۆبلێك، کە پشتەکەی درێژ دەکرایەوە و دەبوو بە قەرەوێڵەیەکی یەك نەفەرە کە براکەم «سیدنی»لەسەری دەنووست. بەڵام لەو کاتەدا سیدنی زۆر لە ئێمە دوور بوو و چووبوو بۆ سەفەرێکی دەریایی.

***

یەکشەممەی ئەو ڕۆژە، ژوورەکە ڕواڵەتێکی ناشیرینتری هەبوو، نازانم بۆچی دایکم ئیش و کارەکانی ناوماڵەوەی ڕانەپەڕاندبوو. چونکە دایکم زۆر بە دیقەتەوە کارەکانی ناو ماڵەوەی دەکرد و ژنێکی یەکجار گورج و گۆڵ و سەرخۆش و لە هەمان کاتیشدا هێشتا گەنج بوو و تەمەنی٣٧ساڵ زیاتر نەبوو و دەیتوانی لەناو ئەو ژوورە بچووکەکەی خانووەکەماندا دڵخۆشی و هێمنییەکی بێوێنە بـخولقێنێت. بەتایبەت بەیانیانی یەکشەممەی وەرزی زستان، کە دایکم خواردنی بەیانیی دەهێنایە لای قەرەوێڵەکەم، کاتێك خەبەری دەکردمەوە، خۆم لەناو ژوورێکی بچووك، بەڵام گەرم و نەرم و ڕێکوپێکدا دەبینییەوە کە سۆبەکەی داگیرسابوو و کترییەك ئاو لەسەری دەکوڵا و هەڵمی لێ بەرز دەبووەوە و

پارچەیەك شاماسیی  کە بە پێی عادەت لە بەردەم سۆبەدا بە گەرمیی رایدەگرن، ئامادە کرابوو و، لەگەڵ ئەوەشدا نانەکەشی بۆ گەرم دەکردمەوە. حزووری گەرم و دڵخۆشکەری دایکم، نەزم و رێکوپێکی و هێمنی ژوورەکە، دەنگی نزم و هێوری ئەو ئاوە کوڵاوەی کە لە کترییەکەوە دەڕژایە ناو قۆرییە گڵییەکەوە، ئەویش لە کاتێکدا کە من هەواڵە وێنەدارەکانی حەوتووم دەخوێندەوە، ئەمانە هەموویان بەشێك بوون لە خۆشییەکانی بەیانییەکی خۆش و ئارامی یەکشەممە.

بەڵام ئەو رۆژی یەکشەممەیە، دایکم لە دالْغەدا بوو، لە نزیك پەنــجەرەوە دانیشتبوو. سێ رۆژ دەبوو لەو شوێنەی خۆی نەدەجوولا و بە شێوەیەکی سەیر، بێدەنگ و لەدالْغەدا بوو. من دەمزانی خەمو خەفەتی زۆرە. سیدنی چووبوو بۆ سەفەرێکی دەریایی و دوو مانگیش بوو هیچ خەبەرێکمان لێی نەبوو. لەگەڵ ئەوەشدا چونکە دانەوەی قستی قەرزەکانی بەدرەنگ کەوتبوو، هاتبوون مەکینەی دوورمانەکەی لێ بستێننەوە کە دایکم لەو رێگەیەوە بژێویی ژیانــمانی دابین دەکرد. ئەو حەقدەستە یەکجار کەمە پێنج شلینگیەش کە بۆ فێرکاریی سەماکردن لە هەفتەیەکدا دەستم دەکەوت، لە پڕێکدا بڕا. بە سەختی دەمتوانی ئەوە دەرك بکەم کە ئەو بارودۆخەی تیایدا دەژیاین، وەکوو قەیرانێك وایە، ئەویش لەبەر ئەوە بوو کە ئێمە هەمیشە لە دۆخێکی قەیراناویدا دەژیاین و منیش چونکە هێشتا منداڵێکی بچووك بووم، خەمساردانە، خۆم لەو ناخۆشییانە گێل دەکرد. بە پێی عادەت، پاش تەواوبوونی خوێندنگە، بە پەلە دەگەڕامەوە بۆ ماڵەوە بۆ لای دایکم. ئەو شتانەی وا پێویستی پێیان بوو لە بازاڕ بۆم دەکڕی. ئاوە پیسەکانم دەڕشت و سەتڵێك ئاوی پاکم دەهێنا. پاشان دەچووم بۆ ماڵی خانم و ئاغای «مەك کارتی» تا شەو لەگەڵیاندا بم. راستییەکەی دەچوونەکەم زیاتر راکردن بوو لەدەست ئەو ژوورە نەگبەتەکە ماڵی خۆمان. خانم و ئاغای مەك کارتی، هاوڕێی دێرینی دایکم بوون کە هەر لەو سەردەمەوە کە لە تەماشاخانەدا کاری دەکرد، یەکتریان ناسیوە. ئەوان لە یەکێك لە جوانترین بەشەکانی شەقامی کنینگتۆندا ئاپارتــمانێکی رێکوپێکیان هەبوو و دەوڵەمەند و بەختەوەر بوون و لە ئێمەش نزیك بوون.

خانم و ئاغای مەك کارتی کوڕێکیان هەبوو بە ناوی«ڤۆلی»کە تا کاتی خۆرئاوابوون پێکەوە یاریــمان دەکرد و زۆربەی کات بۆ چاخواردنەوە لە ماڵەکەیان دەمامەوە. هەروەها چونکە زۆر لە ماڵیان دەمامەوە، چەند جۆر خواردنی تریشم دەخوارد. هەندێ جار خانــمی مەك کارتی هەواڵی دایکمی دەپرسی و دەیوت بۆچی ماوەیەکە دیار نییە؟ منیش بیانوویەکم دێنایەوە، چونکە لەو



کاتەوەی دایکم هەندێ کێشە و گرفتی بۆ پەیدا بووبوو، زۆر کەم چاوی بە و هاوڕێیانیەی دەکەوت کە هاوڕێی شانۆی بوون.

دیارە هەندێ رۆژیش لە ماڵێ دەمامەوە و دایکم چای لێ دەنا و هەروەها نانی لە ناو بەزی گادا بۆ سوور دەکردمەوە کە من زۆر حەزم لێی بوو. ناچاریشی دەکردم سەعاتێك لەسەر یەك کتێب بــخوێنمەوە، چونکە خۆی کتێبی زۆر دەخوێندەوە. لەو کاتانەدا دەرکم بەوە دەکرد کە هاوڕێیەتی و هاودەنگی لەگەڵ دایکمدا چەند خۆشە و دەمزانی مانەوەم لە ماڵەکەی خۆماندا زۆر خۆشتر بوو لەو کاتانەی کە لە ماڵی خانم و ئاغای مەك کارتیدا رامدەبوارد.

بەڵام ئەو رۆژە کاتێك چوومە ناو ژوورەکەوە، دایکم بە نیگایەکی تەوساوی و پڕ لە لۆمەوە سەیری دەکردم. بە بینینی ئەو حاڵەتەی تێك چووم. لەڕ و لاواز و سیمایەکی غەمباری هەبوو و هەموو گیانی خەم و خەفەتی لێ دەباری. خەمێکی کوشندە دایگرتم و لە نێوان دوو بڕیاردا دوودڵ بووم. ئاخۆ لە ماڵێ بــمێنمەوە و نەهێڵم دایکم بە تەنیا بێت، یان ئەو کەش و هەوا پڕ لە خەم و خەفەتە بە جێ بهێڵم؟ دایکم چاوێکی پڕ لە خەم و خەفەتی لێ کردم و گوتی:

_ بۆچی ناڕۆی بۆ ماڵی خانم و ئاغای مەك کارتی؟

خەریك بوو فرمێسك لە چاوانم بێتە خوارەوە، وتم:

_ چونکە دەمەوێ لای تۆ بــمێنمەوە.

سەری بەولاْدا سووڕاندەوە تا لە پەنــجەرەکەوە لەدەرەوە بڕوانێت.

_ بڕۆ بۆ ماڵی خانم و ئاغای مەك کارتی و هەر لەوێش نانی ئێوارەت بــخۆ... لێرە بۆ نانی ئێوارەت هیچ خواردنێك دەست ناکەوێت.

جۆری قسەکردنی، تەوساویی بوو بەڵام بە رووی خۆمم نەهێنا.

بە تۆزێك نابەدڵیی و ناڕاستگۆییەوە گوتم:

_ باشە ئەگەر تۆ حەز دەکەیت بڕۆم بۆ ئەوێ، ئەوا دەڕۆم.

زەردەخەنەیەکی بچووکی کرد و دەستێکی بە سەرمدا هێنا و گوتی:

_ بەڵێ حەز دەکەم بڕۆیت، دەی خێراکە...

منیش زۆر پاڕامەوە لە لای بـمێنمەوە، بەڵام ئەو بە زۆر پاڵی پێوە نام بۆ دەرەوە. بە ناچار لە حاڵەتێکدا کە لەبەر خۆمەوە هەستم بە تاوانبارسی دەکرد، چوومە دەرەوە و ئەوم لەو ژووره بچووکەدا بە جێ هێشت. بێ ئەوەی بزانم کە لە ڕۆژانی دواتردا، چ چارەنووسێکی ترسناک چاوەڕێی دەکات.



١

## بنەماڵەی پەرتەوازە

من لە ئاپریلی ساڵی ١٨٨٩، کاتژمێر هەشتی شەو لە کۆڵانی «ئێست لین»ی شەقامی «ڤالۆرس»دا لە دایك بووم. ماوەیەك دواتر، ماڵەکەمان گوازرایەوە بۆ «وێست سکۆیر» لە شەقامی «سێنت جۆرج» گەڕەکی «لامبێس». بە قسەی دایکم، ئەو دنیایەی کە من پێم تێ نابوو، دنیای بەختەوەریی بوو. ئێمە بنەماڵەیەکی تا رادەیەکی باش، خۆشگوزەران و دەوڵەمەند بووین. سێ ژوورمان هەبوو کە زۆر بە ڕێکوپێکیی و بە سەلیقەیەکی جوانەوە رازابوونەوە. یەکێك لە یەکەم بیرەوەرییەکانم ئەوەیە کە هەموو شەوێك پێش ڕۆیشتنی دایکم بۆ شانۆ، من و سیدنیی برام، لەناو قەرەوێڵەیەکی گەرم و نەرمدا و لەژێر چاودێریی خزمەتکارێکدا رادەکشاین. لەناو دنیای منداڵێکی تەمەن سێ ساڵ و نیوی وەك مندا، ئەگەری هەموو شتێك لەئارادابوو. سیدنی کە چوار ساڵ لەمن گەورەتر بوو، دەیتوانی «تەڕدەستی » بکات و هەندێك لەو فرۆفێڵانە فێر بووبوو. بۆ نـموونە دەیتوانی وردەپارەیەك قووت بدات و لە پشتی ملیەوە دەری بهێنێتەوە. منیش دەمتوانی ئەو کارە بکەم. ڕۆژێکیان وردەپارەیەکی نیو پێنیم قووت دا و دایکم ناچار بوو پزیشك بێنێتە سەرم.

هەموو شەوێك کە دایکم لە شانۆوە دەگەڕایەوە، وەکوو هەمیشە خواردنی لەسەر مێز دادەنا - بۆ نـموونە پارچەیەك شیرینیی یان نوقڵ و چوکلیت - ئەوەش بە مەرجێك بوو کە نەدەبوایە قرم و قاڵ و دەنگەدەنگمان بکردایە.

دایکم ڕۆڵی بەردەستی ئەکتەرێکی کۆمێدیی دەبینی. ژنێکی تا بڵێی جوان و دەلال و لەبەردلان بوو کە تەمەنی ٣٠ ساڵ زیاتر نەبوو. دەموچاوی ڕۆشن، چاوەکانی شینی مەیلەو مۆر و هەروەها قژیشی لە ڕەنگی بەرووی کاڵ بوون کە تا بەرپێی شۆڕ دەبوونەوە. من و سیدنی تا رادەی پەرەستن، دایکمان خۆش دەویست. هەرچەند جوانییەکی بێ وێنەی نەبوو، بەڵام لای ئێمە جوانییەکی ئاسمانیی هەبوو. کەسانێك کە ئەویان دەناسی، دەیانوت کە ئەو، ژنێکی جوان و شۆخ و شەنگ و یەکجار خوێن

شیرین بوو. زۆری حەز لێ بوو کە بۆ گەشت و سەیرانی رۆژانی یەکشەمە، باشترین و جوانترین جلەکان لەبەری من و سیدنی بکات. جلی تایبەتی قوتابییەکان و پانتۆڵێکی درێژی دەکردە بەر سیدنی و منیش قاتێکی مەخمەڵیی شین و هەروەها دەستەوانە ی شین کە زۆر لەگەڵ جلەکانمدا دەهاتەوە. لەو جۆرە کاتانەدا هیچ شتێك ئەوەندەی ئەو پیاسەکردنەی شەقامی کنینگتۆن خۆش و چێژبەخش نەبوو.

لەندەن لەو سەردەمەدا شارێکی هێمن و ئارام بوو و ژیانیش رەوتێکی خۆش و ئارامی هەبوو. تەنانەت ئەو شەمەندەفەریانەش کە بە ئەسپەوە بەسترابوونەوە، زۆر بە هێمنیی لە شەقامی «وێست مینستربریج»دا رادەبوردن و لە دوا وێستگەی نزیك پردەکە، لەسەر دیسکێکی بازنەییدا نیوە سوورێکیان دەخواردەوە و رێگەیان دەگۆڕی. لەو سەردەمەیدا کە دایکم بارودۆخێکی ئابووریی باشی هەبوو، ماڵمان لە شەقامی «وێست مینستربریج»دا بوو. ئەوێ، شوێنێکی خۆش و دلڕفێن بوو و دووکان و رێستورانی جوان و هۆڵی شانۆی لێ بوو. میوەفرۆشییەکەی گۆشەی شەقام، کە رێك بەرانبەر پردەکە بوو، بە سەلیقەیەکی تەواوەوە، هیرەمێکی لە سێو و پرتەقاڵ و هەرمێ دروست کردبوو و بەو مۆزانەش کە لەسەر مێزەکە چنیبوونی، پەلکەزێڕینەیەکی رەنگاوڕەنگی چێ کردبوو کە لەگەڵ رەنگە خۆڵەمێشییە تۆخەکەی بینای ئەنجومەنی شار، کە لەسەر کەناراوەکەی بەرانبەر رووباری «تایمز»دا هەڵکەوتبوو، بە هیچ شێوەیەك نەدەهاتەوە.

ئەمە لەندەنی سەردەمی منداڵیی من بوو. لەندەنی خەونەکانی من و ئارەزووە بەدی نەهاتووەکانم. من بیری «لامبێس» و وەرزی بەهار و یادی رووداوە بچووکەکان دەکەم و هەروەها بیری ئەو گەشت و سەیرانانە دەکەم کە لەگەڵ دایکمدا دەمانکرد و لە کاتی پیاسەکردنماندا دەستم لە گوڵە یاسەکان دەدا. دێتەوە بیرم کە بلیتە دڕاوەکانی شەمەندەفەر و پاسە نارنجیی و شین و سەوزەکان لە وێستگەکاندا لەسەر پیادەڕێکان رژابوون. ئەو گوڵفرۆشە سوورکەڵانانەی (ڕوخسار سوور) شەقامی وێست مینستر بریجم دێتەوە بیر کە چەپکە گوڵی تەرش و تازەیان دروست دەکرد و بەو پەنجە گورج و گۆڵانەیان، یارییان بە کاغەزە زێوین و گەڵا لەرزۆکەکانی سەرەخسەکان دەکرد. عەتری شێداری گوڵەباخە تازە ئاودراوەکانم دێتەوە بیر، کە خەمێکی بێ ناو نیشانیان دەڕژاندە ناو گیانمەوە. یەکشەمە وەڕزکەرەکان و دایك و باوکە رەنگ پەڕیوەکانم دێتەوە بیر، کە لەگەڵ منداڵەکانیان، کۆڵارە و باڵۆنی رەنگاوڕەنگیان لەسەر پردی وێست مینستر لە هەوادا دەخولاندەوە.



هەروەها بیری ئەو بەلەمە بچووکانە دەکەم کە چارۆکەکانیان دەهێنایە خوارەوە بۆ ئەوەی لە ژێر سێبەریاندا بحەسێنەوە. من پێم وایە کە گیانم لە هەموو ئەو شتانە دروست بووە.

جیا لەوانەش، لە ژووری میوانداریەکەماندا، هەندێ وردە کەلوپەل هەبوو کە هەستێکی قووڵیان لە هەناومدا بەجێ هێشتبوو. وێنەیەکی«نێل گوین»ی ئەکتەری تیا بوو هێندەی جەستەی خودی نێل، کە هی دایکم بوو و من بەڕاستیی لێی بێزار بووم. چەند تۆنگەیەکی بچووك و مل باریك لەسەر رەفەیەکدا بوون کە بینینیان بێزاری دەکردم. سندووقێکی خرت و بچووکی مۆسیقا کە سەرپۆشێکی میناکاریکراوی هەبوو و وێنەیەکی رەسمکراوی هەندێ فریشتەی پێوە بوو کە بەسەر هەورەکانەوە بوون و، ئەو سندووقە لەیەك کاتدا هەم وەڕەزی دەکردم و هەمیش خۆشم دەویست. بەڵام ئەو شتەی کە زیاتر لە هەموو شتێکی تر خۆشم دەویست، کورسییە بچووکەکەی خۆم بوو کە بە ٣ قەران لە قەرەجێکم کڕیبوو و تا رادەی خۆشەویستیی دەمپەرست، چونکە بە موڵکی شەخسیی خۆمم دەزانی.

هەندێ بیرەوەریشمان لە چرکەساتە هەژێنەرەکانی ژیانی خۆمان هەبوو. بۆ نموونە: بینینی «ئاکواریۆمی پاشایەتیی» کە لەگەڵ دایکمدا، سەیری بەرنامەکانی رابواردنیمان دەکرد. سەری ژنێك لە کاتێکدا کە زەردەخەنە و بزەی لەسەر لێو بوو، لەناو کڵپەی ئاگردا دەردەکەوت و ئێمەش بە دانی شەش پێنس دەمانتوانی پاکەتێکی(زەرف) سەرداخراوی لێ وەربگرین. دایکم ئەوەندەی بەرمیلێکی پڕ لە تۆڵاشەچێوی بەرز دەکردمەوە و منیش زەرفێکی سەرداخراوم لێ هەڵدەگرت کە نوقڵەفیکەیەکی تێدا بوو. نوقڵەفیکەکە، فیکەشی لێ نەدەدا ! ! . هەندێ شتی تری بێ بایەخیشم کڕی. سەرێکیشمان لە تەماشاخانەی «کانتربۆری» دا و من لەوێدا لەسەر کورسییەکی دەسەداری لە قوماشی سوور دروست کراو، دادەنیشتم و سەیری نواندنی (شانۆی) باوکمم دەکرد....

شەوە و منیش خۆم لە پەتوویەکی سەفەریی ئاڵاندووە و لەسەر کورسیی ئەو کالسکە چوارئەسپییەی کە دایکم و هاوڕێکانی لە تەماشاخانەوە بەرەو ماڵەوە دەباتەوە، دانیشتووم. لەگەڵ دەنگی پێکەنین و قسە خۆشەکانیاندا هەڵدێمەوە و کالسکەلێخوڕەکەش لەگەڵ خشەخشی تەریبی زین و بەرگی ئەسپەکان و تەقەتەقی سمیان لەسەر بەردی جادەکە، دوا لە دوای یەك، هۆڕنی لێدەدا تا بتوانێت لە ناو شەقامە قەرەباڵغەکەی «کنینگتۆن رۆد»دا رێگایەك بۆ تێپەڕینی کالسکەکەی بدۆزێتەوە.

❊❊❊

لە پڕێکدا ڕووداوێك ڕووی دا کە کاریگەرییەکی زۆری لەسەر وەزعی ئێمە دانا. مانگێك یان ڕەنگە چەند ڕۆژێك دواتر بوو کە کتوپڕ ئەوەم زانی کە پێوەندیی دایکم لەگەڵ دنیای دەرەوە(کۆمەڵگا)دا ئەوەندە باش نییە. دایکم سەرلەبەیانیی ئەو ڕۆژە، لەگەڵ یەکێك لە هاوڕێکانیدا چووبووە دەرەوە و کاتێك گەڕایەوە بۆ ماڵەوە، زۆر نیگەران و شڵەژابوو. من لە بەرپێی ژوورەکەدا یاریم دەکرد کە لە دەوروبەرمدا هەستم بە بوونی ناڕەحەتی و نیگەرانییەکی زۆر کرد، وەك بڵێی لەناو بیرێکی قووڵ دام و دەنگێك دەبیستم. دەنگی دایکمم دەبیست کە ئاه وناڵەیەکی تێکەڵ بە گریانی لێدەهات و دوا بە دوای یەك ناوی کەسێکی دێنا بە ناوی «ئارمسترانگ». ئارمسترانگ وای وت، ئارمسترانگ وای کرد، ئارمسترانگ پیاوێکی وەحشی و شەڕفرۆشە. ئەوەندە ناڕەحەت و دڵپڕ بوو کە منیش دەستم بە گریان کرد و دایکم ناچار بوو لە باوەشم بگرێت و هێمنم بکاتەوە. چەند ساڵ دواتر، مانای ئەو ڕووداوەم زانی. ئەو ڕۆژە دایکم لە دادگایەکدا گەڕابۆوە کە تیایدا شکاتی لە باوکم کردبوو بۆ ئەوەی خەرجیی پێ نەداوە و دادگایی کردنەکەش بە زیانی دایکم کۆتایی پێ هاتبوو. ئارمسترانگ پارێزەری باوکم بووە.

من تا ئەو ڕۆژە هەرگیز سەرنـجی ئەوەم نەدابوو کە باوکێکم هەیە و هەرگیزیش بە بیرمدا نایەت کە باوکم لەگەڵماندا ژیابێت. ئەویش ئەکتەری شانۆ و لەگەڵ ئەوەشدا پیاوێکی بێدەنگ و خەمۆك بوو کە دوو چاوی تۆخی هەبوو. دایکم دەیوت لە ناپلیۆن دەچێت. دەنگێکی نەرم و بەرزی هەبوو و بەوەش ناوبانگی دەرکردبوو کە ئەکتەرێکی زۆر باشە. لەو سەردەمەدا، لە هەفتەیەکدا چل لیرەی ئسترلینگی وەردەگرت و ئەوەش پارەیەکی زۆر باش بوو. بەڵام بەداخەوە مەشرووبی زۆری دەخواردەوە و دایکم دەیوت هەر بەو هۆیەشەوە لە یەکدیی جیا بوونەتەوە.

لەو سەردەمەدا بۆ هونەرمەندان زۆر ئەستەم بوو، مەشرووب نەخۆنەوە، چونکە لە ناو هەموو هۆڵە شانۆییەکانی شاردا مەشرووبی ئەلکۆلییان دەفرۆشت و کاتێك ئەکتەرەکان لەسەر شانۆ دەوریان دەبینی، لە لایان زۆر ئاسایی بوو بچن بۆ باڕی هۆڵەکە و لەگەڵ سەیرکەران مەشرووب بـخۆنەوە. هەندێك لە هۆڵەکانی شانۆ، لە فرۆشتنی مەشرووب قازانـجی زیاتریان دەکرد وەك لە فرۆشتنی بلیتی شانۆگەری و هەندێك لە ئەستێرەکانیش حەقدەستتی یەکجار زۆریان وەردەگرت. نەك تەنیا بۆ ڕێزگرتن لە بەهرە و هونەر و تواناکانیان، بەڵکوو لەبەر ئەوەی بەشی هەرە زۆری داهاتەکەیان لە باڕی شانۆدا



خەرج دەکرد. بەمـجۆرە بوو کە زۆربەی هونەرمەندان، بە هۆی ئالوودەبوونیان بە ئەلکۆلەوە تیاچوون و باوکی منیش یەکێك لەوانە بوو. دواجاریش لە تەمەنی **٣٧** ساڵی و لە کاتێکدا کە بە هۆی ئەلکۆلەوە ژەهراوی بووبوو، مرد.

دایکم هەندێ بەسەرهاتی لە باوکم دەگێڕایەوە کە تێکەڵەیەك بوون لە خەم و خەفەت و گاڵتە و گەپ. دەیگوت کاتێك مەشرووبی دەخواردەوە، زۆر توندوتێژ دەبوو. هەر لە ماوەی یەکێك لەو قەیرانە عەسەبییانەیدا، دایکم لەگەڵ هاوڕێکانیدا هەڵات بۆ «برایتن». باوکم ئەم تێلگرافە شێتانەیەی بۆ نارد:«لەوێ چی دەکەی؟ خێرا وەڵامم بەرەوە! ». دایکیشم ئەم تێلگرافەی ناردەوە:«سەما و شەونشینیی و گەشت و سەیران، خۆشەویستەکەم! ! ».

دایکم دوو خۆشکی لە خۆی بچووکتری هەبوو. باوکی دایکم واتە:«چارلزهیل» پینەچییەکی ئیرلەندیی خەڵکی ناوچەی «کرێك» بوو. سەر کوڵمانی دەتگوت سێوی سوورن. قژێکی زۆر پڕ و سپییو هەروەها ردێنێکی هاوشێوەی ردێنی«کارلایل »ی هەبوو کە «ویستلێر » لەسەر پەردەیەك کێشاویەتی. بە هۆی نەخۆشیی ڕۆماتیسمەوە پشتی چەمابووەوە و دەیوت لە سەردەمی شۆڕشە نەتەوەییەکانی ئیرلەنددا، لە ترسی پۆلیس، ئەوەندە لەناو کێڵگە شێدارەکاندا خەوتووە، تووشی ئەو نەخۆشییە هاتووە. دواجار لە لەندەن مایەوە و لە شەقامی«ئیست لین» لە گەڕەکی«واڵ وۆرس»دا دووکانێکی پینەکاریی(کفاشی) کردەوە.

دایکی دایکم، نیوە قەرەج بوو و هەر بەو هۆیەشەوە وەك پەڵەی سەرشانی بنەماڵەکەمان سەیری دەکرا. لەگەڵ ئەوەشدا شانازیی بەوەوە دەکرد کە خێڵەکەی لە هەر کوێیەکدا ڕەشماڵیان هەڵبدایە، کرێکەیان دەدا. ناوی دایە گەورەم«ئسمیت»بوو. تەنیا شتێکی ئەو کە بیرم بێتەوە ئەوەیە کە پیرەژنێکی بچکۆلانە و کورتەبالا و گورج و گۆڵ و پڕ لە وزە بوو، کە هەمیشە بەوپەڕی خۆشەویستی و ڕێز و حورمەتەوە پێشوازیی لێ دەکردم و بە جۆرێك قسەی لەگەڵ دەکردم کە وەك بڵێی لەگەڵ منداڵێکی شیرخۆرەدا قسە دەکات. ئەو دەمەی مرد، من هێشتا تەمەنم نەبووبوو بە شەش ساڵ. لەبەر هەندێ هۆ لە باپیرەم جیا ببووەوە کە هیچکامیان قایل نەبوون ئەو هۆیانە بۆ کەس باس بکەن.

داوەریکردن لەسەر ڕەوشتی بنەماڵەکەی ئێمە بە پێی مۆدێلە باوەکان، هێندەی ئەوە هەڵەیە کە کەسێك بیهەوێت تین¬پێوێك❊ بکاتە ناو ئاوێکی کولاوەوە. بە هۆی ئەو ڕیشە و ڕەچەڵەکەوە کە ئێمە

هەمانبوو، هەر دوو کچە جوانەکەی پینەچییەکە، یەکجار زوو ماڵی باوکیان بەجێ هێشت و چوونە ناو دنیای شانۆوە.

پوورێ«کەیت»بچووکترین خۆشکی دایکم، دەوری بەردەستی ئەکتەرەکانیشی دەبینی" بەڵام ئێمە شتێکی ئەوتۆمان دەربارەی ئەو نەدەزانی، چونکە زۆر بە کەمیی سەردانی دەکردین. زۆر جوان بوو، بەڵام عەسەبیی بوو و هەرگیز لەگەڵ دایکمدا پێکەوە نەدەکران. هەندێ جار کە سەردانیشی دەکردین، زۆربەی جار بە مقۆمقۆ و تێکهەڵچوونیان دوایی دەهات کە گوایە دایکم فلان قسە، یان فلان کاری کردووە.

دایکم لە تەمەنی هەژدەساڵیدا لەگەڵ پیاوێکی زۆر لە خۆی بەتەمەن تر، چوو بۆ ئافریقا. زۆر جار باسی ژیانی ئەوێی بۆ دەکردم. ژیانێکی پر لە خۆشی و ئاسوودەیی لەناوەڕاستی باخاندا هەبووە و هەروەها خزمەتکار و ئەسپی چاکی سواریشی هەبووە.

کاتێك سیدنی برام هاتە دنیا، دایکم تەمەنی هەژدە ساڵ بووە. بە منیان دەوت کە دایکم ئەو کوڕەی ﴿واتە سیدنی﴾ لە لۆردێکی بریتانیی هەبووە و کاتێك تەمەنی بگاتە **٢١** ساڵ، سەروەت و سامانێکی**٢** ملیۆن لیرەیی پێ دەگات. من لەو قسەیە هەم شاگەشکە بووم هەمیش تووڕەی دەکردم.

دایکم ئەوەندە لە ئافریقا نەمایەوە و گەڕایەوە بۆ بەریتانیا و لەوێ لەگەڵ باوکمدا ژیانی هاوبەشیان پێك هێنا. نازانم چ شتێك لە ئافریقا کۆتایی بەو سەردەمە خۆشانەی ژیانی دایکم هێنابوو. بەڵام بە هۆی ئەو ژیانە ناخۆش و نالەبارەی هەمانبوو، لۆمەم دەکرد کە بۆچی ئەو ژیانە ئاسوودە و بەشکۆیەی لە کیس خۆی داوە؟ دایکم پێ دەکەنی و دەیگوت لەو سەردەمەدا زۆر منداڵ بووە و عەقڵی بەوە نەشکاوە چی بکات.

من هەرگیز نەمزانی دایکم باوکمی چەندە خۆش دەوێ، بەڵام هەر کاتێك باسی باوکمی دەکرد، جۆری قسەکردنی توند و تەوساویی نەبوو، و لەوەوە دەمزانی کە دایکم لە خۆشەویستیدا زۆر واقعبین بوو. هەندێ جار بە میهرەبانی و دلۆڤانییەوە باسی باوکمی دەکرد و هەندێ جاریش باسی خواردنەوەی بەردەوام و عەسەبیی بوونەکەی دەکرد. دواتر هەر کاتێك لێم تووڕە ببوایە، بە خەم و حەسرەتەوە دەیوت: ئاخرەکەی تۆش وەکوو باوکت لە گەندڵی و گەنیوییدا دەمریت.

ئەو پێش چوونی بۆ ئافریقا، باوکمی ناسیبوو. هەردووکیان حەزیان لە یەکتری کردبوو و پێکەوەش لە نواندنی شانۆگەرییەکی مووزیکاڵی ئیرلەندیدا بە ناوی «کۆمیسێر ئۆبراین» بەشدار



ببوون. لە تەمەنی **١٦** ساڵیدا ڕۆڵی یەکەمی شانۆگەرییە لیریکەکان، بەو دەسپێردرا. لە یەکێك لە شەوگەڕییەکانیدا، لەگەڵ ئەو لۆردەی ئاشنا بوو کە زۆر لە خۆی بە تەمەنتر بوو.

نازانم چ هۆکارگەلێکی دیکەش بێجگە لە مەشرووبخواردنەوە دەوریان هەبووە، بەڵام ساڵێك دوای لە دایکبوونی من، دایك و باوکم لە یەکدیی جیا بوونەوە. دایکم داوای خەرجیی نەکرد، چونکە خۆی ئەکتەری شانۆ بوو و هەفتەیەك **٢٥** لیرە حەقدەستتی وەردەگرت و بەو پارەیەش دەیتوانی ژیانی خۆی و منداڵەکانی دابین بکات. تەنیا کاتێك کە تووشی هەژاریی و دەسکورتی بوو، ویستی داوای خەرجیی لە باوکم بکات. ئەگەر وەزعی ئاوهای لێ نەهاتبایە، هەرگیز ئەو داوایەی نەدەبردە بەردەم دادگا.

دایکم هەمیشە دەنگیشی تووشی کێشە و گرفت دەبوو. هیچ کاتێك دەنگی بەهێز نەبووە و بە هەڵامەتێکی سووك و سادە، تووشی نەخۆشیی«لارنژیت» دەبوو و چەندین هەفتەی دەخایاند تا چاك دەبووەوە. لەگەڵ هەمموو ئەوانەشدا ناچار بوو درێژە بە کارەکەی بدات و ئەو وەزعە هێندە درێژەی کێشا کە دەنگی بە تەواوەتی تێك چوو بوو. هەرگیز نەیدەتوانی متمانە بە دەنگی بکات. هەندێ جار لەناوەڕاستی گۆرانی گوتندا دەنگی تێك دەچوو، یان لە پڕێکدا کز و لاواز دەبوو و لەو کاتەدا جەماوەر دەیدایە قاقای پێکەنین و فیکەیان بۆ لێ دەدا. خەم و خەفەتێك کە ئەو حاڵەتە بۆی دروست کردبوو، تەندروستیی دەخستە مەترسییەوە و دواجاریش ئەعسابی تێك دا و وای لێ هات کە ئیتر زۆر بە کەمیی گرێبەستیان لەگەڵ دەکرد و دواجار وای لێ هات کە ئیتر هیچ گرێبەستێکی نەبوو.

هەر بەم هۆیەوە بوو کە من بۆ یەکەمجار لە تەمەنی **٥** ساڵیدا چوومە سەر شانۆ.

دایکم وای پێ باشتر بوو شەوانە لەگەڵ خۆیدا بمبات بۆ شانۆ و لە ماڵەوە بە تەنیا بەجێم نەهێڵێت. ئەو لەو سەردەمەدا، لە هۆڵی شانۆی «کانتین» کە لە «ئاڵدرشات»دا هەڵکەوتبوو، کاری نواندنی شانۆگەریی دەکرد. کانتین لەو کاتانەدا هۆڵێکی شانۆی بچووك و پیس و پۆخڵ بوو کە زۆربەی مشتەریەکانی سەربازەکان بوون. کۆمەڵێك مشتەریی لات و لووت و تووڕە، کە بۆ بیانوویەك دەگەڕان گاڵتە بە ئەکتەرەکانی شانۆ بکەن. بۆ ئەکتەرەکانی شانۆ، هەفتەیەك مانەوە لە ئاڵدرشاتدا بەڕاستی عەزابێکی گەورە بوو.

لە بیرمە کە من لە هۆدەکەی پشتەوەی هۆڵی شانۆ بووم کە دەنگی دایکم تێك چوو و گۆڕا بە دەنگێك کە بە زەحمەت لە گەروویەوە دەهاتە دەرەوە، جەماوەرەکە دای لە قاقای پێکەنین و گۆرانی

چڕین و گاڵتەکردن و فیکە لێدان. هەموو ئەو دەنگانە زۆر تێکەڵ و پێکەڵ بوون و من باش نەمدەزانی چی رووی داوە. بەڵام بەردەوام هەرا و دەنگەدەنگ رووی لە زیادبوون دەنا و گەییشتە رادەیەك کە دایکم ناچار بوو سەکۆی شانۆکە بە جیٚ بهێڵێت. کاتێك هاتە ناو هۆدەی پشت شانۆکەوە، زۆر نارەحەت و بیٚ تاقەت بوو و لەگەڵ بەڕێوەبەری شانۆدا کردی بە دەمەقاڵە و ئەویش کە چەند جارێك منی بینیبوو کە لە لای هاوڕێکانی دایکمدا گۆرانیم چڕیبوو، داوای لیٚ کردم بچمە سەر شانۆ و جێی دایکم بگرمەوە.

لە بیرمە لەناو ئەو هەموو جەنـجاڵ و هەرا و دەنگەدەنگەدا دەستی گرتم و بردمیە سەرشانۆ و پاش ئەوەی هێندێك بۆ جەماوەرەکەی روون کردەوە، لەسەر شانۆکە بەجێی هێشتم. من لەبەردەم رووناکیی لەڕادەبەدەری چراکانی سەر شانۆ و ئەو دەموچاوانەی کە لەناو دووکەڵی جگەرەدا نوقم بووبوون، دەستم کرد بە گۆرانی گوتن. ئەو ئۆرکێسترەی کە لەگەڵم بوو، سەرەتا سەری لیٚ شێوابوو کە من چی دەڵێم و دواجار تیٚ گەییشتن. ئەو گۆرانییەی من دەمچڕی، گۆرانییەکی بەناوبانگ بوو بە ناوی«جەك جۆنز».

ڕێك لە ناوەڕاستی گۆرانییەکەدا بوو کە بارانێك لە «سکە» بەسەر شانۆکەدا باری.

دەسبەجیٚ گۆرانییەکەم بڕی و مۆڵەتم لە خەڵکەکە وەرگرت تا پارەکان کۆ بکەمەوە و پاشان درێژە بە گۆرانییەکەم دەدەم. ئەم قسەیەم خەڵکەکەی خستە پێکەنینێکی یەکجار زۆرەوە. بەڕێوەبەری شانۆکە هات و دەسرێکی هێنا و یارمەتیی دام بۆ کۆکردنەوەی پارەکان. وام زانی پارەکان بۆ خۆی هەڵدەگرێت. تەماشاچییەکان دەرکیان بەو ترسەی من کرد و زیاتر پیٚ کەنین" بە تایبەت کاتێك کە بەڕێوەبەر و دەسماڵە پارەکە لەبەر چاوم ون بوون و منیش بە نارەحەتیی و نیگەرانییەوە بە دوایدا چووم و بۆ درێژەدان بە گۆرانییەکەم نەگەڕامەوە سەر شانۆ تا ئەو کاتەی کە بەڕێوەبەر پارەکانی دایە دەست دایکم. کاتێك کە دڵنیا بوومەوە، زۆر خۆشحاڵ و کەیف خۆش بووم. تۆزێك زمانلووسی و زمان شیرینییم بۆ خەڵکەکە کرد و سەمام کرد و هەندیٚ لاساییشم کردەوە" لەوانە لاسایی دەنگی دایکم کردەوە کە سروودێکی مارشی ئیرلەندی بوو.

بەوپەڕی ساکاریی و راستگۆییەوە ﴿دەڵێم﴾، کاتێك کە لاسایی دەنگە گیراوەکەی دایکمم دەکردەوە، سەرم لەو کاریگەرییە سووڕمابوو کە ئەو لاساییکردنەوە لەسەر بیسەرانی دانا. دەنگی قاقای پێکەنین و چەپڵەلێدان بەرز بووەوە و دیسان بارانێك لە سکە شانۆکەی داگرت و هەرکە دایکم



هاتە سەرشانۆ بۆ ئەوەی بـمباتە دەرەوە، لە لایەن جەماوەرەکەوە بە چەپڵەلێدانێکی زۆر، دەسخۆشیی لیٚ کرا. ئەو شەوە یەکەمین دەرکەوتنی من و دوایین دەرکەوتنی دایکم لە سەر شانۆ بوو.

کاتێك قەدەر خۆی دەهاوێتە ناو چارەنووسی مرۆڤەکانەوە، رەحم و بەزەیی ناناسێت. دایکم لەوە بەدواوە هەرگیز دەنگەکەی چاك نەبووەوە. زستانی دوای ئەو پاییزەش، بارودۆخمان خراپتر بوو. هەرچەند دایکم بیری لە دوارۆژ کردبووەوە و هەندێك پارەی پاشەکەوت کردبوو، بەڵام ئەو پاشەکەوتە کەمەش هەر زوو تەواو بوو و دوای ئەوەش، دایکم ئەو تۆزە زێڕ و کەلوپەلەشی کە هەیبوو، لای کەسێك بە بارمتە دانا و هەندیٚ پارەی لیٚ قەرز کرد و بەو هیوایە بوو کە رۆژێك دەنگی چاك دەبێتەوە.

لەو ماوەیەدا، ئێمە ئەو خانووەمان بە جیٚ هێشت کە ٣ ژووری رێکوپێك و خاوێنی هەبوو، تا لە ماڵێکی یەك ژووریدا بژیێین. پاشان ٢ ژوورەکەشمان بوو بە ژوورێك و لە هەر خانوو چۆڵ کردنێکیشدا هەندێك لە کەلوپەلەکانـمان کەم دەبووەوە. ئەو گەڕەکانەش کە خانوومان تیایاندا بە کریٚ دەگرت، رۆژ بەرۆژ خراپتر و پیس و پۆخڵتر دەبوون.

لەو کاتانەدا دایکم رووی لە ئایین(مەزهەب) کرد، بەو ئومێدەی کە لە سایەی بەرەکەتی ئیماندا، دەنگەکەی چاك ببێتەوە. هەموو داب و نەریتە ئایینیەکانی کڵێسەی مەسیحیی کە لە شەقامی«وێست مینستربریج رۆد»دابوو، بە بەردەوامیی بە جیٚ دەهێنا و منیش هەموو رۆژانی یەکشەمە، دەبوایە عاقڵ و بەئەدەب دانیشم و گویٚ لە دەنگی «ئۆرگ» بگرم کە بەشێك لە پارچە مۆسیقاکانی«باخ»ی دەژەند. هەروەها بە بیٚ وەڕەزییەکی تاقەتبڕەوە، گویٚ لە دەنگی ناخۆش و خەمباری باوکی رۆحانیی«ف. ب. مایر»بگرم کە وەك دەنگی کرەکڕی پێڵاوێك کە بەبیٚ هێزی لەسەر زەویی بـخشێت، وابوو کە لە هەیوانی کڵێسەدا دەنگی دەدایەوە. رەنگە ئەو مەراسیمانە هەژێنەر بن چونکە زۆربەی جاران، دایکمم دەبینی کە بەبیٚ ئەوەی تاقە قسەیەك بکات، فرمێسکی لە گۆشەی چاویەوە دەسڕی و ئەو دیـمەنەش زۆر بیٚ تاقەتی دەکردم.

بەڕێوەبردنی رێوڕەسمەکانی«شێوی خوایی » لە رۆژێکی یەکجار گەرم و سووتێنەری هاوینێکدا لە بیرمە و هەروەها ئەو پەرداخە زێوینە تازەیەی شەرابی ترێی تێدا بوو و باوەڕداران، بە نۆرە لێیان دەخواردەوە. هەروەها دەستە نەرم و نیانەکانی دایکمم دێتەوە بیر کە کاتێك لە خواردنەوەی شەرابی ترێدا زێدەڕۆییم دەکرد، رێی لیٚ دەگرتم و نەیدەهێشت. ئەوەشم دێتەوە بیر کاتێك پاپا، کتێبی پیرۆزی

دادەخستەوە، چ ەۆخژن و سوکناییەك دایدەگرتم" چونکە لەوەدا دەمزانی ئامۆژگاریکردن تەواو بووە و کاتی خوێندنەوەی دۆعا و سروودی کۆتایی هاتووە.

دایکم لەو کاتەوەی کە زیاترین کاتی خۆی بۆ ئەنـجامدانی ڕێوڕەسمە ئایینییەکان تەرخان دەکرد، هاوڕێ ئەکتەرەکانی خۆی کەمتر دەبینی. هەموو ئەو کەسانە بووبوون بە هەڵم و لە بیرەوەرییەك زیاتر هیچی تریان لێ بە جێ نەمابوو.

بەڕاستیی بارودۆخێکی وامان هەبوو کە پێدەچوو هەموو ژیانـمان لە هەژاری و دەسکورتیدا ژیاوین. ئەو وەستانە بۆ ماوەی هیەك ساڵ، لای ئێمە تەمەنێکی پڕ لە کوێرەوەری بوو. لەو کاتەدا ئاسۆی ژیانـمان، تاقە ترووسکەیەکی خۆشیی و شادمانیی تێدا نەبوو. دۆزینەوەی کار، زۆر ئەستەم بوو و دایکیشم کە جگە لە کاری هونەریی، هیچ کارێکی تری نەدەزانی، هەندێ کێشەی تریش زۆر ئازاریان دەدا. ژنێك بوو کورتە باڵا و هەستیار و دڵناسك، کە لەگەڵ بارودۆخی مەترسیداری سەردەمی ویکتۆریاییدا ململانێی دەکرد، سەردەمێك کە دەوڵەمەندیی و هەژاریی، لە لووتکەدا بوون و چینی مامناوەند لە ئارادا نەبوو. ژنانی چینی هەژاریش ناچار بوون یان قەرەواشی و کارەکەری بکەن، یان لە کارگەکاندا وەکوو کۆیلە کار بکەن. دایکم هەندێ جار، کارێکی خزمەتکاریی دەدۆزییەوە، بەڵام شتی وا زۆر کەم رووی دەدا و ئەوەندەشی نەدەخایاند. سەرەڕای هەموو ئەوانەش، توانای هەموو جۆرە کارێکی هەبوو. چونکە جلەکانی شانۆیشی بۆ خۆی دەدوریی، دوورمانیشی دەزانی و دەیتوانی بە دوورینی جلوبەرگی ئەندامانی گرووپەکانی تری شانۆ، چەند شلینگێك بە دەست بهێنێت. بەڵام ئەو پارەیە زۆر کەم بوو بۆ ئەوەی بتوانێت ژیانی هەر سیانـمانی پێ بەڕێوە ببات. باوکیشم چونکە مەشرووبی زۆری دەخواردەوە، گرێبەستە شانۆییەکانی ڕۆژ بە ڕۆژ کەمتر و کەمتر دەبوون و کەواتە ئەو ١٠ شلینگەش کە بۆ هەفتەیەك وەکوو یارمەتیی بە دایکمی دەدا، بە ڕێکوپێکی نەدەگەییشتە دەستمان.

دایکم زۆربەی کەلوپەلەکانی خۆی فرۆشتبوو و جگە لە سندووقێك کە جلەکانی نـمایشی تیا دادەنا، هیچی تری بۆ نەمابووەوە. ئەو جلانە بە گیانییەوە بەسترابوونەوە«و بۆ ئەو زۆر پڕ بایەخ بوون»" چونکە هێشتا هیوای ئەوەی هەبوو رۆژێك لە رۆژان دەنگی چاك بێتەوە و وەکوو جاران بچێتەوە سەر شانۆ. هەندێ جار سندووقەکەی دەپشکنی بەڵکوو شتێکی تیادا بدۆزێتەوە و جارێکیان کراسێکی پوولەکدار و «بارۆکە»یەکمان دۆزییەوە و ئێمەش تکامان لێ کرد لەبەریان بکات.



جا دایکم بە لێهاتووییەکی بێ وێنەوە دەستی دەکرد بە سەماکردن و دوورمانی لەبیر دەچوەوە و تەنانەت ئێمەشی بانگهێشت دەکرد بۆ گوێگرتن لە گۆرانییەکانی و لەگەڵ ئەوەشدا سەمایەکی گونـجاو لەگەڵ گۆرانییەکانیشی ئەنـجام دەدا و ئەوەندە خۆی ماندوو دەکرد، ئیتر هێزی تیا نەدەما. لەو کاتەدا باسی بیرەوەرییەکانی خۆی دەکرد و راگەیاندنە کۆنەکانی سەردەمی سەرکەوتنەکانی خۆی نیشان دەداین. لەسەر یەکێکیاندا نووسرابوو:

نواندنێکی بێ وێنە

لە هونەرمەندی سەرنجڕاکێش و لێهاتوو

لیلی هاروی

ئەکتەر و لاساییکەر و سەماکاری بەناوبانگ

ئەو نەك تەنیا نـمایشە تایبەتەکەی خۆی، کە لە تەماشاخانەدا دەیکرد، بۆ ئێمەشی نـمایش دەکرد، بەڵکوو لاسایی نـمایشی ئەو هونەرمەندانەشی دەکردەوە کە خۆی لە نزیکەوە بینیبوونی.

شەوێکم دێتەوە بیر کە لە ژووری تایبەتەکەی خۆمدا لە نهۆمی یەکەمی سەرخانێك لە شەقامی«ئۆکلی»دا بووین. من لەسەر جێگا کەوتبووم و تووشی تایەك بووبووم و وردە وردە بەرەو چاکبوونەوە دەچووم. سیدنی چووبوو بۆ شەوگەڕیی و من و دایکم تەنیا بووین. رۆژ بەرەو ئێوارە دادەگەڕا و دایکم پشت لە پەنـجەرەکە دانیشتبوو و کتێبی دەخوێندەوە و نـمایشی دەکرد و بە شێوەی تایبەتیی خۆی _کە کەس نەیدەتوانی لاسایی بکاتەوە_ کتێبی«سەردەمی مۆدێرن» و ئەشق و خۆشەویستیی مەسیح بەرانبەر هەژارەکان و منداڵە بچووکەکانی لێك دەدایەوە. ڕەنگە ئەو دڵەڕاوکێ و نیگەرانییەی، بەهۆی نەخۆشییەکەی منەوە بووبێت، بەڵام جوانترین و سەرنـجڕاکێشترین لێکدانەوەی لەسەر وتەکانی مەسیحی پێ نیشان دام، شتێك کە پێشتر نە بینیبووم نە بیستبووم. ئەو باسی رۆحی دادوەرانەی مەسیحی دەکرد لە ئاست لێبوردنی تاوانباران: دەربارەی ژنێك کە تاوانی کردبوو و خەڵك دەیانویست بەردبارانی بکەن و مەسیح گوتبووی:«یەکەم بەرد ئەو کەسە بیهاوێت کە هەرگیز تاوانی نەکردبێت».

هەرچەند شەویش دادەهات بەڵام ئەو بەردەوام بوو لەسەر کتێب خوێندنەوەکەی و تەنیا لەو کاتانەدا دەستی لە خوێندنەوە هەڵدەگرت کە دەیویست چراکە هەڵبکاتەوە. پاشان باسی ئەو باوەڕەی

دەکرد کە مەسیح بە نەخۆشەکانی دەبەخشی و پێی وا بوو نەخۆشەکان ئەگەر تەنیا بۆ جارێك دەستیان بگاتە عەباکەی، چاك دەبنەوە.

باسی لە رق و کینە و چاوچنۆکیی رۆحانییە گەورەکان و لەخواترسە ریاکارە«فەریسیەکان» دەکرد. باسی حاڵەتی مەسیحی کرد لە کاتی دەسبەسەرکرانیدا و هەروەها لەسەرەخۆیی و هێمنی و گەورەیی ئەو لەبەردەم«پۆنس پیلاٚت» ، حاکمی رۆمییدا کە خەریکی شوشتنی دەستەکانی بوو(دایکم هەموو ئەو قسە و باسانەی وەك درامایەکی سەر شانۆ بۆ ئێمەش نـمایش دەکرد) گوتی:«من هیچ تاوانێك لەو پیاوەدا بەدی ناکەم، ئیتر خۆتان دەزانن! ». دایکم لە درێژەی قسەکانیدا باسی لەوە کرد کە ئەو خراپکارانە چۆن جلەکانی مەسیحیان لەبەر داکەند و بە تووڵەدار لێیان دا و تاجێك لە درکیان لەسەری نا ، و گاڵتەیان پێ کرد و تفیان لە دەموچاوی کرد و بە گاڵتەوە پێیان وت:«سلاٚو لە تۆ ئەی پاشای جوولەکەکان! ».

بەدەم قسەکردنەوە فرمێسك لە چاوانیەوە دەهاتە خوارێ. لەو کاتەدا باسی «شەمعوون»ناوێکی کرد کە یارمەتیی مەسیحی دابوو لە هەڵگرتنی خاچەکەیدا و ئەو نیگا دڵتەزێن و پڕ لە ئەمەگناسییەی وا مەسیح لێی کردبوو. پاشان دەربارەی«باراباس» ئەو دزە پەژیوانە قسەی کرد کە لەگەڵ مەسیحدا لەسەر خاچێك گیانی دا و داوای لێبوردنی کرد و بە مەسیحی وت:«تۆش ئەمڕۆ لە بەهەشتدا لەگەڵم دەبیت» و کاتێك لە بەرزایی خاچەکەوە لە دایکی روانی گوتی:«ئەی ژنەکە! کوڕەکەت ببینە! ». و لە دوایین گیان کەنشتدا ئەم قسەیەی کرد:«خوایە، بۆچی منت لەبیر چۆتەوە؟». لەو کاتەدا هەردووکمان پڕبەدڵ گریایین.

دایکم گوتی:

_ چاوت لێیە مەسیح چ مرۆڤێك بوو! . ئەویش وەکوو ئێمە دەیزانی شك و گومان چییە.

دایکم ئەوەندە لە رووی رۆحییەوە تێکی دابووم کە حەزم دەکرد هەر ئەو شەوە بـمرم بەڵکوو بتوانم مەسیح ببینم" بەڵام ئەو خۆی وەها حەز و تاسەیەکی نەبوو و لە روونکردنەوەی بیروڕایدا گوتی:

_ مەسیح حەز دەکات کە تۆ لەم دنیایەدا بژیت تا هەموو ئەو شتانەی کە چارەنووس بۆی دیاری کردوویت، بە چاو ببینی.



بەمــجۆرە، دایکم لەو ژووره تنۆك و تاریکەی نهۆمی یەکەمدا، لە شەقامی«ئۆکلی»، رووناکترین و درەوشاوەترین تیشکی«چاکە»ی پێ نیشان دام کە دنیا هەرگیز بە خۆیەوە نەیبینیوە. تیشکێك کە ئەدەبیات و شانۆ، گەورەترین و پڕناوەڕۆکترین بابەتەکانیان لەوەوە وەرگرتووە، واتە تیشکی ئەوین و مرۆڤایەتی.

* * *

بەو جۆرە گوزەرانەی کە ئێمە لە خوارترین چینەکانی کۆمەڵگادا دەمانکرد، ئاسایی بوو کە وردە وردە رێکوپێك قسەکردنـمان لەبیر بچێتەوە و کەمتەرخەمیی بکەین لە جۆری دەربڕین و قسەکردندا. بەڵام دایکم هەمیشە خۆی لەو کۆمەڵگایە بە دوور دەگرت و بە ورد بینییەکی زۆرەوە ئاگای لە جۆری قسەکردنەکەمان بوو" هەڵە رێزمانییەکانی بۆ راست دەکردینەوە و ئەم هەستەی لەلاٚ دروست دەکردین کە ئێمە سەر بە چینێکی بەرێز و گەورەین.

تا زیاتر و زیاتر هەژارتر دەبووین و لە گێژاوی هەژارییدا نوقم دەبووین، من بەو هەموو نەزانییەی خۆمەوە لۆمەم دەکرد کە بۆچی ناگەڕێتەوە بۆ سەر شانۆ و دنیای هونەر. ئەویش زەردەخەنەیەکی دەکرد و دەیوت:ژیانی شانۆیی، ژیانێکی ساختە و درۆیینە و لەناو دنیایەکی وەك دنیای شانۆدا، ئینسان زۆر بە ئاسانی دەتوانێت خوا لەبیر بکات. لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا، هەر کاتێك باسی شانۆی دەکرد، تووشی جۆرە خرۆش و هەژانێکی دەروونی دەبوو. هەندێ رۆژ، پاش ئەوەی کە بیرەوەرییەکانی ئەو سەردەمانەی بۆ دەگێڕاینەوە، تووشی بێدەنگییەکی درێژخایەن دەبوو و هێندە خۆی بە دوورمانەوە سەرقاڵ دەکرد، تەنانەت سەریشی بەرز نەدەکردەوە. منیش خەفەتم دەخوارد و خەمبار بووم لەوەی کە بۆچی ئیتر لەو ژیانە خۆش و ئاسودەیەی جاران بەهرەمەند نین؟. لەو کاتەدا دایکم سەری بەرز دەکردەوە و کاتێك منی ئاوها بە خەمبارییی دەبینی، هەوڵی دەدا دڵخۆشم بکات و هێورم بکاتەوە.

زستان دەهات و سیدنی جلوبەرگی نەبوو. هەر ئەوەش وای لە دایکم کرد کە لە پاڵتاوێکی کۆنی مەخمەلیی خۆی، کە قۆڵەکانی خەتی رەش و سووریان تێدا بوو و سەر شانەکانی چیندار بوو، پاڵتاوێکی بۆ دروست کرد و زۆریش هەوڵی دا کە چینی سەرشانەکانی لا ببات، بەڵام بۆی نەکرا. کاتێك سیدنی ناچار کرد ئەو پاڵتۆیە لەبەر بکات، سیدنی گریا و گوتی:هاوپۆلەکانم دەبێ چۆن بیر بکەنەوە؟

دایکم گوتی:

چ گرنگییەکی هەیە کە خەڵك چۆن بیر دەکەنەوە؟ تازە لەوەش گەڕێین، ئەم پاڵتۆیە زۆر ماقووڵانەیە.

دایکم بۆ قایلکردنی خەڵك، بەهرە و توانابییەکی وای هەیە کە تا ئەمڕۆش سیدنی نەیزانیوە کە چۆن رازیی بووە وەها جلێك لەبەر بکات. بەهەرحاڵ سیدنی ناچار بوو پاڵتۆکە لەگەڵ جووتێك پێڵاوی ژنانەی سەرئاوەڵا کە دایکم پاژنەکانی قرتاندبوو، لەبەر بکات و هەر بە هۆی ئەو جل و پێڵاوانەوە چەندجار لە قوتابـخانەدا هەرایەکی گەورە بەرپا بوو. کوڕە بچووکەکان بە سیدنیان دەوت:«جۆزێف پاڵتۆ رەنگاوڕەنگ! ». منیشیان بە هۆی ئەو جاکەتە تەنگ و تەسکەی کە دایکم لەبەری کردبووم( و پێدەچوو چینەکانیشی دیار بن) ناوی«سێرفرانسیس درێك»یان لێ نابووم.

هەر لەو رۆژانەدا کە دایکم ژیانێکی پڕ لە ئازاری رادەبوارد، نەخۆشیی سەرئێشە«میگرێن» تەنگی پێ هەڵچنی و هەر بۆیە ناچار بوو دەست لە کاری دوورمان هەڵگرێ. رۆژانە ناچار بوو لە ژوورێکی تاریکدا رابکشێت و گەڵای چایی لەسەر چاوەکانی دابنێت. «پیکاسۆ» لەناو تەمەنی هونەریی خۆیدا سەردەمێکی«شین»ی هەبوو. ئێمەش سەردەمێکی«خۆڵەمیشیی»مان هەبوو کە لەو سەردەمەدا، بە یارمەتیی خێراتی کڵێسەکان و و بەخششی ناوەند و مرۆڤە خێرخوازەکانەوە دەژیاین. هەرچەند سیدنی لە کاتە بەتاڵەکانیدا رۆژنامەی دەفرۆشت و هەرچەند داهاتەکەشی، وەکوو ئەوە وابوو کە دڵۆپێك لە دەریای کێشەکانی چارەسەر دەکردین، بەڵام هەر باش بوو. بەڵام چونکە هەر قەیرانێك دواجار رۆژێك کۆتایی دێت، قەیرانەکەی ئێمەش دواجارێکی خۆشی هەبوو.

رۆژێکیان کە دایکم بە قەیتانێك چاوەکانی بەستبووەوە، سیدنی بە خرۆش و هەژانێکی تەواوەوە خۆی کرد بەو ژورەدا کە پەنـجەرەکانی داخرابوون" رۆژنامەکانی فڕێ دایە سەر قەرەوێڵەکە و هاواری کرد:«جزدانێکی پارەم دۆزیوەتەوە» و کیفەکەی دایە دەست دایکم. کاتێك دایکم کیفەکەی کردەوە، مشتێك پارەی زێو و مسی تیا بوو. پاشان بە پەلە کیفەکەی داخستەوە و چونکە بە هۆی هەژانی زۆرەوە هێزی تیا نەمابوو، دیسان کەوتەوە ناو قەرەوێڵەکەوە.

سیدنی چووبوو رۆژنامەکانی لەناو«پاس»دا بفرۆشێت و هەروا کە بەدوای مشتەریدا گەڕاوە چاوی بە جزدانێکی پارە کەوتووە کە لەسەر کورسییەکی بەتاڵدا داکەوتووە. بیری لەوە کردۆتەوە کە بە ئەنقەست رۆژنامەیەك فڕێ بداتە سەری. ئەو کارەی کردبوو" دانەویبوو و رۆژنامە و جزدانەکەی



پێکەوە هەڵگرتبوو و پاشان خێرا دابەزیبوو. لەناو زەوییەکی چۆڵ و هۆڵ لە پشت میلەیەکدا جزدانەکەی کردبووەوە و پارەکانی تیا بینیبوو. بۆی گێڕاینەوە کە چۆن دڵی بە لێدان کەوتووە و چۆن بەبێ ئەوەی کە پارەکان بژمێرێت، جزدانەکەی داخستۆتەوە و بەڕاکردن هاتۆتەوە بۆ ماڵەوە.

کاتێك دایکم بە هۆی ئەو هەژانەوە پاڵ کەوت، شتەکانی نێو جزدانەکەی رژاندە سەر مێزەکە. کەچی جزدانەکە هێشتا هەر قورس بوو. لە ناوەڕاستی جزدانەکەدا، خانەیەکیتر هەبوو کە دایکم ئەویشی کردەوە و حەوت لیرەی ئاڵتوونی تیا دۆزییەوە. هێندە شاگەشگەکە بووبووین کە خۆمان پێ رانەدەگیرا. بەختەوەرانە جزدانەکە هیچ ناونیشانێکی خاوەنەکەی تێدا نەبوو و کەواتە دایکم نەیدەتوانی باوەڕە ئایینییەکانی بـخاتە گەڕ. هەرچەند تۆزێك بیرمان لە نەهامەتیی خاوەن جزدانەکە کردەوە بەڵام چونکە دایکم باوەڕی وابوو کە ئەوە دیارییەکی ئاسمانییە و لە لایەن خواوە بۆمان نێردراوە، ئیتر ئەو تۆزە خەفەتەشتمان لە جزدانەکە نەخوارد.

باش نازانم ئاخۆ نەخۆشییەکەی دایکم جەستەیی بوو یان رۆحی، بەڵام پاش هەفتەیەك بە تەواوەتی چاك بووەوە. هەرکە چاك بووەوە، هەموومان بۆ پشوودان چووین بۆ«ساوس ئەند»تا لە قەراخ دەریا رایبوێرین و دایکم سەرتاپا جلوبەرگی تازەی لەبەر کردین.

یەکەمـجار کە دەریام بینی، بەڕاستیی کاریگەرییەکی سیحراویی لەسەرم دانا. کاتێك لە ژێر هەتاوی سووتێنەر و لەکاتی هاتنە خوارەوە لە کۆڵانێکی سەرەوژووردا، لەدەریا نزیك دەبوومەوە، دەریام بە شتێکی هەڵواسراو هاتە بەرچاو" هەڵواسراو وەك گیانلەبەرێکی لەرزۆك کە دەیویست خۆی بهاوێتە سەرم. هەر سێکمان پێڵاوەکانـمان دەردێنا تا لەناو لم و دەریادا رێ بکەین. ئاوێکی شلەتێن کە لە قاچو قولی دەدام، نهێنییەکی جوانی سەبارەت بە راستی بۆ دەردەخستم.

ئەو رۆژە چ رۆژێکی خۆش بوو!

کەنارەکە کە رەنگێکی زەردی زەعفەرانیی هەبوو، بەو سەتڵە شینە گڵێنانەوە و بەو بێڵ و چەترو سایەوانە رەنگامە و بەلەمە بچووکانەوە، کە بەو پەڕی شادییەوە لەسەر شەپۆلە دەم بەبزەکانەوە سەمایان دەکرد و" لە کەناری بەندەرەکەدا، ئەو بەلەمانەی تریش کە لە قەراخەکاندا راگیرابوون و بۆنی قەوزە و قیریان لێ دەهات، دیـمەنێکی یەکجار سەیر و دڵڕفێنی هەبوو. وە من بیرەوەریی یەکجار خۆشم لە هەموو ئەو شتانە هەیە.

ساڵی ١٩٥٧ گەڕامەوە بۆ ساوس ئەند و زۆر بەدوای ئەو کۆڵانەدا گەڕام کە یەکەمجار لێیەوە دەریام بینیبوو، بەڵام هیچ ئاسەوارێکم لێ نەدۆزییەوە. لە کۆتاییەکانی چەند بینایەکی یەکجار زۆر و چروپڕدا پاشماوەی هەندێ شت بە دووکانە قەدیمییەکانییەوە دەبینرا، کە پێدەچوو رۆژێك لە رۆژان گوندێکی بچووکی ماسیگرتن بووبێت. هەموو ئەو شتانە بە زەحمەت بۆنی رابردوویان لێوە دەهات:ڕەنگە بۆنی قەوزە و قیریش بووبێت.

گەنجینەکەمان وەك لمی ناو هێڵەك وابوو و ئێمە دیسان تووشی رۆژانی سەختی و هەژاری دەبووینەوە. دایکم چوو بە دوای کاردا بەڵام کار بە ئاسانیی وەچنگ نەدەکەوت و کێشەکانمان لەسەر یەك کەڵەکە دەبوون. دانەوەی قەرزی قستەکانی دایکم دوا کەوتبوو و مەکینەی دوورمانەکەیان لێ سەندەوە. باوکیشم ئەو ١٠ شلینگە یارمەتییەشی بڕی کە بە دایکمی دەدا.

لەوپەڕی بێهیواییدا پرسی بە پارێزەرێکی تر کرد و ئەویش چونکە زانیی دایکم لەو دادگایەدا هیچی دەست ناکەوێت، پێشنیارەی ئەوەی بە دایکم کرد کە خۆی و منداڵەکانی بخاتە ژێر چاودێری و پشتیوانیی بەرپرسانی شارەداریی«لامبێس»ەوە، تا ئەوان بتوانن باوکم ناچار بکەن ئەو بڕە دراوە بە دایکم بدا لە بۆی بڕیبۆوە.

هیچ رێگەچارەیەکی تر نەبوو:خەرجی دوو منداڵی لەسەر بوو و تەندروستیشی باش نەبوو. کەواتە بڕیاری دا هەرسێکمان بچین بۆ «هەژارخانە» ی لامبێس و لەوێ بمێنینەوە.



٢

## هەژارخانە

هەرچەندە زۆرمان شەرم دەکرد و بەخۆماندا دەشکاینەوە کە بچین بۆ هەژارخانە و لەوێ بژین، بەڵام کاتێك دایکم لەو بارەوە قسەی لەگەڵ کردین، من و سیدنی وامان زانیی ئەوەش بەسەرهاتێکی تازەیە و، ئەو ژیانە تازەیەش، ئەو بارودۆخە دەردناکە دەگۆڕێت کە تیایدا بە هەموومانەوە لەناو ژوورێکی بچووك و خنکێنەردا دەژیاین. بەڵام تا لە دەرگای هەژارخانەکەوە نەچووینە ژوورەوە، نەمانزانی چ باسە. رێك لەو کاتەدا بوو هەستم کرد تەنیای تەنیام، چونکە لەوێدا ئێمەیان لە یەکدیی جیا کردەوە" دایکمیان بەرەو کەمپی ژنان و ئێمەشیان بەرەو لایەکی تر" واتە بەشی منداڵان.

ئاخ... چ بیرەوەرییەکی زیندووم لە خەم و خەفەتی یەکەم دیدارمان لەگەڵ دایکم لە هەژارخانەدا لە بیر ماوەتەوە! کاتێك دایکم بە جلوبەرگی تایبەتیی هەژارخانەوە هات بۆ شوێنی تایبەتیی دیدارەکان و چاوم پێی کەوت، ئەوەندە تێك چووم و شڵەژام کە هەرگیز ناتوانم باسی لێوە بکەم! سیمایەکی زۆر غەریب و پەرێشانی هەبوو! لە ماوەی هەفتەیەکدا بە تەواوەتی کز و لاواز و پیر بووبوو، بەڵام کاتێك ئێمەی بینی، دەموچاوی گەش بووەوە. من و سیدنی دەستمان بە گریان کرد و هەر ئەوەش دایکمی خستە گریانەوە، تا وای لێهات دڵۆپە فرمێسکی درشت لە چاوانییەوە هاتە خوارێ. دواجار بەسەر خۆیدا زاڵ بوو و ئێمەش لەسەر مێزیکی چێویندا دانیشتین و دەستمان لەسەر ئەژنۆ دانا و ئەویش بە سۆز و خۆشەیستییەکی زۆرەوە دەستی بەسەرماندا دەهێنا و بە سەرە تاشراوەکانمان پێدەکەنی و بە جۆرە دڵنەوایی کردنێك دەیلاواندینەوە و بەڵێنی ئەوەشی پێ دەدایـن بەم زووانە دیسان پێکەوە دەژییێینەوە. لە ژێر بەریەخەکەیدا پاکەتێك شیرینیی نارگیلیی دەرهێنا و دای پێمان. ئەو شیرینییەشی لە دووکانی هەژارخانەکە بە پارەی حەقدەستتی چنینی جووتێك سەرقۆڵی تۆڕیی بۆ یەکێك لە پەرستار(سستەر)ەکانی هەژارخانەکە کڕیبووی. کاتێك رۆیشت و ئێمەی

بەجێ هێشت، سیدنی بە خەم و خەفەتێکی یەکجار زۆرەوە پەیتا پەیتا دەیوت: وەی...وەیش... دایکمان چەند پیر بووە! !

***

من و سیدنی، هەر زوو خۆمان لەگەڵ ژیانی هەژارخانەدا گونجاند، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا خەفەتی زۆرمان دەخوارد. من رووداوە بچووکەکانم نایەنەوە بیر، بەڵام لە بیرمە نانی نیوەڕۆمان لەگەڵ منداڵەکانی تر و لەسەر مێزێکی درێژ دەخوارد و بەرنامەیەك هەبوو پڕ لە زەوق و خۆشی و جۆرە میهرەبانییەك کە هەمووومان چاوەڕێمان دەکرد. سەرۆکایەتیی مێزەکە بە یەکێك لە ئەندامانی هەژارخانەکە بوو کە خۆشی لەوێدا دەژیا. پیرەمێردێك بوو نزیکەی ٧٥ ساڵ تەمەنی بوو و زۆر هێمن و لەسەرخۆ دەهاتە پێش چاو و ردێنێکی بچووك و سپیی و چاوانێکی غەمباری هەبوو. منی لە تەنیشت خۆیەوە دانا و تەکلیفی کرد هەمیشە لەوێ دابنیشم" چونکە لە هەموو منداڵەکانی تر کەم تەمەنتر بووم و تا ئەو کاتەی سەریان مەکینە نەکردبووم، فرِترین و جوانترین قژم هەبوو. منی بە"پڵنگەکەی خۆم" بانگ دەکرد و دەیوت کاتێك گەورە بووم، دەستێك جلی رەسمیی لەگەڵ کڵاوێکی بەرز و قەیتاندار لەبەر دەکەم و لە پشت کالسکەکەی ئەودا دادەنیشم و دەستەکانم خاچئاسا دەخەمە سەر یەکتریی. من کە لەو بەڵێنەی شاگەشکە بووبووم، دەسبەجێ هەستم بە جۆرە خۆشەویستییەك کرد بەرانبەری. بەڵام یەك دوو رۆژ دواتر مناڵێکی لە من کەم تەمەنتر هاتە ناومانەوە کە قژێکی لە قژەکانی من فرِتری هەبوو و جێگاکەی منی لە تەنیشت ئەو پیرەمێردەدا گرتەوە، چونکە وەك ئەو پیرەمێردە خۆی بە گاڵتەوە دەیوت، ئەو هەمیشە منداڵە قژفرِە بچووکترەکانی لە سەرووتر دادەنا.

سێ حەفتە دواتر ئێمەیان لە هەژارخانەی لامبێسەوە برد بۆ خوێندنگەی«هان ڤۆڵ» کە تایبەت بوو بە منداڵە هەتیو و ئاوارەکان و لە بیست کیلۆمتریی لەندەنەوە هەڵکەوتبوو. لەناو عارەبانەیەکی نانەواییدا بووین و لەچاو بارودۆخەکە و چۆنیەتیی رێگاوبانەکە، باش بوو" چونکە دەشت و دەری دەوروبەری هان ڤۆڵ لەو سەردەمەدا زۆر جوان بوو و کووچەباخی شابەڕوو و کێڵگەی گەنمی نزیکە دروێنە و چەندین باخە میوەی جوان و پڕ بەروبومی هەبوو. لەو کاتە بە دواوە، هەمیشە بۆنی تێژ و عەتراویی دەشتەکان، لەدوای باران بارین، «هان ڤۆڵ»ی وە بیر هێناومەتەوە. لەگەڵ گەیشتنمان بۆ ئەوێ، لە قەرەنتینەدا رایان گرتین و هەندێ پشکنینیان بۆ کردین لە رووی رۆحیی و جەستەییەوە، کارێك کە پێش وەرگرتنی منداڵان لە خوێندنگەدا، بەزۆری بوو. هۆیەکەشی ئەوە بوو کە ئەگەر لەناو



٣٠٠ یان٤٠٠ منداڵدا تاقە منداڵێکی بیرکۆڵ یان نەخۆش هەبوایە، جیا لەوەی کە خۆی لە بارودۆخێکی خراپدا دەبوو، ئەگەری ئەوەش لە ئارادا بوو کە کاریگەریی خراپ لەسەر قوتابییەکانی تریش دابنێت.

یەکەم رۆژەکان زۆر گێژ و حۆل بووم و زۆریش شڵەژاو و پەرێشان بووم، چونکە لە هەژارخانەدا، لانیکەم ئەو ئیحساسەم هەبوو کە دایکم لێم دوور نییە و هەر ئەوەش ورەی پێ دەبەخشیم" بەڵام لە هان ڤۆڵدا وام هەست دەکرد کە چەندین کیلۆمتر لە یەکدیی دوورین. من و سیدنی هەردووکمان لە خوێندنگەکە وەرگیراین بەڵام لەوێدا لە یەکتری جیایان کردینەوە. سیدنییان خستە گەڵ گەورەترەکان و منیش لەگەڵ بچووکترەکان. لە خەوگەی جیاشدا دەنووستین و زۆر بەکەمیی یەکتریمان دەبینی. لەو کاتەدا تەمەنم لە ٦ ساڵ تۆزێك زیاتر بوو و تاك کەوتبوومەوە و هەر ئەوەش چارەڕەش و داماوی کردبووم! . بۆ نموونە شەوانی هاوین لە کاتی نوێژ و دۆعا و پێش نووستن، کاتێك لەگەڵ ٢٠ منداڵی تر لە ناوەڕاستی خەوگەدا و بە جلی خەوەوە لەسەر ئەژنۆ دادەنیشتین و من لە پشت پەنجەرە درێژەکانی ژوورەکەوە ئاسمانی ئێوارەم تەماشا دەکرد کە هێدی هێدی تاریك دەبوو و شەپۆلی گردەکانم دەبینی، بەرانبەر هەموو ئەو شتانە، هەستم بە نامۆبوون دەکرد. سەرەڕای ئەوەش، هەموومان پێکەوە بە دەنگی ناهارمۆنی و نایەکسانەوە وامان دەخوێند:

لە لام بمێنەرەوە، زوو شەو دادێت
هەوا هەردەیێ و تاریکتر دەبێت، ئەی خوایە! لە لام بمێنەرەوە
کاتێك هەموان لە بیرمان دەکەن و هیچ ئومێدێکمان نامێنێت،
ئاخ...ئەی هیوای هیوابڕاوان، تۆ لەلام بمێنەرەوە

لەو کاتەدا بوو کە خۆم لە هەموو ئەوانی تر، داماوتر و سیاچارەتر دەبینی. زۆر هەوڵم دەدا هیچ لەو سروودە تێ نەگەم، بەڵام تۆنی ئاوازەکە و رووناکیی هەتاو، کە هەردووکیان دەهاتنە خوارەوە و هێدی هێدی دەتوانەوە، خەم و خەفەتیان زیاتر دەکردم.

دوو مانگ دواتر، بە سەرسووڕمانێکی مەیلەو خۆشحاڵییەوە زانیم دایکم کارێکی کردووە کە بۆ ماوەیەك لە خوێندنگە بمانهێننە دەرەوە و بماننێرن بۆ هەژارخانەی لامبێس لە لەندەن. دایکم لەبەردەم هەژارخانەکەدا چاوەڕێی دەکردم بەڵام ئەمجارە جلی تایبەتیی خۆی لەبەردا بوو. داوای کردبوو مۆڵەتمان پێ بدەن ئەو رۆژە بچینە دەرەوەی هەژارخانەکە، چونکە دەیویست تەواوی ئەو رۆژە

لەگەڵ منداڵەکانیدا بێت و بڕیاری دابوو پاش ئەو چەند کاتژمێرەی کە لە دەرەوەی هەژارخانەدا دەبین، هەر هەمان ئەو ڕۆژە بگەڕێتەوە بۆ هەژارخانەکە. چونکە دایکم ئەندامی شەوانەڕۆژیی هەژارخانەکە بوو، ئەوە تەنیا فێڵێك بوو کە دەیتوانی بە کاری بهێنێت بۆ ئەوەی بتوانێ چاوی بە ئێمە بکەوێت.

پێش ئەوەی بچینە هەژارخانەکە، جلە تایبەتییەکانیان لێ سەندبووین کە لە جلشۆرییە گشتییەکاندا بیانشۆرن. دواتریش بە ئۆتوونەکراوی دایانەوە پێمان. من و سیدنی و دایکم لەو کاتەدا کە بە بەردەم دەرگاکاندا تێدەپەڕین، سەر و سیمایەکی شپرزە و هەژارانەمان هەبوو. بەیانیی زوو بووو شوێنێکمان نەبوو بۆی بچین، بۆیە بەرەو پارکی کنینگتۆن بەڕێ کەوتین کە یەك و نیو کیلۆمتر لەولاتر بوو. سیدنی ۹ پێنی پارەی هەبوو کە خستبوویە ناو دەسڕێکەوە. نیو کیلۆ بەڵاڵووکمان کڕی و تەواوی ئەو پێش نیوەڕۆیەمان لە باخدا لەسەر مێزێکی بەڵاڵووك¬خواردن تێ¬پەڕاند. سیدنی لاپەڕەیەك ڕۆژنامەی کردە تۆپ و، پەتێکی پێوە بەست و ماوەیەك تۆپێنمان کرد. کە نیوەڕۆ داهات، چووین بۆ کافتریایەك و پاشماوەی پارەکەشمان خەرج کرد: دوو پێنی بۆ کێك، یەك پێنی بۆ پارچەیەك شاماسی و دوو پیاڵە چاش بە نیو پێنی. هەموومان لە بەینی خۆماندا دابەش کرد. پاشان گەڕاینەوە بۆ پارك و من و سیدنی درێژەمان بە یاریکردن دا. دایکیشم دانیشتبوو و خەریکی چنین بوو.

پاش نیوەڕۆ ڕێگای هەژارخانەمان گرتەبەر و دایکم بە دەنگێکی نزمەوە گوتی: باش بوو لەسەروەختی چاخواردنەکەدا گەییشتین. بەڕێوەبەری هەژارخانەکە لە دەسمان تووڕە بوو چونکە مانەوەی ئێمە لە دەرەوە ناچاری کردبوو جارێکیتر جلەکانــمان بنێرێت بۆ جلشۆرخانەی گشتی و کەواتە من و سیدنی دەبوایە پێش گەڕانەوەمان بۆ هان ڤۆڵ، ماوەیەك زیاتر لە هەژارخانەدا بــمێنینەوە. دیارە ئەوەش ماوەیەکی زیاتری بۆ دەرەخساندین کە لەگەڵ دایکماندا بین.

بەڵام ئەمــجارە نزیکەی ساڵێك لە هان ڤۆڵدا ماینەوە، ساڵێکی زۆر ڕەسمی و پڕ لە دسیپلین و یاسا، و من لەو ماوەیەدا دەستم بە خوێندن کرد و فێریان کردم ناوی خۆم«چاپلین» لەسەر کاغەز بنووسم. شێوەی وشەکە زۆر سەرنــجی ڕادەکێشام و وا هەستم دەکرد ﴿شێوەی ناوەکەم﴾ لە خۆم دەچێت. خوێندنگەی هان ڤۆڵ، دابەش کرابوو بە دوو بەشەوە: بەشێك بۆ کوڕە بچووکەکان و بەشێك بۆ کچە بچووکەکان. ڕۆژانی شەمە پاش نیوەڕۆ، حەمامی خوێندنگە تایبەت بوو بە کوڕە بچووکەکان کە ئەرکی شۆردنیان لە ئەستۆی کچە گەورەکاندا بوو. من هێشتا تەمەنم نەبووبوو بە حەوت ساڵ و لەو



جۆرە کاتانەدا زۆر شەرمن بووم. بینینی کچێکی ١٤ ساڵە لەناو حەمامدا، کە بە پەنجەوانە(دەسکێش)ێکی لۆکە هەموو لەشم بشۆرێت، یەکەم کێشەم بوو.

لە حەوت ساڵیدا دەبوایە لە کەمپی منداڵانەوە بگوازرێــمەوە بۆ بەشی گەورەترەکان کە تەمەنیان لە نێوان ٧ بۆ ١٤ ساڵ بوو. لەو ساتەوە دەمتوانی لە هەموو کارەکانی پێوەندیدار بە قوتابییە گەورەکانەوە بەشداریی بکەم، لەوانە ژیــمناستیك و تەمرینە وەرزشییەکان و هەروەها گەشتی بە کۆمەڵ کە هەموو حەفتەیەك دوو جار لە دەرەوەی خوێندنگەدا ئەنــجام دەدرا.

لە هان ڤۆڵدا هەوڵی زۆریان دەدا کە چاودێریی زۆرمان بکەن و پێمان رابگەن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ژیانــمان لەوێدا بۆنی غوربەت و تەنیایی دەدا. شوێنەکەی زۆر خەماویی بوو. ئێمەش کە ١٠٠ قوتابیی شەوانەڕۆژیی بووین، لە ناو کووچەباخە کوێستانییەکانی دەرەوەی خوێندنگەدا، لە دوو ریزدا ڕێــمان دەکرد و هەوای خەم و خەفەتــمان هەڵدەمژی. من زۆر بێزار بووم لەو گەشت و سەیرانانەو هەروەها تێپەڕین بەناو ئەو گوندانەشدا کە دانیشتوانیان بە چاوی سووك سەیریان دەکردین. ئێمە لەبەر چاوی ئەوان شەوانەڕۆژییەکانی هەژارخانە بووین.

حەوشەی کایەکردنی کوڕە بچووکەکان، پانتاییەکی ٨٠ لە ٥٠ مەتری بوو و بە تاتەبەردی پانو گەورە بەردچنیان کردبوو. لە دەوروبەری ئەو حەوشە، چەند بینایەکی لە خشت دروستکراو هەبوون کە تیایاندا چەن ئۆفیسێك، هەندێ دووکان، نەخۆشخانەیەك، ئۆفیسێکی ددانسازیی و ژوورێکی جل¬گۆڕین هەبوو. لە تاریکترین سووچی حەوشەکەدا ژوورێکی بەتاڵ هەبوو، ماوەیەك بوو کوڕێکی تەمەن ١٤ ساڵەیان تێدا بەند کردبوو و وەك باسیان دەکرد، تاوانەکەی زۆر گەورە بووە:

ئەو کوڕە هەوڵی داوە لە ڕێگای پەنــجەرەی نهۆمی یەکەمەوە خۆی بگەیەنێتە سەربان و لەوێوە لە خوێندنگە هەڵێت و تەنانەت بەرد و «بەڕووی هیندی»شی لەو ئەو پاسەوانانەی خوێندنگە هەڵکردبوو کە دوای کەوتبوون. ئەو کارەش لە کاتێکدا کراوە کە منداڵە بچووکترەکان لە خەودا بوونە و بەیانیی ئەو ڕۆژە، گەورەترەکان، حەکایەتێکی سەیریان لەو بارەوە بۆ دەگێڕاینەوە.

سزادانی ئەو جۆرە تاوانە گەورانە، ڕۆژانی هەینی لە هۆڵی گەورەی ژیــمناستیکدا بەڕێوە دەچوو. ئەو شوێنە، هۆڵێکی شووم و بەدفەڕ بوو،٢٠ لە ١٢ مترێك پان و بەرین بوو، میچێکی یەکجار بەرزی هەبوو و لەبن هەر سووچێکیدا هەندێ پەتیان هەڵواسیبوون کە دەگەییشتنە بن میچەکە. بەیانییانی هەینی، ٢٠٠ تا ٣٠٠ قوتابیی ٧ تا ١٤ ساڵە دەچوونە ئەو هۆڵەوە و لە بن هەر

سێ سووچەکەیدا وەکوو سەرباز بە ریز دەوەستان. سووچی چوارەم لە کۆتایی هۆڵەکەدا بوو کە لەوێ لەپشت مێزێکی گەورەی هێندەی مێزی چاخانەکان، تاوانبارەکان دەوەستان و چاوەڕێی سزادانیان دەکرد. لە لای راستی ئەو مێزەدا، سێ پایەیەك هەبوو کە کەلەپچەی چەرمییان پێوە هەڵواسیبوو و لە تەنیشت ئەوانەشەوە، هەندێك شووڵ و تووڵەداری مەترسیدار دەبینران.

بۆ ئەو تاوانانەی کە ئەوەندە قورس نەبوون، قوتابییان بە پشتەوە لەسەر مێزەکە رادەکشاند و سەربازێك پێیەکانی دەبەستەوە و رای دەگرت. لەو کاتەدا سەربازێکی تر کراسەکەی تا نزیك سەری هەڵدەدایەوە و پانتۆڵەکەی دادەکەند.

لەو کاتەدا، ئەفسەر«هیندرام» کە ئەفسەرێکی خانەنشینی هێزی دەریایی بوو و کێشی زیاتر لە ١٠٠ کیلۆ دەبوو، دەستێکی لە پشتی دەخست و بە دەستێکی تری، گۆچانێك بە بارستایی «پەنجە گەورە» و بە درێژایی ١ متر و ٢٠ سانتیمتری دەسووڕاندەوە و لەسەر هەر دوو قاچی تاوانبارەکە دادەنیشت و پشت رانی کوڕەکەشی لەگەڵ درێژایی گۆچانەکەدا بەراورد دەکرد و بەدەم فیکەلێدانەوە، لە سمتی تاوانباری دەدا. دیمەنێکی ترسناك بوو و هەمیشە یەکێك لە قوتابییەکانی ریزی پێشەوە لە ترسان دەبوورایەوە و دەکەوت.

لانیکەمی ئەو لێدانە ٣ و لانی زۆریشی ٦ لێدان بوو. هەرکاتێك تاوانبارێك زیاتر لە ٣ لێدانی دەخوارد، هاوار و قیژەیەکی ترسناکی لێ هەڵدەستا. هەندێجاریش تووشی بێدەنگییەکی داخورپێنەر دەبوو، یان دوایی دەردەکەوت کە بووراوەتە و لە هۆش چووە. ئەو لێدانانە ئەوەندە کوشندە بوون کە دەبوایە دەسبەجێ لێدراوەکە ببەنە سەر دۆشەکەی ژیمناستیکەکە و لەوێدا رایبکێشن و لێگەڕێن لانیکەم ١٠ خولەك ئاه و ناڵە و زریکە زریك بکات تا ئێش و ئازارەکەی بسرەوێت. سەرەڕای هەموو ئەوانەش، جێگای رووشان و سووتانی ٣ لێدانەکە، کە پان و سوور بوو و لە پەنجەی جلشۆر دەچوو، دەبینرا.

لێدانی شەلاق و تووڵەدار جیاوازن لەگەڵ یەکدیدا. تاوانبار دوای خواردنی ٣ لێدان، بە ٢ سەربازەوە دەگوازرایەوە بۆ نەخۆشخانە تا بکەوێتە ژێر چاودێریی تەندروستییەوە.

قوتابییەکان هەمیشە پێیان دەگوتین کە هیچ کاتێك حاشا لە هیچ تاوانێك نەکەین تەنانەت ئەگەریش بێ تاوان بین، چونکە ئەگەر تاوانەکەیان بسەلماندایە، زیاترین رادەی سزایان بۆ دەبڕینەوە. جیا لەوەش ئێمە دەم و زمانی ئەوەمان نەبوو بتوانین وەکوو پێویست داکۆکیی لە بێتاوانیی خۆمان بکەین.



یەکەم دیمەنی سزادانی تاوانبارێکم لە بیرە. کاتێك بەڕێوەبەر و دەستەی هاوڕێی، هاتنە ژوورەوە، من بە بێدەنگیی راوەستابووم. تاوانبارێك لە پشت مێزێکدا بوو کە هەوڵی دابوو لە خوێندنگە هەڵێت. کوڕەکە ئەوەندە ورد و چکۆلە دەهاتە بەر چاو، کە لە پشت مێزەکەدا جگە لە سەر و مل و شانەکانی، هیچ کوێیەکی تری لەشی دیار نەبوو. دەموچاوێکی لەڕ و لاواز و چاوانێکی درشتی هەبوو. بەڕێوەبەر، بە لووتبەرزییەکی یەکجار زۆرەوە، تاواننامەکەی خوێندەوەو ئینجا پرسیی:

_ تۆ تاوانباریت یا نا؟

تاوانبارەکە وەڵامی نەدایەوە و بە تووڕەییەوە لە بەڕێوەبەری روانی. لەو کاتەدا بردیان تا بەردەم سێ پایەیەك. چونکە باڵای کورت بوو، لەسەر سندووقێکی چای دایان نا تا بتوانن مەچەکەکانی ببەستنەوە. سێ قەمچییان لە جەستەی دا و پاشان بە مەبەستی چاودێریی پزیشکیی، بردیان بۆ نەخۆشخانە.

رۆژانی پێنجشەمە لە حەوشەدا، زوڕنایەك لێدرا و ئێمەش هەمووومان یارییەکەمان وەستاند و وەك پەیکەرێك لە جێی خۆماندا وشك بووین. لەو کاتەدا ئەفسەر هیندرام لە بڵێندگۆوە ناوی ئەو کەسانەی دەخوێندەوە کە دەبوایە رۆژی هەینیی خۆیان بۆ سزادان بە نووسینگەی خوێندنگە بناسێنن.

لە پێنجشەمەیەکدا بەوپەڕی سەرسوڕمانەوە گوێم لە ناوی خۆم بوو. هەرچەند بیرم کردەوە بزانم چیم کردووە، هیچم بە بیردا نەهاتەوە. نەشمدەزانی بۆچی دڵم ئەوەندە توند لێی دەدا. رەنگە لەبەر ئەوە بووبێت کە کەوتبوومە ناوەڕاستی چەرمەسەریی و بەدبەختییەوە. رۆژی سزادان چوومە پێشەوە. بەڕێوەبەر گوتی:

تۆ بەوە تاوانباریت کە ئاگرت لە ئاودەستەکان بەرداوە! .

ئەوە راست نەبوو. مندالەکان چەند پارچە کاغەزیان لە تەختی ئاودەستەکاندا ئاگر دابوو و رێك لەو کاتەدا کە ئاگرەکە دەسووتا، من چوومە ناو ئاودەستەکانەوە، بەڵام لەو رووداوەدا هیچ دەورێکم نەبوو.

***

بەوپەڕی تووڕەیی و وەڕزیی و بە بێهێزیی و سستییەکی دەروونییەوە، مینگەمینگێکم کرد و وتم بەڵێ «تاوانبارم». کاتێك دەیانبردم بەرەو لای ئەو مێزە ناشیرینە، تا ٣ لێدان لە سمتم بدەن، نە

رقو کینەیەکم لە دڵدا بوو، نە هەستیشم بە نادادپەروەریی دەکرد“ تەنیا ئەوە نەبێت کە بیرم لە بەسەرهاتێکی ترسناك دەکردەوە کە خەریك بوو بەسەرم دەهات. ئێش و ئازاری لێدانەکان ئەوەندە زۆر بوو کە هەناسەم سوار بووبوو، بەڵام هیچ هاوارێکم نەکرد و نەمقیڕاند و هەرچەند ئێش و ئازار، تەنگی پێ هەڵچنیبووم، بەڵام لەو کاتەدا کە دەیانبردم بۆ ئەوەی بـمخەنە سەر دۆشەکی ژیـمناستیکەکە بەڵکوو تۆزێك بێمەوە سەرخۆ، وا هەستم دەکرد منداڵێکی ئازام و سەرکەوتنم بەدەست هێناوە.

سیدنی چونکە لە چێشتخانەدا کاری دەکرد، تا ئەو رۆژە ئاگاداری ئەو رووداوە نەبوو. رێك ئەو رۆژە لەگەڵ ئەوانیتر هاتە ناو هۆڵی ژیـمناستیکەوە و بەوپەڕی سەرسووڕمانەوە منی لە پشت مێزی دادگایی کردندا بینی کە تەنیا سەرم دیار بوو. دواتر بۆی گێڕامەوە کە کاتێك بینیبووی ٣ لێدانەکەیان لێ داوم، بەو پەڕی تووڕەییەوە و پڕ بە دڵ بۆم گریاوە.

برای بچووکتر کاتێك دەیویست بیری برای گەورەی خۆی بکاتەوە، دەیوت:«ئەی برا بچکۆلەکەم». و هەر ئەو قسەیە جۆرە شانازی و لەخۆبایی بوونێکی بۆ دروست دەکرد و جۆرە ئارامیی و ئاسوودەییەکی پێ دەبەخشی. خودی سیدنیم لە کاتێکدا دی، کە لە هۆڵی نانـخواردنەوە دەهاتە دەرەوە. ئەو چونکە لە چێشتخانەدا کاری دەکرد، زۆربەی جاران لەتە نانێکی گەورە و پارچەیەکی گەورەی کەرەی بۆ دەهێنام و پێی دەدام. منیش نانەکەم لەژێر شاڵەکەمدا دەشاردەوە و دەمبرد لەگەڵ یەکێك لە هاوڕێکانـمدا بەشم دەکرد. ئێمە برسیمان نەبوو بەڵام ئەو پارچە کەرە گەورەیە، خواردنێکی شاهانە بوو. بەڵام زۆری نەخایاند ئەو چرکەساتە شیرینانەش کۆتاییان هات چونکە سیدنی، بۆ ئەوەی بگاتە پاپۆڕی«ئێکسمۆت» هان ڤۆڵی بە جێ هێشت.

ئەو کوڕانەی کە لە هەژارخانەدا بەخێو دەکران، لە تەمەنی ١١ ساڵیدا دەیانتوانی لە هێزی زەمینیی(پیادە) یان دەریاییدا دابـمەزرێن. ئەگەر کەسێك هێزی دەریایی هەڵبژاردایە، دەیاننارد بۆ سەر پاپۆڕی ئێکسمۆت. دیارە هیچ زۆرەملێییەکی تێدا نەبوو، بەڵام سیدنی خۆی حەزی لە کار و پیشەیەکی دەریایی بوو. بە هەرحاڵ من لە هان ڤۆڵدا بە تەنیا مامەوە.

قژی سەر، هۆکارێکی گرینگە بۆ دەسنیشانکردنی کەسایەتیی منداڵان. هەر لەبەر ئەوەشە کاتێك قژی منداڵێك دەتاشن، زۆر دەگری و جۆری قژەکەشی هەرچۆنێك بێت، قرژ بێت، یا خود نەرم و خاو، یان بازنەیی بێت، مرۆڤ هەست دەکات بەشێك لە لەشی لێ جیا دەکەنەوە.



لەو سەردەمەدا لە هان ڤۆڵدا نەخۆشیی کەچەڵی تەشەنەی سەندبوو و لەبەر ئەوەش کە ئەو نەخۆشییە«بڵاوەگیر»ە “ تووشبووەکانیان گواستەوە بۆ شوێنێکی دوورتر، کە لە لای سەرەوەی حەوشەکەوە هەڵکەوتبوو. ئێمە زۆربەی جار لە پشت پەنـجەرەوە دەمانڕوانی و ئەو منداڵە داماوانەمان دەبینی کە بە حەسرەتەوە لە ئێمەیان دەڕوانی و سەریان تاشیبوون و رەنگی لە رەنگی«تێنتریۆد »بوو. دیـمەنێکی ناشیرینیان هەبوو و ئێمەش بە چاوێکی سووك سەیرمان دەکردن. هەر بۆیە کاتێك یەکێك لە پەرستارەکان لە ژووری نانـخواردندا لە پشتی سەرمەوە وەستا تا قژم بپشکنێ، هەرکە گوتی:«کەچەڵیت! » دامە پڕمەی گریان.

دەرمان و چارەسەرکردنی کەچەڵییەکەم چەند حەفتەیەکی خایاند، ئەو حەفتانەی کە لای من هێندەی چەندین سەدە دەبوون. سەریان تاشیم و تێنتریۆدیان لێ دا و وەکوو کرێکارانی کێڵگەی پەمۆ، دەسماڵێکیشیان لە دەوری سەرم بەست. تەنیا کارێك کە حەزم نەدەکرد بیکەم ئەوە بوو کە وەکوو ئەوانەی تریش کە لە قەرەنتینەدا بەند کرابوون، لە پەنـجەرەوە بڕوانـمە دەرەوە“ چونکە دەمزانی لەو لاوە «ساغ و سلامەتەکان» چەندە سووك سەیرمان دەکەن.

لەو کاتانەدا کە تەنیا مابوومەوە، دایکم هات بۆ بینینم. نازانم چۆن توانیبووی لە هەژارخانە بچێتە دەرەوە و لەگەڵ ئەوەشدا هەوڵی ئەوەشی دەدا خانوویەکمان بۆ بدۆزێتەوە. حزووری ئەو بۆ من، رێك وەکوو چەپکە گوڵێك وابوو. ئەوەندە تەرش و تازە و جوان و سەرنـجڕاکێش دەهاتە بەرچاوم کە من لە سەر و وەزعی شپرزە و پیس و پۆخڵ و سەری تاشراو و تێنتریۆد لێدراوی خۆم شەرمم دەکرد.

پەرستارەکە گوتی:

_ دەبێ بـمانبوورن ئەگەر دەموچاوی منداڵەکەتان پیسە.

دایکم دەستی کرد بە پێکەنین و لە بیرمە کە بە چ سۆز و خۆشەویستییەك لە باوەشی گرتم و ماچی کردم و گوتی:

_ بەو هەموو چڵك و پیسییەشەوە هێشتا هەر خۆشم دەوێی.

ماوەیەك دواتر سیدنی پاپۆڕی ئێکسمۆتی بەجێهێشت و منیش هان ڤۆڵم بەجێهێشت. دایکمان دۆزییەوە. ژوورێکی لە پارکی کنینگتۆندا بەکرێ گرتبوو و ماوەیەکی کەم توانیی بەخێومان بکات. بەڵام زۆری نەخایاند کە دیسانەوە گەڕاینەوە بۆ هەژارخانە. هۆکاری گەڕانەوەمان بۆ هەژارخانە، ئەوە بوو کە دایکم نەیتوانی هیچ کارێك﴿بۆ بژێویی ژیانـمان﴾ بدۆزێتەوە و هەروەها کارە هونەرییەکانی

باوکیشم یەکجار کەم بوبووەوە. لەو ماوەیەشدا هەر خەریکی گواستنەوەی کەلوپەلەکانمان بووین لە ژوورێکی تەنگ و تاریکەوە بۆ ژوورێکی تەنگ و تاریکی تر. رێك وەکوو یاریی"دامە" بە دوایین جوولە، چووینەوە بۆ هەژارخانە.

جا چون گەرەك و کەوشەنی کلێسەکەمان گۆڕابوو، ئێمەیان نارد بۆ بینایەکی تر و لەوێشەوە رەوانەی خوێندنگەی«نۆر ڤۆد »یان کردین. ئەم خوێندنگەیە لەچاو خوێندنگەی هان ڤۆڵ زۆر بەدفەڕترو ناخۆشتر بوو. لەوێدا گەڵای داران تۆختر و دارەکانیش بەرزتر بوون. رەنگە سارای دەوروبەرەکەی شکۆو گەورەییەکی زیاتری هەبوو، بەڵام هیچ خۆشیی و شادیی و هەژانێکی نەبوو. هەر لەو رۆژانەدا، رۆژێکیان کە سیدنی یاریی تۆپێنی دەکرد، دوو ژنی پەرەستار بانگیان کردە دەرەوە تا پێی رابگەینن کە دایکمان شێت بووە و هەر بۆیە رەوانەی شێتخانەی «کین هیل»یان کردووە. کاتێك سیدنی ئەو هەواڵەی بیست، هیچ کاردانەوەیەکی نەبوو و گەڕایەوە بۆ زەویی تۆپێن و درێژەی بە یارییەکە دا. بەڵام هەرکە یارییەکەی تەواو بوو، لە سووچێکدا دانیشت و دەستی کردە گریان.

کاتێك بەسەرهاتەکەی بۆ منیش گێڕایەوە، باوەڕم نەدەکرد. نەگریام بەڵام خەم و خەفەتێکی زۆر دایگرتم. بۆچی وای لێ هاتبوو؟ دایکم کە ژنێکی ئەوەندە بەکەیف و سەرخۆش بوو، بۆچی شێت بووبوو؟ بە جۆرێکی نامۆ هەستم دەکرد دایکم بە ئەنقەست خۆی لە کۆت و بەندی عەقڵ و بیرکردنەوە رزگار کردووە، بۆ ئەوەی بتوانێت بە ئاسانیی وازمان لێ بهێنێت. لەو خەفەت و خەمبارییەدا، دایکم هێنایە پێش چاوم کە بەر لەوەی شێت ببێت، بە نیگایەکی خەماوییەوە لێم دەڕوانێت.

هەواڵی رەسمیی ئەو کارەساتەیان دوای حەفتەیەك بە ئێمە دابوو. ئەوەشیان پێ گوتین کە بە پێی حوکمی دادگا، باوکمان دەبێ بەخێوکردنی من و سیدنی بگرێتە ئەستۆ. بیرکردنەوە لەوەی کە دەبێ لەگەڵ باوکمدا بژین، بێتاقەتی دەکردم. لە هەموو ژیانمدا دووجار زیاتر باوکمم نەبینیبوو، جارێکیان لەسەر شانۆ و جارێکیشیان لە کاتی تێپەڕین لەبەردەم خانوویەك لە شەقامی کنینگتۆندا کاتێك کە لەگەڵ ژنێکدا لە باخێکەوە دەگەڕایەوە. من وەستام و تەماشام کرد و هەر بە پێی غەریزە وای بۆچووبووم کە باوکمە. ئەویش ئاماژەیەکی بۆ کردم کە بچمە پێشەوە و ناومی پرسی. بە شێوەیەکی فێڵبازانە و ئاگایانەش، تۆزێك خۆم کز کرد و وتم «چارلی چاپلین! ». دەسبەجێ چاوێکی پڕ مانای لەو خانمەی هاوڕێی کرد و گیرفانەکانی پشکنی و وردەپارەیەکی نیو کرۆنیی پێ دام. پاشان بە بێ ئەوەی کە ماتڵ ببم و بە بێ ئاوڕدانە گەڕامەوە بۆ ماڵەوە تا بە دایکم بڵێم کە باوکمم لە بازاڕدا بینیوە.



ئەوە ئێستاش ناچار بووین لەگەڵیدا بژین! هەرچۆنێك بێت شەقامی کنینگتۆن ناسراوتر و خۆشتر لە شەقامی سەرسووڕهێنەر و تاریك و تنۆکی «نۆر ڤۆد » بوو.

ئێمەیان بە عارەبانەیەکی دابەشکردنی نان برد بۆ شەقامی کنینگتۆن، ﴿خانووی﴾ ژمارە ٢٨٧، هەمان ئەو خانووەی کە تیایدا باوکمم بینیبوو کە بە بەردەم باخەکەیدا تێپەڕیبوو. هەمان ئەو خانمەش کە ئەو رۆژە لەگەڵ باوکمدا بوو، دەرگاکەی لێ کردینەوە. هەرچەند تۆزێك هیلاك و تووڕە دەهاتە بەرچاو، بەڵام ژنێکی جوان و لەبەردڵان بوو" باڵابەرز و لەشولاری جوان" لێوی گۆشتن و چاوی ئاسکیی و نیگایەکی خەمباریشی هەبوو. پێدەچوو تەمەنی ٣٠ ساڵ بێت. ناوی «لویز»بوو. پێی گوتین کە ئاغای چاپلین لە ماڵەوە نییە، بەڵام پاش ئەنجامدانی رێوڕەسمە باوەکان و واژۆکردنی هەندێ بەڵگە، ئێمەیان سپاردە دەستی خانمی لویز و ئەویش چەند پلیکانێك بردینیە سەرەوە تا گەییشتینە ژووری هۆڵەکە. کاتێك چووینە ناوەوە، منداڵێکی زۆر جوانی ٤ ساڵە کە چاوەکانی درشت و تۆخ و قژیشی خورمایی بوون، لەسەر فەرشەکە یاریی دەکرد. ئەو کوڕی لویز و زڕبرای من بوو.

بنەماڵەکان لەناو دوو ژووردا دەژیان و ئەگەرچی ژوورەکەی پێشەوە، چەند پەنجەرەی گەورەی هەبوو، بەڵام رووناکییەکی هێندە کز لێی دەدا وەك بڵێی لە ئاکواریۆمێك دەچێت. هەموو شتێك لەوێدا وەکوو روخساری خودی لویز خەفەت هێنەر بوو" کاغەزی دیوارەکان حاڵەتێکی خەمهێنەری هەبوو" مۆبلەکان خەفەتهێنەر بوون" هەروەها ئەو ماسییە وشك کراوەی ناو جامخانەکە کە ماسییەکی لەخۆی گەورەتری قووت دابوو و سەرەکەی لە دەرەوە مابووەوە، حاڵەتێکی ئێجگار خەفەتهێنەری هەبوو. لەو ژوورە بەتاڵەدا، لویز قەرەوێڵەیەکی زیادەی بۆ من و سیدنی دانابوو، بەڵام زۆر بچووك بوو. سیدنی پێشنیاری کرد کە مۆڵەتی بدەنێ لەسەر مۆبلی ناو هولەکەدا بنوێت. لویز ناوچاوی گرژ کرد و گوتی:

_ هەر کوێیان پێ گوتی، لەوێدا بنوو! .

بێدەنگییەکی ئازاردەر زاڵ بوو و ئێمەش گەڕاینەوە بۆ ژووری دانیشتن. دیارە بە رووخۆشییەوە پێشوازییان لێ نەکردین و دیارە جێی سەرسووڕمانیش نەبوو. ئێمە لە پڕێکدا بووبووینە سەرباری ئەو ژن و پیاوە و منداڵی ژنێك بووین کە تەڵاق دراوە و رۆیشتووە. هەردووکمان بەبێ ئەوەی متەقمان لێوە بێ، دانیشتین و تەماشای لویزمان دەکرد کە خەریکی دانانی کەلوپەلی سەر سفرە بوو. لویز لە سیدنی روانی و بە تووڕەییەوە گوتی:

_ لانیکەم برۆ ئەم سەتڵە پڕ بکە لە خەڵووز و بیهێنە، بەڵکوو کەڵکێکت هەبێت. پاشان رووی لە من کرد و گوتی:

_ تۆیش برۆ تا ئەم فرۆشگایەی پاڵ دەسمان«کەڵی سپیی» شلینگێك کۆنسێرڤی گا بکڕە.

چونکە لەو شوێنە ناخۆش و خەفەوە دەردەچووم، زۆر خۆشحاڵ بووم. راستییەکەی خەریك بوو کەم کەم دەترسام و ئاخی ئەوەم هەڵدەکێشا کە بۆچی نۆرڤۆدم بە جێ هێشتبوو؟.

باوکم برێك درەنگتر هاتە ماڵەوە و بە گەرمیی پێشوازیی لێ کردین. زۆر حەیرانی بەژن و باڵای بووبووم. لەکاتی نانـخواردندا چاوم لە هەموو جووڵەکانی بوو" تەماشای جۆری نانـخواردنیم دەکرد و جۆری چەقۆ گرتنەدەسی بۆ بڕینی گۆشت، کە وەك قەڵەمێك بە دەستییەوە گرتبوو ومن ساڵانێکی زۆر لاسایی جووڵەکانی ئەوم دەکردەوە. کاتێك لویز بە باوکمی وت سیدنی گلەیی هەیە لە بچووکیی قەرەوێڵەکەوە، باوکم گوتی با سیدنی لە هۆڵەکە و لەسەر قەرەوێڵە گەورەکەدا بنوێت. ئەو سەرکەوتنەی سیدنی، رق و کینەی لویزی وروژاند و هەرگیزیش لێی خۆش نەبوو. هەمیشە لای باوکم شکاتی لێ دەکرد. هەرچەند هەمیشە تووڕە و ناوچاوگرژ بوو، بەڵام هەرگیز لێی نەداوم و تەنانەت هەڕەشەشی لێ نەکردم. بەڵام چونکە سیدنیی خۆش نەدەویست، منیش لێی دەترسام و بە بینینی ترس دای دەگرتم. مەشرووبی زۆریشی دەخواردەوە و هەر ئەوەش وای لێ دەکردم زیاتر لێی بترسم. کاتێك مەست دەبوو، تووشی حاڵەتێك دەبوو کە خۆشی نەیدەزانی چی بکات و بەڕاستیی ئەوەش شتێکی ترسناك بوو. لە کاتێکدا کە لە کوڕە فریشتەئاساکەی خۆی دەیڕوانی و زەردەیەکی جوانی لەسەر لێو بوو، دەستی دەکرد بە جنێودان بەو منداڵە هەژارە و هەرچی بە دەمیدا دەهات پێی دەگوت. نازانم من بۆچی هیچ پێوەندییەکم لەگەڵ ئەو منداڵەدا نەبوو. هەرچەند زڕبرام بوو بەڵام بە بیرم نایەت تەنانەت یەك جاریش زمانم لە زامانی گەڕابێ. دیارە من چوار ساڵ لەو گەورەتر بووم. هەندێ جار کە لویز مەشرووبی دەخواردەوە، دادەنیشت و مۆن دەبوو و من لە هەموو ئەو چرکەساتانەدا لەناو ترس و وەحشەتدا دەژیام. بەڵام سیدنی بە هیچ شێوەیەك ئاوڕی لێ نەدەدایەوە. زۆربەی جاران شەو درەنگانێك دەهاتەوە ماڵەوە. بەڵام من ناچار بووم یەکڕاست لە خوێندنگەوە بگەڕێـمەوە بۆ ماڵ و هەندێك شتومەك بۆ ماڵەوە بکڕم و وردەکارەکانی ماڵەوە بکەم.

لویز ئێمەی بۆ خوێندنگەی شەقامی کنینگتۆن دەنارد و هەر ئەوەش تۆزێك رۆحییەی منی دەگۆڕی، چونکە بەبوونی منداڵانی تر، کەمتر هەستم بە تەنیایی دەکرد. رۆژانی شەمە تەنیا سەر لە



بەیانییان وانەمان هەبوو و ئەوەشم پێخۆش نەبوو، چونکە پشووی دوانیوەڕۆ، بە مانای ئەوە بوو کە دەبێ بگەڕێـمەوە بۆ ماڵەوە و ژوورەکان پاك و خاوێن بکەمەوە و «هەوەڕ»ەکان بشۆم" جگە لەوەش لویز لەو رۆژەدا مەشرووبی دەخواردەوە. لەو کاتەدا کە من هەوەڕەکانم دەشۆرد، ئەو لە هۆڵەکەدا لەگەڵ یەکێك لە هاوڕێکانیدا دادەنیشت و مەشرووبی دەخواردەوە و بێ تاقەت دەبوو و بە راشکاوانە گلەیی لەوە دەکرد کە ناچارە من و سیدنی رابگرێت و بەخێومان بکات و ئەوەشی بە زوڵمێك لە قەڵەم دەدا. لەبیرمە رۆژێکیان لە زاری خۆیەوە بیستم کە دەیگوت: هەرچۆنێك بێت ئەمەیانم پێ تەحەمول دەکرێت، بەڵام ئەویتریان چڵکنێکی تەواوە و دەبێ بنێردرێت بۆ «دارالتادیب». جیا لەوەش ئەوەیان هەر کوڕی چارلی نییە. ئەو جۆرە سووك و بێ حورمەت روانینە لە سیدنی، تووشی ترس و دڵەڕاوکێی دەکردم و بە دەموچاوێکی خەماوییەوە دەڕۆشتم و لەسەر قەرەوێڵەکەم رادەکشام، بەبێ ئەوەی خەوم لێ بکەوێت. هێشتا تەمەنم نەبووبوو بە ٨ ساڵ، بەڵام ئەو رۆژانە، درێژترین و خەماویترین رۆژانی ژیانم بوون.

هەندێـجار رۆژانی یەکشەممە، کاتێك هەستم دەکرد کە بە هۆی ماندووبوونی زۆرەوە، تەواو هیلاك بوومە و هێزم تیا نەماوە، گوێم بۆ دەنگی مۆسیقایەکی سەرنـجڕاکێش رادەگرت کە بە «ئاکاردیۆن»ێك دەیانژەند و لە پەنـجەرەی ژووره چۆڵەکەوە دەنگی دەهات. مۆسیقاکە ئاوازی مارشێکی ئسکاتلەندیی بوو کە تێکەڵ بوو لەگەڵ هات و هەرای لاوان و پێکەنینی دوودڕ فرۆشەکاندا . وام بیر دەکردەوە کە ئەو هەموو هێز و وزە و خۆشییانەی ژیان، خۆیان لە ئاست چەرمەسەریی و کوێرەوەرییەکانی مندا گێل کردووە و لەگەڵ ئەوەشدا کاتێك دەنگی مۆسیقاکە دوور دەبووەوە، خەفەتم دەخوارد کە بۆچی ئیتر دەنگی نابیستم. هەندێ جاریش کە فرۆشیارێکی گەڕۆك بە کۆڵانەکەدا تێ دەپەڕی، هاواری دەکرد. لەوانە یەکێك هەبوو کە هەموو رۆژێك کاتی ئێوارە(عەسر) دەیقیڕاند:«ڕۆلی بەریتانیا» و لە دوا پیتیدا دەنگی تووشی جۆرە کرەکرێك دەبوو، بەڵام لەڕاستییدا سەدەفی دەفرۆشت. مەشرووب فرۆشییەك کە ٣ دەرگا لەولاتری ماڵی ئێمەوە بوو، لەکاتی داخستنیدا دەنگی مشتەرییەکانیم دەبیست. کەسانێکی بەدمەست بوون کە نەڕەنەڕیان دەهات و گۆرانییەکیان دەوتەوە کە لەو سەردەمەدا زۆر باو بوو:

«بە یادی رۆژانی رابردوو با دوژمنایەتیی یەکتری نەکەین

بە یادی رۆژانی خۆشی رابردوو، لەبیرکە و ببوورە

ژیان کورتتر لەوەیە کە بە شەڕ و تێکهەڵچوون بېرێتەسەر

دڵەکانیش لەوە بەقیمەتترن بشکێنرێن

دەستی یەکتری بگرین و هاوڕێی یەکتری بین

بە یادی رۆژانی خۆشی رابردوو».

من هەرگیز حەزم نەکردووە کەسێکی هەستیار و دڵناسك بم، بەڵام وام هەست دەکرد ئەو گۆڕانییە، لەگەڵ ئەو حاڵەتە خەماوییەی من سازگار بوو و بۆ من وەکوو لایەلایی کردنێك وابوو کە رایدەژەنیم و خەو دەیبردمەوە.

کاتێك سیدنی درەنگانێك دەگەڕایەوە بۆ ماڵەوە-کارێك کە تەقریبەن هەمیشە دەیکرد- بەرلەوەی بنوێت، پەلامارێکی خواردەمەنییەکانی دەدا. ئەو کارەشی لویزی تووڕە دەکرد، وەك چوون جارێکیان کە مەشرووبی خواردبووەوە، هاتە ناو ژوورەکەی ئێمەوە و لێفەکەی لەسەر سیدنی لادا و ئەمری پێکرد کە لە ماڵ بچێتە دەرەوە. سیدنیش وەك بڵێی چاوەڕێی شتێکی وای کردبێت، خێرا دەستی بردە ژێری سەرینگاکەی و چەقۆیەکی تیژی دەرهێنا کە قوتووهەڵکەنێکیشی هەبوو و نووکەکەشی تازە تیژ کردبووەوە و بەرهورووی لویز گرتی و گوتی:

_ ئەگەر دەوێری وەرە پێشەوە! ئەوە دەکەم بە زگتدا !

لویز زۆر ترسا و پاشەکشەی کرد و قیڕاندی:

_ ئەی هاوار... ئەم کوڕە چڵکنە! ...دەیهەوێت بـمکوژێت!

سیدنی زۆر بە جیدیی و راشکاوانەوە گوتی:

_ بەڵێ راستە، دەتکوژم!

لویز گوتی: ڕاوەستە تا ئاغای چاپلین بێتەوە.

بەڵام ئاغای چاپلین بە دەگمەن دەهاتەوە بۆ ماڵ. لەبیرمە شەوێکی شەممە کە لویز و باوکم مەشروبیان خواربووەوە و نازانم بۆچی هەمووومان لەگەڵ ژنە خاوەن ماڵەکەمان لەناو هۆڵی ماڵەکەیاندا لە نهۆمی یەکەمدا دانیشتبووین، باوکم لەژێر رووناکیی چراگازییەکەدا، دەموچاوێکی بێ رەنگ و ترسناکی بەخۆوە گرتبوو و چونکە بێ تاقەتیش بوو بەردەوام بۆڵەبۆڵی دەکرد، کتوپڕ دەستی لە گیرفانی کرد و مشتێك وردەپارەی دەرهێنا و بەسەر زەویدا پەخش و بڵاوی کردنەوە. وردەپارەی زو و زێڕ لە هەموو لایەکەوە خل دەبوونەوە. کاریگەرییەکی زۆری لەسەر هەموومان دانا. هیچ کەس تاقە



جووڵەیەکیشی نەکرد. خانـمی خاوەن ماڵ لەسەر جێی خۆی مایەوە و نێوچاوانی گرژ کرد. بەڵام من سەرنـجی چاوە تەماعکارەکەیم دەدەا کە بە دوای لیرەیەکی زێڕدا بوو. لەو کاتەدا کە هەمووان گێژ و وێژ بووبوون، بیرم لەوە کردەوە کە وا باشترە دەست بکەم بە کۆکردنەوەی وردەپارەکان. ژنە خاوەن ماڵ و ئەوانیتریش لاسایی منیان کردەوە و بە تایبەتیش هەوڵیان دەدا کە بەدوور لە نیگا تووڕەکانی باوکمدا ئەو کارە بکەن.

ڕۆژێکیان پاش نیوەڕۆیەکی شەممە کە لە خوێندنگەوە بەرەو ماڵ دەگەڕامەوە، کەسم لە ماڵدا نەبینی. سیدنی وەکوو جاران چووبوو بۆ یاری تۆپێن و تا ئێوارەش سەرقاڵ دەبوو. ژنە خاوەن ماڵ پێی وتم کە لویز و منداڵەکەی هەر لە سەرلەبەیانییەوە چوونەتە دەرەوە و هێشتا نەگەڕاونەتەوە. منیش بەو هەواڵە زۆر خۆشحاڵ بووم و هەستم بە ئاسوودەییەکی زۆر کرد، چونکە ئەوە بەو مانایە بوو کە ئیتر پێویست ناکات بەرەپێی ژوورەکان پاك بکەمەوە و چەقۆکانیش بشۆمەوە. کاتی نانـخواردن بەسەر چووبوو و من چەند کاتژمێری تریش چاوەڕێم کرد و کەم کەم خەریك بوو نیگەران دەبووم. رەنگە منیان بەجێ هێشتبێت. تا بەرەو ئێوارە دەچوو، بیرکردنی لویز و ئەوانی تر زیاتر ئازاری دەدام. داخۆ چی قەومابوو؟ ژوورەکە کەشوهەوایەکی زۆر ناخۆشی هەبوو و ئازاری دەدام و چۆڵییەکەی دەیترساندم. پاشان هەستم کرد وردە وردە خەریکە برسیم دەبێت. چاوێکم لە دۆڵابەی خواردنەکان کرد، هیچم تیا نەدۆزییەوە. لەبەر ئەوەی کە لەوە زیاتر نەمدەتوانی تەحەمولی ئەو چۆڵ و هۆڵییە بکەم و هەروەها خەم و خەفەتێکی زۆریش دایگرتبووم، لە ماڵ چوومە دەرەوە و ئەو دوانیوەڕۆیە خۆم بە تەماشاکردنی بازاڕەکانی ئەو دەور و بەرەوە سەرگەرم کرد. لەناو شەقامی«لامبێس ڤۆك» و «کات»دا پیاسەم کرد. بە تاسەیەکی زۆرەوە تەماشای جامـخـانەی دووکانەکانم دەکرد و بە حەسرەتەوە تەماشای هەڵمی گۆشتە برژاوەکان و کەبابە خۆش تامەکانی بەراز و پەتاتە سوورەوەکراوەکانم دەکرد. چەندین کاتژمێر تەماشای ئەو کاسبکارە گەڕۆکانەم دەکرد کە شەربەت و جۆرەکانی خواردنەوەیان دەفرۆشت. ئەو سەرگەرمییە، تۆزێك ئارامیی و سووکنایی پێ بەخشیم و بۆ چەند ساتێك ئەو برسێتییەم لەبیر کرد کە تەنگی پێ هەڵچنیبووم.

کاتێك گەڕامەوە بۆ ماڵ، شەو داهاتبوو. لە دەرگام دا بەڵام کەس وەڵامی نەدامەوە. هەموویان چووبوونە دەرەوە. زۆر هیلاك و ماندوو بووم و لەگەڵ ئەوەشدا تا چوارڕێیانی کنینگتۆن رۆشتم و لە شوێنێکی نزیك لە ماڵەکەماندا دانیشتم تا ببینم ئاخۆ کەسێك لە ئەندامانی بنەماڵەکەمان

دەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە؟تەواو ماندوو بووبووم و پرسیارم لە خۆم دەکرد بڵێی سیدنی بۆ کوێ چووبێت؟ نیوەشەو دادەهات و لە چوارڕێیانی کنینگتۆندا جگە لە یەك دوو کەسی ڕێبوار کە درەنگانێك بەرەو ماڵ دەچوونەوە، کەسی تر نەدەبینرا. چرای هەموو دووکانەکان یەك لە دوای یەك دەکوژرانەوە، جگە لە چرای دەرمانـخانە و مەشرووب فرۆشەکان نەبێت“ منیش زۆر هەستم بە بێ دەرەتانی و دەستەوەستانی دەکرد.

لەپڕێکدا دەنگی مۆسیقایەکم بیست. چەند خۆش و دڵڕفێن بوو! دەنگەکە لە مەیـخانەی کەڵی سپییەوە دەهات و بە شێوەیەکی جوان و سەرنـجڕاکێش، لەو چوارڕێ چۆڵەدا دەنگی دەدایەوە. ئاوازی«پیچەك » و «مێش هەنگوین»بوو کە بە ئەرغەنوون و کلارێنت و بەوپەڕی وەستایی و لێهاتووییەوە دەیانژەند. من تا ئەو کاتە هەرگیز ئەوەندە لە هیچ ئاوازێك ورد نەبووبوومەوە، بەڵام ئەو ئاوازە هێندە جوان و شاعیرانە و ئەوەندە شاد و گەرم و سووکنابیدەر بوو کە من هەموو ڕەنج و ئازارەکانم لەبیر کرد و لە شەقامەکە پەڕیـمەوە تا بڕۆم بۆ لای ژەنیارەکان. ژەنیاری ئەرغەنوونەکە کەسێکی کوێر بوو و لە جیاتی چاو، دوو قڵیشی بەتاڵ لە کاسەچاویدا بوو. پیاوێك کە کلارێنتی دەژەند، سەروسیمایەکی ناشیرین و دەبەنگانەی هەبوو.

ژەندنەکەیان هەر زوو کۆتایی هات و ڕۆشتنیان خەم و خەفەتی شەوی زیاتر کرد. ماندوو و شەکەت و بێ هێز، لە گۆڕەپانەکەوە پەڕیـمەوە تا بگەڕێـمەوە بۆ ماڵ و ئیتر بیرم لەوە نەدەکردەوە کە ئاخۆ کەسێك لە ماڵدا هەیە یان نا. تەنیا شتێك کە دەمویست ئەوە بوو کە بڕۆم بنووم. پاشان بە زەحمەت تارماییەکم دەبینی کە بە باخەکەدا تێدەپەڕێ و دەچێتە ماڵەوە. لویز بوو کە کوڕە بچووکەکەشی لەبەردەمیدا بوو. کە لویزم بینی زۆر بە زەحمەت و لارەلار دەڕوات، پێم ناخۆش بوو. سەرەتا وام زانی قاچی لە ڕووداوێکدا بریندار بووە، بەڵام دواتر زانیم کە شەش دانگ مەست بووە. تا ئەو کاتە نەمبینیبوو کە مەستەکان بە لارەلار بڕۆن بە ڕێدا. بەو حاڵەی لویزەوە بە باشم نەزانی خۆمی نیشان بدەم و سەبرم کرد تا ئەو بچێتە ناو ماڵەوە. تۆزێك دواتر ژنەی خاوەن ماڵیش هات و لەگەڵ ئەودا چوومە ماڵەوە. لەو کاتەدا کە بە نووکەپێ لە پلیکانە تاریکەکەدا دەچوومە سەرێ و خواخوام بوو کەس نەمبینێت تا بگەمە ژوورەکەم و بنووم، لویز کە ڕەتڵی دەبردەوە، لە پێ پلیکانەی قادرمەکەدا دەرکەوت و قیژاندی بەسەرمدا:

_ لێرەدا چ غەڵەتێك دەکەیت؟ ئێرە ماڵی تۆ نییە!



منیش لاڵ بووم ﴿و لەزمان کەوتم﴾. دیسان گوتی:

_ تۆ لە ئەمشەوەوە نابێ لێرە بنوویت. ئیتر بە دەست ئەم دوانەتانەوە وەڕەز بوومە! دەی خێرا ون بە لەبەر چاوم! تۆ و براکەت هەردووکتان ون بن! با باوکتان بەخێوتان بکات!

بە بێ ئەوەی کە هیچ بپاڕێـمەوە، بەرەو دوا گەڕامەوە و لە پلیکانەکان هاتـمە خوارەوە و لە ماڵ چوومە دەرەوە. ئیتر ماندوو نەبووم. ئارام بووبوومەوە. بیستبووم کە باوکم مشتەریی مەیـخانەی«پرێنس»ە کە نزیکەی کیلۆمترێك لە ماڵەکەمانەوە دوور بوو و منیش بەو ئومێدەی کە لەوێدا بیدۆزمەوە، بەرەو ئەو مەیـخانەیە کەوتـمە ڕێ. بەڵام زۆری نەخایاند کە تارماییەکەیم بینی. لە من نزیك بووەوە و باڵای لەناو ڕووناکیی چراکاندا بە تەواوەتیی دیار بوو.

بەدەم گریانەوە وتم:

_ ڕێگەم نادات بچمە ماڵەوە، وابزانم مەشرووبی زۆری خواردۆتەوە.

هەردووکمان بەرەو ماڵ کەوتینە ڕێ و چاوم لێ بوو ئەویش ڕەتڵی دەبردەوە. گوتی خۆشم مەشرووبم زۆر خواردۆتەوە. هەوڵم دا دڵنیای بکەمەوە کە وانییە“ بەڵام ئەو وەك بڵێی خۆی لۆمە بکات لە ژێر لێوەوە دەیوت:

_ با ...با... ! منیش مەستم! .

دەرگای ژووری دانیشتنەکەی کردەوە و بە دەموچاوێکی بێدەنگ و تووڕەئاساوە لەبەردەم لویزدا دەرکەوت و چاوی بڕییە چاوانی. لویز بەسەر پێوە وەستابوو و پاڵی بە سۆبەکەوە دابوو و لەسەر قاچەکانی دیلانێی دەکرد.

باوکم گۆڕا و گوتی:

_ بۆچی نەتهێشتووە ئەم منداڵە بێتە ناو ماڵەوە؟.

ئەویش بە سەرسووڕمانەوە لە باوکم ڕوانی و لە ژێر لێوەوە گوتی:

تۆیش دەتوانی بڕۆیت و ئەم هاشوهووشانە لە شوێنێکیتردا بکەیت...دەی خێرا کەن، هەمووتان ون بن لەبەر چاوم !

باوکم فلچەیەکی گەورەی کە لەسەر دۆڵابەکەدا بوو هەڵگرت و بە هەموو هێزییەوە بەرەو لویز هاوێشتی. دەسکەی چێوینی فلچەکە دای لە گۆنای لویز. چاوەکانی داخران و بە ئەسپایی کەوتە سەر زەویی. وابزانم ئەو بێدەنگبوونەی پێ خۆش بووبێت.

ئەو کارەی باوکم زۆر قەڵسی کردم و ئیدی ئەو تۆزە ڕێزەشی کە لە لام هەیبوو، بە تەواوەتیی سڕایەوە. سەبارەت بەوەی کە دواتر چی قەوما، شتی ئەوتۆم بە بیردا نایەتەوە. وابزانم سیدنی بڕێك درەنگتر هاتەوە بۆ ماڵەوە. باوکم هەردووکمانی لەژوورەکەماندا خەواند و بەجێی هێشتین. دواتر زانیم کە باوکم و لویز بەیانیی ئەو ڕۆژە شەڕێکی قورسیان کردبوو، چونکە باوکم بە جێی هێشتبوو و تەواوی ئەو ڕۆژەی لەگەڵ «ئسپێنسێر»ی برایدا ڕایبواردبوو کە چەندین مەیـخانەی لە شەقامی لامبێسدا هەبوو.

لویز لەبەر ئەو وەزعەی هەیبوو زۆر ناڕەحەت بوو و حەزی نەدەکرد لەگەڵ بنەماڵەی ئسپێنسێر چاپڵیندا هاتوچۆی هەبێت“ بۆیە باوکم بە تەنیا دەچوو بۆ ئەوێ و لویزیش بۆ ئەوەی کە تۆڵەی بکاتەوە لە شوێنێکیتردا ڕایدەبوارد.

لویز باوکمی خۆش دەویست و من هەرچەند زۆر منداڵ بووم، بەڵام ئەو مەسەلەیەشم لەو شەوەدا و لە نیگای ﴿لویز﴾دا بۆ دەرکەوت کە لەبەردەم سۆبەکەدا گێژ و وێژ بووبوو و زۆری پێ ناخۆش بوو کە باوکم بەجێی هێشتبوو. دڵنیام کە باوکیشم ئەوی خۆش دەویست و دیارە هەندێ شتم بینیبوو. باوکم هەمیشە باش دەیزانی کە چۆن میهرەبانی بنوێنێت و پێش چوونی بۆ شانۆ، لویز ماچ بکات و شەوباشی پێ بڵێت. بەیانیانی یەکشەممەش کە مەشرووبی نەدەخواردەوە، نانی بەیانیی لەگەڵ ئێمەدا دەخوارد و شانۆگەرییە سەرنـجڕاکێشەکانی هونەرمەندە هاوڕێکانی خۆی، بۆ لویز دەگێڕایەوە و ئێمەش پڕبەدڵ گوێـمان لێ دەگرت. باوکم لەبەر چاومدا وەکوو هەڵۆیەکی ڕاوچی وابوو و من هەموو جووڵەکانیم لە مێشکمدا هەڵدەگرت. ڕۆژێکیان کە زۆر بە کەیف و خۆشحاڵ بوو، خاولییەکی پێچابوو بە دەوری سەریدا و بەدەوری مێزەکەدا بەدوای کوڕە بچووکەکەیدا ڕای کرد و بەردەوام دەیگوت:«من پاشای عوسمانییم»! .

نزیك کاتژمێری ٨ ی شەو، بەر لەوەی بڕوات بۆ شانۆ، شەش هێلکەی دەکردە شەرابەکەیەوە و دەیـخواردەوە و بە دەگمەن خواردنی ڕەقی دەخوارد . شەوانیش بە دەگمەن دەهاتەوە بۆ ماڵ و ئەگەریش دەهات، بۆ ئەوە بوو بڕێك ڕابکشێت و مەستییەکەی بپەڕێت.

ڕۆژێکیان چەند کەس لە لایەن «ئەنـجومەنی منداڵ پارێزیی»یەوە هاتن بۆ لای لویز و قسەیان لەگەڵ کرد و ئەوەش زۆر تووڕەی کرد. هاتنی ئەو کەسانە بۆ ئەو مەبەستە بوو کە پۆلیسی ناوچە وتبووی من و سیدنییان کاتژمێر ٣ی نیوەشەو لە نزیك وێستگەیەکی ئاگرکوژانەوە و لە خەودا



دۆزیوەتەوە. ئەو شەوەش شەوێك بوو کە لویز دەرگای بەڕووی من و سیدنیدا داخستبوو و ڕێگەی نەدابووین بچینە ماڵەوە و پۆلیس ناچاری کردبوو کە دەرگاکە بکاتەوە و ڕێگەمان بدات بچینە ماڵەوە. بەڵام ماوەیەك دواتر واتە لەو کاتانەدا کە باوکم لە شارێکیتر کاری دەکرد، نامەیەك بە لویز گەییشت کە تیایدا نووسرابوو دایکم لە هەژارخانەوە هاتۆتە دەرەوە و ئەو هەواڵەشی پێ ڕاگەیاندین کە ژنێك لە خوارەوەیە و دەیەوێت سیدنی و چارڵی ببینێت.

لویز گوتی:

_ دایکتان هاتووە.

چەند چرکەیەك مات و بێدەنگ بووین، پاشان سیدنی لە پلیکانەکانەوە هاتە خوارەوە تاکو خۆی بـخاتە ئامێزی دایکمەوە و منیش بەدوایدا چووم. هەردووکمان دیسانەوە ئەو دایکە میهرەبان و دەم بە پێکەنینەمان دۆزییەوە و ئەویش بەوپەڕی سۆز و خۆشەویستییەوە لە باوەشی گرتینەوە.

لویز و دایکم چاوی بینینی یەکتریان نەبوو، بۆیە لە هەموو ئەو ماوەیەدا کە من و سیدنی کەلوپەلەکانـمان کۆ دەکردەوە، لە دەرەوە وەستابوو. هەردوو لامان هیچ ڕق و کینەیەکمان بەرانبەر یەکتریی نیشان نەدا“ ئەوەی ڕاستیی بێت لویز زۆریش میهرەبانیی نواند، تەنانەت بۆ سیدنیش لە کاتی ماڵاوایی کردندا.

***

دایکم لە یەکێك لە کۆڵانە باریکەکانی پشت چوارڕێیانی کنینگتۆندا لە نزیك کارگەی کۆنسێرڤ سازیی«هایوارد»دا کە هاروێ سوێرە و خەردەلی بەرهەم دێنا و هەموو ڕۆژێك بۆنی تێژی سرکە ئەو ناوەی دەگرتەوە، ژوورێکی بە کرێ گرتبوو. کرێی ژوورەکە کەم بوو و ئێمەش دیسان پێکەوە لە شوێنێکدا کۆ بووبووینەوە. تەندروستیی دایکم زۆر باش بوو، هئەوەمدە ناش بوو قەت پێمان وانەبوو دیسان نەخۆش بکەوێتەوە.

سەبارەت بە جۆری گوزەرانی ئەو ماوەیەمان هیچ شتێکم نایەتەوە بیر و نازانم ئاخۆ لەو ماوەیەدا کێشە و گرفتی زۆرمان هەبووە یان چ کارەساتگەلێکمان بەسەردا هاتووە. حەفتەیەك ١٠ شلینگ لە لایەن باوکمەوە بە ڕێکوپێکی دەدرا بە دایکم. دیارە دایکیشم کاری دوورمانی دەست پێکردبووەوە و پێوەندیشی لەگەڵ کڵێسەدا تازە کردبووەوە.

بەڵام بیرەوەرییەکم لەو رۆژانە لە بیر ماوە کە بەسەر من هات. لەکۆتایی کۆڵانەکەماندا کوشتارگایەك هەبوو و ئەو مەڕانەش کە دەیانبردن بۆ ئەوێ، لەبەردەم ماڵی ئێمەدا تێپەڕ دەبوون. لەبیرمە رۆژێکیان یەکێك لە مەڕەکان هەڵات و لە کۆڵانەکەدا رای کرد و منداڵە خوێرییەکانیش کە ئەو وەزعەیان پێ خۆش بوو، کەوتنە شوێنی. هەندێکیان هەوڵیان دا بیگرن و هەندێکیان دایان لە زەویی و منیش کاتێك هەڵبەز و دابەزی شیتانەی ئەو گیاندارە داماوەم بینی کە بەو جۆرە بادەبارێنێ، دیـمەنێکی ئەوەندە سەیر بوو دام لە قاقای پێکەنین. بەڵام کاتێك دواجار ئەو گیاندارە داماوەیان گرت و بردیان بەرەو کوشتارگا، راستیی ئەو دیـمەنە خەماوییە کە سەرەتا پێکەنینم پێی دەهات، تووشی خەم و خەفەتێکی زۆری کردم و چووم بۆ ژوورەکەم و دەستم کرد بە گریان و روو لەدایکم قیڕاندم:«دەیکوژن! دەیکوژن! ». لەو رۆژە بە دواوە، رۆژانێکی زۆر، دوای رووداوی ئەو پاشنیوەڕۆ بەهارییە و ئەو بەدواداچوونە پێکەنیناوییە، بیرم لێ کردەوە و ئێستا ئەو پرسیارە لە خۆم دەکەم ئاخۆ بلێیی ئەو رووداوە، توخمی سەرەکیی فیلمەکانی داهاتووی منی تێدا بێت:واتە تێکەڵەیەك لە تراژێدیی و کۆمیدیی، یان خەم و شادیی؟

دواتر خوێندنگە چەندین ئاسۆی تازەی لەبەردەممدا کردەوە، ئەویش مێژوو و شێعر و زانست بوو. وانەکانی تر، بە تایبەت ژمێریاری هەر زۆر بێتام و ناخۆش بوو. «زیاد و کەمکردن» منی دەخستە یادی ئەو کارمەندەی کە لە پشت سندووقدا دانیشتبوو کە بەڕای من کاری سەرەکیی ئەوە بوو کاتێك باقیی پارەی مشتەرییەکیانی دەدایەوە، نەهێڵێت فێڵی لێ بکرێ.

مێژوو هیچ شتێك نەبوو جگە لە ملهوڕی و دەستدرێژی و کاولکاری و کوشتنی بەردەوامی پاشاکان" و پاشاکانیش دەستووری کوشتنی ژنان و براکان و برازاکانی خۆیان دابوو. جوغرافیا لە نەخشەیەك زیاتر هیچیتر نەبوو. شێعریش جگە لە تەمرینی مێشك و یادەوەری هیچیتر نەبوو. فێرکاری، مێشکی لە شتگەلێك پڕ دەکردم کە بە لای منەوە زۆر سەرنـجڕاکێش نەبوون.

ئەگەر کەسێك تۆزێك زەحمەتی خۆی بدایە و بۆ هەر وانەیەك پێشەکییەکی بزوێنەری بـخوێندایەتەوە کە بیتوانیایە فکری منیش ببزوێنێت، یان لەبری روونکردنەوەی رووداوەکان، هێزی خەیاڵی منی پەروەردە بکردایە" یان بە رەقەمەکان و وەرەقەکانی یاریکردن، هەندێ فروفێڵی بکردایە کە منی سەرگەرم بکردایە و بیبزواندایەم" یان ئەگەر لەبارەی مێژووەوە بیروڕایەکی رەسەن و دروستیان پێ بدایەم" یان ئەگەر فێری مۆسیقای شێعریان کردبام، رەنگە ببوومایە پیاوێکی بیرمەند.



لەو کاتەوەکە دایکم گەڕابووەوە لامان، دەستی کردبووەوە بە هاندانی من بۆدرێژەدان بە کاری شانۆ و دڵنیاشی کردمەوە کە بەهرەی ئەو کارەم هەیە. بەڵام چەند حەفتە پێش«نۆئێل»بوو کە لە خوێندنگەدا شانۆنامەی«سێندرێلا» نـمایش کرا و لەو کاتەدا من ئەو نیازەم لە خۆمدا هەست پێ کرد کە هەرچییەکی دایکم فێری کردووم، دەبێ دەری بـخەم. نازانم بۆچی هیچ دەورێکیان بۆ من دەسنیشان نەکردبوو، هەربۆیە لەناو دڵمدا زۆر تووڕە بووم و ئێرەییم دەبرد و لەو باوەڕەدا بووم کە لە هەموو ئەوانەی لەو شانۆیەدا دەورێکیان پێ درابوو، بە تواناتر بووم. رەخنەم لە نـمایشکردنی خەمۆك و بێڕۆحی کوڕەکان گرت و﴿گاڵتەم پێ دەکردن﴾. خۆشکە ناڕەسەنەکانی سێندرێلا، نە زەوق و شەوقێکیان تێدا بوو و نە رۆحی کۆمیدییان نیشان دەدا. وەڵامدانەوەکانیان بە شێوەیەك بوو کە بۆنی خوێندنگەیان لێ دەهات و هەندێ بەشی دیالۆگەکانیان بە شێوەیەکی بێزارکەر لەناو کەپۆدا دەردەبڕی. ئەگەر من رۆڵی یەکێك لەو خۆشکە دڵڕەقانەم بگێڕایە، بە یارمەتیی ئەو وانانەی دایکم فێری کردبووم، حەشرم دەکرد! . ئاخ... چەند حەزم دەکرد ئەو دەورەیان بە من دابایە. بەڵام هەر چۆنێك بێت دڵم چووبووە سەر ئەو کچەی دەوری سێندرێلای دەبینی. کچێکی جوان و دەلال و خوێن شیرین بوو و تەمەنی ١٤ ساڵ دەبوو و من لە قووڵایی دڵمدا عاشقی بووم. بەڵام ئەو پارووەیەکی گەورەتر لە دەمی من بوو ، هەم لە رووی کۆمەڵایەتییەوە و هەم لەڕووی جیاوازیی تەمەنـمانەوە.

کاتێك بۆ بینینی ئەو نـمایشە حازر بووم، بە شتێکی ناشیرین و ناڕێکوپێك هاتە بەر چاوم، بێجگە لە جوانیی سوپەرستاری شانۆگەرییەکە کە تۆزێك غەمگینی کردم. بەڵام کاتێك ٢ مانگ دواتر لە پۆلەکاندا دەیانگەڕاندم تاکو شێعری«پشیلەی خانـمی پریسیلا»بـخوێنمەوە، گومانم لە سەرکەوتنی خۆمدا نەبوو. ئەو شێعرە وتاردانێك بوو کە دایکم لە کتێبخانەیەکدا بینیبووی و ئەوەندە سەرنـجڕاکێش و بەتام هاتبووە بەرچاوی کە هەر لە پشت جامـخانەکەوە یاداشتی کردبوو تا بیهێنێت بۆ من. من لە یەکێك لە کاتەکانی پشوودا بۆ یەکێك لە هاوڕێکانم خوێندمەوە. مامۆستاکەمان ئاغای«راید»، دەستی لە کارەکەی کێشایەوە و ئەوەندەی پێ خۆش بوو کە کاتێك قوتابییەکان لەسەر جێگاکانیان دانیشتن، داوای لێکردم لەناو پۆلدا بیخوێنمەوە. گەردەلوولێك لە پێکەنینم لە پۆلەکەدا بەرپا کرد. دوای ئەوە ناوبانگی من لە خوێندنگەدا دەنگی دایەوە و رۆژی دواتری، پۆل بە پۆل بەناو کوڕ و کچەکاندا دەیانگێڕام تا شێعری پشیلەیان بۆ بـخوێنمەوە.

پێشتر جارێك له ٥ ساڵیدا له جیاتی دایکم لەبەردەم جەماوەردا ئامادە بووبووم" بەڵام بە کردەوە ئەوە یەکەم جارم بوو کە بە تەواوەتی تامی غروور و شانازییم دەچەشت. ﴿لەوە بە دواوە﴾خوێندنگە گۆڕا بە شوێنێکی خۆش و دڵڕفێن. بەڵام کاتێك چووم پەیوەندی بە گرووپێکی سەماکاری ئستێپ بە ناوی«هەشت مێرمنداڵەکەی لانکشایر»ەوە بکەم، دەبوایە واز لەخوێندن بهێنم.



٣

## سەرەتاکانی کاری من لەسەر شانۆ

باوکم بەڕێوەبەری گرووپەکە واتە ئاغای «جەکسۆن»ی دەناسی و دایکمی لەوە دڵنیا کردەوە کە چوونەسەرشانۆی من، سەرەتایەکی باش دەبێت بۆ پێشکەوتن لەو کارەدا و لەگەڵ ئەوەشدا بەو بڕە پارەیەی کە وەریدەگرم دەتوانم یارمەتیدەری بم. خواردن و خانوویان پێ دەدام و حەفتەیەك نیو لیرەیان دەدا بە دایکم لە جیاتی حەقدەست. دایکم سەرەتا متمانەی بەو مەسەلەیە نەدەکرد، تا ڕۆژێکیان لەگەڵ ئاغای جەکسۆن و بنەماڵەکەیدا چاویان بە یەکتری کەوت.

ئاغای جەکسۆن تەمەنی ٥٥ ساڵ بوو. پێشتر لە لانکشایر مامۆستا بوو و ٣ کوڕ و کچێکی هەبوو کە هەموویان ئەندامی گرووپی هەشت مێرمنداڵەکەی لانکشایر بوون. مەسیحیی کاتۆلیك بوو و دوای مەرگی ژنی یەکەمی ، پێش ئەوەی دوبارە ژن بهێنێتەوە، لەگەڵ منداڵەکانیدا راوێژی کردبوو. ژنی دوەمی بڕێك لە خۆی بەتەمەنتر بوو و خۆی بۆی دەگێڕاینەوە کە لە چ بارودۆخێکی«پیرۆز»دا لەگەڵ ئەو ژنەدا زەماوەندی کردووە. دەیوت داواکارییەکم بۆ پێکهێنانی ژیانی هاوبەش بۆ ڕۆژنامەیەك نارد و زیاتر لە ٣٠٠ نامەی پێ گەییشت. ناچار دەستم بە دۆعا کرد و لە خوا پاڕامەوە یارمەتیم بدات و بە پشت بەستن بە خوا ، تەنیا یەك نامەم کردەوە و ئەویش نامەی هەر ئەم خاتوو جەکسۆنە بوو کە ئێستا ژنی دووهەمە. ئەو خاتوونەش مامۆستا بوو و دیارە دۆعاکانیشم لەبەر قاپیی خوادا قبووڵ کرابوون، چونکە کاتۆلیکیش بوو.

سروشت لەگەڵ خاتوو جەکسۆندا میهری نەنواندبوو و دەموچاوێکی جوانی پێ نەدابوو، تەنانەت دەتوانم بڵێم کە دڵڕفێنیش نەبوو . وەك لەبیرم مابێتەوە، ژنێك بوو بە دەموچاوێکی بێ ڕەنگ و لەڕ و لاواز و پێستێکی چرچ و لۆچەوە. ڕەنگە لەبەر ئەوەش بووبێت کە بەو تەمەنە زیادەوە منداڵێکی بۆ ئاغای جەکسۆن خستبووەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا هاوسەرێکی فیداکار و بە وەفا و بە ویژدان بوو و هەرچەند لە مەمکی خۆی شیری بە منداڵەکەی دەدا، بەڵام لە بەڕێوەبردنی گرووپەکەدا یارمەتیدەرێکی باش بوو و زەحمەتی زۆری دەکێشا.

ئەو شتەی وا خانم﴿ی جەکسۆن﴾ لەبارەی چیرۆکە دڵدارییەکانی خۆی و ئاغای جەکسۆنەوە دەیگێڕایەوە، لەگەڵ ئەوەی ئاغای جەکسۆن تۆزێك جیاوازیی هەبوو. هەردووکیان نامە گۆڕینەوەیان کردبوو، بەڵام تا بەر لە رۆژی هاوسەرگیریی، یەکتریان نەدیبوو و لە یەکەم دیداریان کە لە هۆڵێکدا ببوو، لە کاتێکدا کە ئەندامانی بنەماڵە لە ژوورێکیتردا چاوەڕێی ئەنـجامەکەیان دەکرد، ئاغای جەکسۆن بە خانـمی وتبوو:«تۆ رێك ئەو کەسەیت کە من دەمەوێت» و خانـمیش هەر هەمان قسەی لەگەڵ ئاغادا کردبوو، و بە دەنگێکی تۆزێك کپەوە بە ئێمەی دەوت:«بەڵام چاوەڕێی ئەوەم نەدەکرد کە بەم زوانە ببمە دایکی هەشت منداڵ».

تەمەنی سێ منداڵیان لە دوانزەوە بۆ شانزە ساڵ دەبوو. کچەکەش تەمەنی نۆ ساڵان بوو و قژیشی وەك کوڕەکان بڕیبوو بۆ ئەوەی بتوانێت لە گرووپەکەدا بەشدار بێت.

هەموو رۆژانی یەکشەمە هەموویان بێجگە لە من، دەچوون بۆ کڵێسەی کاتۆلیك. من چونکە تەنیا کەسی پرۆتستانتی گرووپەکە بووم، هەستم بە تەنیایی دەکرد هەر بۆیە هەندێ جار منیش لەگەڵیاندا دەڕۆیشتم. ئەگەر لەبەر خاتری هەستیاریەتە ئایینییەکانی دایکم نەبوایە، لەوانە بوو منیش ببمە کاتۆلیك چونکە لەڕووی عیرفانییەوە ئەو ئایینەم زۆر بە دڵ بوو. وە مێحرابە هونەرییەکانی کڵێسە و پەیکەرە گەچییەکانی حەزرەتی مریەمم زۆر خۆش دەویست کە بە گوڵ و مۆمی داگیرساو رازابوونەوە و هەر جارێکی بەبەر دەمیاندا تێدەپەڕین، کڕنۆشیان بۆ دەکردن.

دوای شەش حەفتە فێرکاری، پێیان وابوو کەسێکی بەهرەدارم و دەتوانم لەگەڵیاندا بەشداری سەما بم. بەڵام لەوکاتەدا کە تەمەنم هەشت ساڵ بوو، ئەو باوەڕبەخۆبوونەی کە پێشتر هەمبوو لە دەستم دابوو و یەکەم جار کە بەرەوڕووی جەماوەر بوومەوە، تەواو پەشۆکاو و شڵەژا بووم بە جۆرێك کە بە زەحمەت دەمتوانی قاچەکانم بـجووڵێنم. چەندین حەفتەی خایاند تا توانیم وەکوو ئەوانی تر سەما بکەم. بە تایبەت حەزم نەدەکرد وەك سەماکارێکی ساکار بم لەناو گرووپێکی هەشت کەسیدا. نەك تەنیا بۆ ئەوەی کە پارەیەکی زیاترم دەست کەوێت، بەڵکوو بە پێی غەریزە وا هەستم دەکرد کە ئەگەر نواندنێکی تایبەتیی خۆمم هەبێت زیاتر لە سەماکردنێکی سادە دڵگەرمم دەکات. حەزم دەکرد«کۆمێدیەن» بوومایە، بەڵام پێویستم بە زیرەکی و لێهاتوویەکی زۆر هەبوو کە بتوانم بە



تەنیایی شانۆگەرییەکە بەڕێوە بەرم. لەگەڵ ئەوەشدا، یەکەم ئاواتم بۆ ئەوەی کە کارێکی تری جگە لە سەمایەکی سادە بکەم، منی بەرەو﴿دنیای﴾کۆمێدیی پاڵ پێوەدەنا. ئەوپەڕی ئامانـجم، نواندنی شانۆیەکی دوو کەسی بوو، دوو مێرمنداڵ کە جلی دوو منداڵی خوێڕیی پێکەنیناویی لەبەر بکەن. لەو بارەوە لەگەڵ یەکێك لە منداڵەکاندا قسەم کرد و بڕیارمان دا پێکەوە ببین بە شەریك. ئەو مەسەلەیە بوو بە بەشێك لە خەون و ئاواتەکانی هەردووکمان. بڕیارمان دا ناوی خۆمان بنێین«بریستۆل و چاپلین، خوێڕییە ملیۆنێرەکان». وەکوو لاتە بەڕەڵلاکان ردێنی«فائۆری» بێڵینەوە و ئەنگوستیلەی ئەڵماس لە پەنـجە بکەین. ئەمە هەموو ئەو لایەنانەی دەگرتەوە کە بەڕای ئێمە هەم پێکەنیناوی بوو هەمیش ئەنـجامەکەی باش دەبوو، بەڵام بە داخەوە ئەو ئاواتەمان هەرگیز نەهاتە دی.

خەڵك، هەشت مێرمنداڵەکەی لانکشایریان زۆر خۆش دەویست، چونکە بەو جۆرەی کە ئاغای جەکسۆن جەختی لەسەر دەکرد، ئێمە بە هیچ شێوەیەك لە منداڵە بلیمەتەکان نەدەچووین. بەوپەڕی غرووڕەوە پێی دادەگرتەوە کە ئێمە هەرگیز سووراو و سپیاو (ماکیاژ) ناکەین و رەنگی گۆناکانـمان تەواو سروشتییە، و ئەگەر یەکێك لە ئێمە، پێش چوونە سەر شانۆ، روخسارێکی گەشی نەبوایە، پێدەچوو پێمان دەڵێ نقورچ لە گۆناکانـمان بگرین، بەڵام لە لەندەندا پاش ئەوەی شەوانە لە دوو یان سێ کافتریادا کارمان دەکرد، هەندێ جار ئاغای جەکسۆنـمان لە بیر دەبردەوە و لەسەر شانۆدا تۆزێك هیلاك و ماندوو دەردەکەوتین و لە پڕێکدا لە بەشی پشتەوەی شانۆکەوە چاومان بە ئاغای جەکسۆن دەکەوت کە زەردەخەنەمان بۆ دەکات و دەموچاوی خۆی نیشانـمان دەدا. لەو کارەی ئەو، کە واتاکەیشمان دەزانی، دەسبەجێ هەژان دەیگرتین و بەبێ ئەوەی بەخۆمان بزانین شادی و پێکەنین دایدەگرتینەوە.

کاتێك بە شارەکانی تردا دەگەڕاین، دەچووینە هەر شارێك، لەو حەفتەیەی کە لەوێ دەبووین، رۆژان دەچووینە خوێندنگە و ئەوەش خۆی لە خۆیدا یارمەتییەك بوو بۆ تەواوترکردنی فێرکارییەکەم.

لە رۆژانی جەژنی نۆئێلدا ئێمەیان دادەمەزراند تا لە شانۆگەریی بێدەنگی سێندرێلادا لە هۆڵی نـمایشی«هیپۆدرۆم»ی لەندەندا دەوری سەگ و پشیلە ببینین. هیپۆدرۆمی لەندەن لەو سەردەمەدا، تەماشاخانەیەکی تازە بوو کە هەموو ئیمکاناتی کافتریا و سیرکی تێدا هەبوو. جوانکاریی و دیکۆری هەر زۆر جوان بوو و ئیمکاناتێکی سەرنـجڕاکێش و هەست بزوێنی هەبوو. بەرەپێی پیستی سەماکردن چاڵ بوو و دەکرا بە تەواوەتی پڕ بکرێت لە ئاو و هەر ئەوە وای دەکرد کە بتوانرێت سەمای باڵەی پڕ لە

هەژانی تێدا بکرێت. کچە جوانەکان بە ریز و یەك لەدوای یەك بە جلی تایبەت و بریقەدارەوە دەچوونە ناوەوە و وردە وردە بە تەواوەتی تیایدا نوقم دەبوون. کاتێك دوایین ریز دەچوە ناو ئاوەکەوە، «مارسلێن» قەشمەری فەرەنسی بە جلێکی ناشیرین و کڵاوێکی بەرز و درێژ و گۆچانێك کە قولاپێکی ماسیگرتنی پێوە بەستبوو، دەهاتە ناوەوە و لەسەر چوارپایەیەکی بچووك دادەنیشت" سندووقێکی گەورەی زێڕ و زیوی دەکردەوە و زنـجیرێك مرواریی لە جیاتی تەڵە، دەبەستە نووکی قولاپەکەوە و دەیـخستە ناو ئاوەوە. برێك دواتر گەوهەرێکی کەم بایەختری دەکردە تەڵە، بۆ نـموونە بازنەکانی دەهاویشت و ئەوەندە ئەو کارەی دووبارە دەکردەوە تا ناوەوەی سندووقەکە بەتاڵ دەبوو. لە پڕێکدا شتێك لە قولاپەکەی گیری دەکرد و ئەویش بە شێوەیەکی یەکجار پێکەنیناویی بە دەوری خۆیدا دەسووڕایەوە و بە گۆچانی ماسی گرتنەکەیەوە دەستی دەکرد بە فرتەفرت و هەڵبەز و دابەز کردن. دواجار سەگێکی بچکۆلەی فێرکراوی لە ئاوەکەوە دەهێنایە دەرەوە کە لاسایی هەموو جووڵەکانی مارسلێنی دەکردەوە. ئەگەر مارسلێن دادەنیشت ئەویش دادەنیشت" ئەگەر ئەو قاچی بکردایەتە ئاسمان سەگەکەش ئاوهای دەکرد.

نـمایشی مارسلێن جوان و پڕ لە شیرین کاریی بوو و زۆری پێ نەچوو کە ئەو قەشمەرە لە شاری لەندەندا ناوبانگی دەرکرد. لە سێکانسی چێشتخانەدا دەورێکی بچووك و پێکەنیناوییان پێ دام کە لەگەڵ ئەودا بیگێڕم. من بووبوومە پشیلە و مارسلێنیش کە لەبەرانبەر سەگێکدا پشتەپشتە دەهات، رێك لەو کاتەدا کە من خەریك بووم لە زەرفێکدا شیرم دەخواردەوە، کەوتە سەر پشتم. مارسلێن هەمیشە رەخنەی لە من دەگرت کە بۆچی وەك پێویست پشتم دانانەوێنم بۆ ئەوەی داکەوتنەکەی هێواشتر بێت ﴿تا کەمتر ئازاری پێ بگات﴾. من دەمامکی پشیلەم دابوو لە دەموچاوم، دەمامکێك کە برێك حاڵەتی سەرسووڕمانی نیشان دەدا و هەر یەکەم رۆژی نـمایشکردنەکە، کە تایبەت بوو بە منداڵان، من چوومە پشتی سەگێگ و مشەمشەم کرد و بۆنی قنگیم کرد. کاتێك جەماوەر لەو کارەی من دایانە قاقای پێکەنین، وەرسووڕامەوە و بە حاڵەتێکی سەرسووڕمانەوە چاوم لێ کردن و ئەو بەنەم(پەت) راکێشا کە چاوی دەترووکاندم. پاش ئەوەی کە چەندین جار ئەو کارەم ئەنـجام دا، بەرێوەبەری هۆڵەکەم بینی کە لە بەشی لۆژەوە بە پەلە خۆی گەیاندە لای پشتی سەکۆی شانۆ و بە چەند ئاماژەیەکی بچووك، تێی گەیاندم کە دەبێ واز لەو کارە بهێنم، بەڵام من بەردەوام هەر درێژەم دەدا. پاش ئەوەی کە بۆنی سەگەکەم کرد، بۆنی نەردەکەشم کرد و پاشان قاچێکم بەرز کردەوە.



جەماوەر کتوپڕ دای لە قاقای پێکەنین و بێگومان لەبەر ئەوە بوو کە ئەو کارە کاری پشیلە نەبوو. دواجار بەرێوەبەر توانیی سەرنـجم بۆ لای خۆی رابکێشێت و منیش بە هەڵبەزودابەز و لەگەڵ چەپڵەلێدانی جەماوەرەکەدا شانۆکەم بە جێ هێشت.

بەرێوەبەر کە بە تەواوەتی هەناسەی سوار بووبوو گوتی:

_ ئیتر هەرگیز ئەو کارە دووبارە نەکەیتەوە ها..! ئەگینا ئاغای لۆرد چەمبلان (واتە بەرێوەبەری ئیدارەی نـمایشەکان) دەرگای شانۆکە دادەخات.

درامای سێندرێلا سەرکەوتنێکی یەکجار زۆری بەدەست هێنا و هەرچەند مارسلێن دەورێکی ئەوتۆی لە هەژانی خەڵکدا نەبوو، بەڵام هۆکاری سەرەکیی سەرخافڵاندنیان کردنیان بوو. چەندین ساڵ دواتر، مارسلێن چوو بۆ شانۆی هیپۆدرۆمی نیویۆرك و لەوێشدا حەشری کرد، بەڵام کاتێك هیپۆدرۆم، بەشی شانۆی سیرکی لە رێکخراوی شانۆی خۆیدا سڕییەوە، ئەوەندەی نەخایاند کە مارسلێنیش لە یادەوەرییەکاندا سڕایەوە.

نزیکەی ساڵی ١٩١٨ بوو کە سێرکی سێ پەردەیی «برایانی رینگلینگ» هاتە لۆس ئانـجلێس و مارسلێنیش ئەندامی گرووپەکە بوو. چاوەڕێم دەکرد ناوی لەریزی سوپەرستارەکانی نـمایشەکەدا ببینم بەڵام بەڕاستیی تووشی سەرسووڕمان بووم کاتێك بینیم ئەویش لە ریزی ئەو چەند قەشمەرەدایە کە بە دەوری شانۆ گەورەکەدا دەسووڕێنەوە. مەخابن، هونەرمەندێکی مەزن لەناو گەندەڵیی رەشۆکیانەی سێرکێکی سێ پەردەییدا ون بووبوو.

دوای تەواوبوونی نـمایش چووم بۆ ئەو شوێنەی کە لێی دانیشتبوو" خۆمم پێ ناساند و هێنامەوە بیری کە لە شانۆی هیپۆدرۆمی لەندەندا بە رۆڵی پشیلەیەك لەگەڵیدا نـمایشم کردووە. بەڵام ئەو هیچی وای نەوت. تەنانەت لە پشت گریـمە قەشمەرییەکەیدا زۆر ماندو و هیلاك دەهاتە بەرچاو و لەناو سارد و سڕییەکی خەماویدا نوقم بووبوو.

ساڵێك دواتر لە نیویۆرکدا خۆی کوشت. لەو بارەوە تەنیا چەند دێڕێك لە رۆژنامەکاندا نووسرا و لەو چەند دێڕەشەوە وا دیار بوو کە یەکێك لە کرێچییەکانی ئەو خانوەی کە مارسلێن تیایدا بووە، گوێی لە دەنگی گوللەیەك دەبێت و پاش برێك تەرمی مارسلێن لەبەرەپێی ژوورەکەیدا دەبینێتەوە. مارسلێن دەمانچەیەکی بە دەستەوە بووە و دیسکێکیش لەسەر گرامافۆنەکەدا سووڕاوەتەوە کە ئاوازی«مانگەشەو و گوڵەباخەکان»ی لێداوە.

هەموو ئەو هونەرمەندانەی کە من لە سەردەمی منداڵیمدا بینیبوومن و کاریگەریی زۆریشیان لەسەرم دانابوو، هەمیشە لە ریزی هونەرمەندە سەرکەوتووەکاندا نەبوون، بەڵام لەناو شاردا کەسایەتییەکی بێ وێنەیان هەبوو. «زارمۆ» تەڕدەستێکی گەڕۆك بوو کە زۆر بە وردیی و شێلگیرانە مەشقەکانی خۆی ئەنـجام دەدا و هەموو بەیانییەك کە دەرگای شانۆ دەکرایەوە، چەندین کاتژمێر تەڕدەستی و کاری سەرسووڕهێنەری دەکرد. ئەویان لە بەشی پشتەوەی شانۆکەوە دەبینی کە چێوێکی بیلیاردی بە تەعادوڵەوە لەسەر چەناکەی رادەگرت. تۆپێکی بیلیاردی هەڵدەدایەوە و لەسەر نووکی چێوێك رایدەگرت. پاشان تۆپێکی تری هەڵدەدا و ئەویشی رێك دەخستە سەر تۆپی یەکەم" دیارە زۆربەی جار هەڵەی دەکرد. رۆژێکیان بۆ ئاغای جەکسۆنی روون دەکردەوە کە چوار ساڵە خەریکی تەمرین کردنی ئەو یارییەیە و بە تەمایە لە کۆتایی حەفتەدا بۆ یەکەم جار لەبەردەم جەماوەردا نـمایشی بکات. ئەو شەوەی کە بەڵێن درابوو، هەموومان لە بەشی پشتەوەی شانۆ کۆ بووبووینەوەو سەیری ئەومان دەکرد. زارمۆ بە تەواوەتیی سەرکەوتنی بەدەست هێنا، ئەویش هەر لە جاری یەکەمدا. تۆپەکەی هەڵدایە ئاسمان و بە نووکی چێوی بیلیاردەکە گرتیەوە. پاشان تۆپێکی تری هەڵدا و خستیە سەر تۆپی یەکەم. بەڵام خەڵکەکە چەپڵەی زۆریان بۆ لێ نەدا و هانیان نەدا. ئاغای جەکسۆن زۆر جار بەسەرهاتی ئەو شەوەی دەگێڕایەوە. بە زارمۆی وتبوو:«تۆ ئەو یارییەت ئەوەندە بە ئاسانیی ئەنـجام دا کە خەڵکەکە پێیان وایە کارێکی زۆر ئاسانە. پێشتریش هیچ راگەیاندن و رێکلامێکت بۆ نەکرد. باشتر وابوو کە دوو یان سێ جار﴿بە ئەنقەست﴾هەڵە بکەیت ئینجا ئەنـجامی بدەیت». زارمۆ دابووی لە قاقای پێکەنین و وتبووی:«من ئەوەندە شارەزا نەبوومە کە تووشی هەڵە ببم! ». زارمۆ زۆریش حەزی لە بەربێژی بوو و سەبارەت بە تایبەتـمەندییە رۆحییەکانی تاکەکان لەڕووی دەموچاو و کاسەسەریانەوە، رەوشت و ئەخلاقی یەکە بە یەکەی هەموومانی روون دەکردوە. بۆ نـموونە بە منی گوت هەر زانیارییەکی فێری ببم لە زەینمدا دەمێنێتەوە و بە شێوەیەکی باش و گونـجاو کەڵکی لێ وەر دەگرم.

ئەوانی تر برایانی«گریڤیس»بوون" کەسانێکی یەکجار پێکەنیناویی و سەرنـجڕاکێش بوون کە من سەرم سووڕ دەما لە کارەکانیان: هەردووکیان ئاکرۆباتکاری سەرنـجڕاکێش بوون کە هاوکات لەگەڵ دیلانەکردن لەسەر «پارالێل »دا، بە پێڵاوی دروستکراو لە قوماشی خوریی نەرم، شەقی توند و بەهێزیان لە دەموچاوی یەکتریی دەدا.



ئەوەی کە لێدانی دەخوارد دەیوت:

_ جارێکی تر کاری ئاوها نەکەی.... ها...!

هاوڕێکەشی دەیوت:

_ نەکەم...؟ بە چاوان...!

ئنجا... زرم...لێدانێکی تری لێ دەدا! .

لێدراوەکە بە روخسارێکی سەرسووڕما و گێژ و وێژەوە دەیوت:

_ خۆ دیسان کردت...!

وەها توندوتیژییەکی دەبەنگانە، سەری دەسووڕماندم. بەڵام لە دەرەوەی شانۆدا لەگەڵ یەکترییدا میهرەبان بوون و یەکتریشیان زۆر خۆش دەویست و کەسانێکی جیدی و نتم و نیانیش بوون.

«دان لێنۆ» پاش «گریـماڵدی»ئەو پیاوە ئەفسانەییە، بێگومان گەورەترین کۆمێدیەنی بەریتانیا بوو. هەرچەند من سەردەمی گەنـجێتیی دان لێنۆم نەدیوە، بەڵام بەڕای من، ئەو پێش ئەوەی کە کۆمێدیەن بێت، ئەکتەرێکی هەموو شت زان بوو. بە قسەی دایکم، وێنایەك کە لە رۆڵە نائاساییەکانی کەسایەتییەکانی چینی سێهەم و پلەخوارەوەی لەندەن نیشانی دەدا، زۆر سەرنـجڕاکێشو تەژی لە مرۆڤایتیی بوو.

«میری لوید» ژنە هونەرمەندێکی بەناوبانگ بوو کە بە لاساریی و بێ قەیدیی و سەرسەریی بوون ناوبانگی دەرکردبوو و لەگەڵ ئەوەشدا کاتێك لەگەڵێدا لەسەر شانۆی«ئستراند» لە شانۆنامەی«تیوڤێلی پیر»دا نـمایشمان دەکرد، لەوە بەدوا هەرگیز ئەکتەرێکی ئەوەندە جیددی و ئاوەزمەند و بە ویژدانم نەبینیوە. بە چاوانێکی دادڕاوەوە تەماشای ئەو خانـمە کورتەباڵا و نیگەران و خرت و خۆڵەم دەکرد کە بە تووڕەییەوە لە راڕەوەکانی پشتەوەی شانۆ پیاسەی دەکرد. روخساری گوزارشتی لە تووڕەیی و دڵەڕاوکێ دەکرد و تا دەچوە سەر شانۆ، بەردەوام لە هاتوچۆدا بوو. هەرکە دەچوە سەر شانۆ، دەموچاوی دەکرایەوە و سیمایەکی شادی بەخۆوە دەگرت.

ئەوی تر«برێنسبی ڤیلیامز»بوو کە دەوری قارەمانەکانی«دیکێنـز»ی دەبینی و بەو لاسایی کردنەوەی «یوریاهیپ»و«بیل سێکس»و پیرەمێردی ئەنتیکەفرۆش ، زۆر دڵخۆشی کردم.

گورج و گۆڵی و لێهاتوویی ئەو لاوە جوان و شیاوە، کە لەبەردەم خەڵکی هاتوهەراکەر و قەرەباڵغکەری«گلاسکۆڤ»دا گریم و ئارایشتی دەکرد و دەوری هەموو قارەمانە سەرنـجڕاکێشەکانی

دەبینی و لایەنێکی تری شانۆی بۆ من ئاشکرا کرد. ئەو کوڕە لاوە، وای لێکردم حەز لە ئەدەبیاتیش بکەم. دەمویست دەرك بەو نهێنییانە بکەم کە لە کتێبەکاندا شارابوونەوە. دەمویست ئەو قارەمانانەی دیکێنــز بناسم کە وێنەکانیان بە مەرەکەبی چینی دەکێشایەوە و دنیایەکی سەرسووڕهێنەریان هەبوو. هەرچەند تازە فێری خوێندنەوە بووبووم، کتێبی«ئۆلیوێرتویست»ی دیکێنــزم کڕی.

ئەوەندە نوقمی قارەمانەکانی دیکێنــز بووبووم کە لاسایی برێنسبی ڤیلیامزم دەکردەوە کە خۆی لاساییکەری ئەوان بوو. دیارە بەهرەیەکی تازە دەرکەوتەی وەك من بۆ ماوەیەکی درێژ بە شاراوەیی نەدەمایەوە. رۆژێکیان ئاغای جەکسۆن ناچاری کردم لەبەردەم ئەندامانی تری گرووپدا، لاسایی پیرەمێردی ئەنتیکەفرۆش بکەمەوە. کاتێك نـمایشی خۆمم کرد، دەسبەجێ و هەر لەو شوێنەدا رایانگەیاند کە من بلیمەتم و ئاغای جەکسۆنیش بڕیاری دا ئەو هەواڵە بە هەموان رابگەیەنێت.

رووداوی گەورە لە شانۆی«میدلسبرۆ»دا روویدا. پاش ئەوەی کە نـمایشی گۆچانەچێومان نیشان دا، ئاغای جەکسۆن بە روخسارێکی خاوەن ئیرادە و خۆشحاڵەوە وەك بیەوێت مژدەی دەرکەوتنی مەسیحێکی تازە رابگەیەنێت، لەسەر سەکۆی شانۆکەوە چوە پێشەوە و بە دەنگی بەرز گوتی کە لەناو گرووپەکەیدا بلیمەتێکی دۆزیوەتەوە و هەرئێستا ئەو کوڕە دەیهەوێت لاسایی برێنسبی ڤیلیامز لە رۆڵی پیرەمێردی ئەنتیکەفرۆشدا بکاتەوە کە ئامادە نییە هەواڵی مەرگی کیژۆڵەکەی واتە «نێل»باوەڕ بکات.

خەڵك خۆشییەکی ئەوەندەیان نیشان نەدەدا، بە تایبەت کە شەوێکی ناخۆش و هیلاك¬کەریان تێپەڕاندبوو. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر بە جلی ئاسایی سەماوە، واتە جاکەتێکی کەتانیی سپیی و شاڵێکی تۆڕیی و پانتۆڵی مەخمەڵی و پێڵاوی سووری تایبەتی سەماکردن، بە گریـمێك کە حاڵەتی پیاوێکی نەوەد ساڵەی پێ بەخشیبووم، لەسەر شانۆدا دەرکەوتم. نازانم لە کوێوە قژەکڵاوێکی شڕ و کۆنیشمان دەس کەوتبوو- رەنگە ئاغای جەکسۆن کڕیبێتی- بەڵام ئەو قژەکڵاوە بە هیچ شێوەیەك لێم نەدەهات. قژەکڵاوەکە زۆر گەورە بوو و دەبوایە سەرێکی زل و قەبەم هەبوایە. بارۆکەکەیان بۆ سەری ئینسانێکی کەچەڵ دروست کردبوو. ناوەڕاستی کڵاوەکە ساف و گوڵڕەنگ بوو و قژە درێژەکانی دەوریشی ، رەنگ خۆڵەمێشی بوون، بە شێوەیەك کە کاتێك بە پشتی چەماوە و وەك پیرەمێردەکان هاتـمە سەر شانۆ، حاڵەتی ئەو قالۆنچە رەشانەم هەبوو کە پەینی گا دەتلێنن . بە بینینی من، شەپۆلی پێکەنین لە هەموو لایەکەوە بەرز بووەوە.



ئیتر ئارام کردنی تەماشاچییەکان کارێکی سەخت بوو. من بەردەوام «هس هس»م دەکرد و دەموت:«بێدەنگ بن! بێدەنگ بن ! قرم و قاڵ مەکەن ئەگینا کچەکەم «نێل» لە خەو رادەچڵەکێت».

خەڵکەکەش دەیانقیڕاند:

ـ بەرزتر! بەرزتر! ئێمە هیچ نابیسین!

بەڵام من هەر بە چرپە و بە هێواشی وەك بڵێی شتێکی نهێنیی و مەحرەمانەیە، قسەم دەکرد“ دواجار کار گەیشتە رادەیەك کە خەڵك دەستیان کرد بە پێ کوتان بە زەویدا. ئەو وەزعە کۆتایی بە کارەکەی من هێنا وەك لاسایی کەرەوەیەکی قارەمانەکانی دیکێنــز.

ئێمە تا ئەو کاتە بە قەناعەتەوە ژیانـمان بردبووە سەر و ئێستا ژیان لەگەڵ هەشت مێرمنداڵەکەی لانکشایردا زۆر خۆش و دڵخواز بوو. دیارە هەندێ جار شەڕ و ئاژاوەشمان دەبوو. لەبیرمە کە لە بەرنامەیەکدا لەگەڵ دوو ئاکرۆباتی لاودا نـمایشمان دەکرد کە ئەو دوو ئاکرۆباتە تازەکار بوون و تا رادەیەك هاوتەمەنی خۆم بوون. بە ئێمەیان دەوت کە حەفتەیەك ٧ شیلینگ و ٦ پێنس بە دایکی هەرکامیان دەدەن و بۆ خۆشیان هەموو بەیانیانی دووشەمە، وەك پارەی ناوگیرفان، ١ شلینگی زیو دەخەنە سەر قاپی سۆحانەکەیان کە هێلکە و «بیکێن»ە. یەکێك لە ئەندامەکان بەدەم گلەییەوە گوتی:

ـ ترحێو. . ! ئێمە ٢ پێنس زیاتر وەرناگرین و بەرچاییەکەشمان تەنیا نان و مرەبایە!

کاتێك «جان» کوڕی ئاغای جەکسۆن ئەوەی بیست کە ئێمە گلە و گازندە دەکەین، دەستی کرد بە گریان و گوتی: کاتێك گرووپەکەمان حەفتەیەکی تەواو لە دەوروبەری لەندەندا نـمایش دەکات، ئاغای جەکسۆن بۆ هەموو ئەندامانی گرووپەکە تەنیا ٧ لیرە لە حەفتەیەکدا وەردەگرێت و باوەڕتان بێت ئەم کارە بە زەحمەت دەتوانێت مرۆڤ بژیێنێت.

ژیانی ئاسوودە و خۆشگوزەرانیی ئەو دوو لاوە ئاکرۆباتە تازەکارە بوو کە هانی داین ببینە ئاکرۆبات. تا ماوەیەك هەموو رۆژێك بەیانییان هەرکە دەرگای شانۆ دەکرایەوە، یەك دوانـمان بە تەنافێکی پێچراو بە دەوری کەمەر(پشت)ماندا، سەرێکمان بە چەرخی سەر بیرێکەوە توند کردبوو و ئەو سەرەکەشی هاوڕێکەمان رایدەگرت و هەندێ هەڵبەزودابەز و بازدانی مەترسیدارمان ئەنـجام دەدا. بە تایبەت من خۆم هەندێ بازدانی زۆر جوان بەڵام مەترسیدارم دەکرد“ تا رۆژێکیان کەوتم و قاچم شکا و هەر ئەوەش وای لێکردم واز لە کاری ئاکرۆبات بهێنم.

جگە لە سەما، بەردەوام لە هەوڵ و تەقەلادا بووین فێری هەندێ هونەری تازە ببین. من دەمویست فێری تەڕدەستییەکی تێکەڵ بە گاڵتەجاڕیی ببم، هەر بۆیە بڕێك پارەم پاشەکەوت کرد و چوار تۆپی لاستیکیی و چوار قاپی تەنەکەم کڕی و چەندین کاتژمێر لە تەنیشتی قەرەوێڵەکەمدا دادەنیشتم و تەمرینم دەکرد.

ئاغای جەکسۆن لە دڵەوە پیاوێکی زۆر باش بوو. سێ مانگ بەرلەوەی من گرووپەگە بەجێ بهێڵم، هەمووومان بەشداری میوانداریییەك بووین کە بۆ یارمەتیدانی باوکم رێك خرابوو، لەبەر ئەو نەخۆشییە سەختەی کە گرتبووی. ژمارەیەکی زۆر لە هونەرمەندانی تەماشاخانە و کافتریاکان هاتن و بە بێ بەرانبەر و بە بێ هیچ حەقدەستێك نـمایشیان کرد، لەوانە«هەشت مێرمنداڵەکەی لانکشایر»ی ئاغای جەکسۆن.

شەوی میوانداریییەکە، باوکم کە بە زەحمەت هەناسەی دەکێشا، هاتە سەر شانۆ و بە هەوڵ و تەقەلایەکی زۆرەوە لێدوانێکی زۆر کورتی دا. من کە لە نزیك شانۆکەوە راوەستابووم، لێی روانیم بە بێ ئەوەی کە بزانم خەریکە دەمرێت.

کاتێك گەڕاینەوە بۆ لەندەن، لە کۆتایی حەفتەدا سەردانێکی تری دایکمم کرد. ئەو پێی وابوو کە من بێ رەنگ و کز و لاوازم و سەماکردن سییەکانم هیلاك دەکات و ئەوەندە نیگەران بوو کە نامەیەکی بۆ ئاغای جەکسۆن نووسی. ئەو ئەوەندە تووڕە بوو کە لە ماڵەوە دەری کردم و ناردمی بۆ نەخۆشخانەی ئاسم و راشیسپارد من ئەوە ناهێنم دایکێکی وەها دڵسۆز و میهرەبان خەم و خەفەتم بۆ بـخوات. بە رێکەوت چەند حەفتە دواتر تووشی تەنگەنەفەسییەکی یەکجار خراپ بووم. ئەوەندەش حاڵم خراپ بوو کە دایکم دڵنیا بوو تووشی نەخۆشیی سیل بوومە، بۆیە دەسبەجێ راپێچی نەخۆشخانەی«برامپتۆن»ی کردم و بە وردی کەوتـمە ژێر چاودێرییەوە. لەوێ بۆیان دەرکەوت کە هیچ نەخۆشییەك لە سییەکانـمدا نییە بەڵام دڵنیا بوون پشووسواریم هەیە. چەندین مانگ حاڵم زۆر خراپ بوو و نەمدەتوانی هەناسە بکێشم. هەندێ جار دەمویست خۆم لە پەنـجەرەوە بهاوێـمە خوارەوە. کاتێك کە پەتوویەکم دەدا بە سەری خۆمدا و بـخووری چەند گیایەکم هەڵدەمژی، تۆزێك هێور دەبوومەوە. بەڵام هەر وەك پزیشکەکە وتبووی، ئەو بەڵایە لە من لای دابوو.



بیرەوەرییەکانی ئەو سەردەمە هەندێ جار روونن و هەندێ جاریش ئاڵۆز و لێڵ و تێکەڵ پێکەڵ. لەگەڵ ئەوەشدا ئەوەی کە بە دڵنیاییەوە لە زەینمدا ماوەتەوە ئەوەیە کە لەناو زەلکاوێك لە هەژاریی و چەرمەسەریدا لاقەفرتەم دەکرد. هەرگیز نایەتەوە بیرم کە لەو کاتەدا سیدنی لە کوێ بوو. ئەو لەبەر ئەوەی چوار ساڵ لە من گەورەتر بوو، بە دەگمەن دەهاتە ناو دنیای منەوە. رەنگە لەبەر خاتری کەمکردنی قورسایی سەرشانی دایکم، لای باوەگەورەم دەژیا. دیارە زوو زوو خانوومان دەگۆڕی تا دواجار لە ژوورێکی بچووکی خانوویەك لە ﴿کۆڵانی﴾ ژمارە ٣ی شەقامی «پاونێل تراس»دا گیرساینەوە.

من بە تەواوەتی بە ئاگا بووم لەو سەرشۆڕییە کۆمەڵایەتییەی وا لە هەژاریشمانەوی سەرچاوەی دەگرت. تەنانەت هەژارترین منداڵانیش رۆژانی یەکشەمە لە ماڵی خۆیاندا خواردنیان دەخوارد. کەبابێك کە لە ماڵەوە دروست دەکرا، هێمایەك بوو بۆ دەوڵەمەندی و گەورەیی کە وەکوو هۆکارێکی سوننەتی، جیاوازیی نێوان چینی هەژار و دەوڵەمەندی دەردەخست. کەسانێك کە نەیاندەتوانی ئێوارانی یەکشەمە لە ماڵی خۆیاندا لە سەر سفرە دابنیشن و خواردنێك بـخۆن کە خۆیان دروستیان کردووە، لەڕیزی چینی هەژاراندا بوون و ئێمەش سەر بەو چینە بووین. دایکم دەیناردم بۆ دووکانی سەر کۆڵانەکەمان بۆ کڕینی شێوێکی شەش پێنسی کە بریتی بوو لە پارچەیەك گۆشت و دوو پەل سەوزی. ئاخ... چ شەرمەزارییەك...! بە تایبەت رۆژی یەکشەمە! من لۆمەم دەکرد کە بۆچی لە ماڵدا شتێك لێ نانێت و ئەویش بێهوودە هەوڵی دەدا بۆم روون بکاتەوە کە چێشت لێنان لە ماڵەوە، دوو ئەوەندەی دەرەوە گرانتری تێ دەچێت.

لەگەڵ ئەوەشدا، رۆژێکی هەینی کە لە مەرجبەندییەکی پێشبڕکێی ئەسپ سواریدا کە شانسی هێنابوو و پێنج شلینگی بردبووەوە، بۆ ئەوەی کە دڵی منیش خۆش بکات، بڕیاری دا بۆ نانی ئێوارەی یەکشەمە، لە ماڵەوە چێشت لێ بنێت. هەندێ خواردن و پارچەیەك گۆشتیشی کڕی کە دیار نەبوو گۆشتی پشت مازەی گایە یان گورچیلەی گا. پارچە گۆشتەکە زیاتر لە دوو کیلۆ دەبوو و لەیبلێکی پێوە بوو کە لەسەری نووسرابوو:«گۆشتی کەباب».

دایکم لەبەر ئەوەی کە فرێی  نەبوو، لە فرێی خاوەن ماڵەکەمان کەڵکی وەردەگرت و چونکە بە شەرم و حەیاش بوو و حەزی نەدەکرد زۆر لە چێشتخانەدا بــمێنێتەوە، حیسابی کردبوو کە برژاندنی گۆشتەکە چەندی پێ دەچێت، تا لەوە زیاتر لە چێشتخانەدا نەمێنێتەوە. بەڵێ، بەوپەڕی سەرسووڕمانەوە دیــمان کە گۆشتەکەمان هێندەی تۆپێکی«کریکت»بچووك بۆتەوە. سەرەڕای جەخت کردنەکانی دایکم لەسەر ئەوەی کە پێی وابوو شێوە شەش پێنسییەکەمان دەردیسەریی کەمتری هەیەو بەتامتریشە، بەڵام من خۆشحاڵ بووم و هەستم بە چێژێکی زۆر دەکرد لەوەی کە وەکوو خەڵکانی تر لە ماڵەوە چێشتمان لێ ناوە.



## ٤

## مەرگی باوکم

ساڵی ١٨٩٩ ساڵی ﴿مۆدەی﴾ ردێنی«فائۆری»بوو. هەر لە پاشاکانەوە بگرە تا سیاسەتوان و سەرباز و کەشتییەوان و مەلەوان و «کرۆگێرەکان» و «سالسیبۆرییەکان» و «کیچێنــزەکان» و قەیسەرەکان و «کرێکت بازەکان» هەموویان ردێنی فائۆرییان دادەنا. سەردەمێکی سەرسووڕهێنەر بوو لە رووی شکۆمەندی و گەورەیی و گەمژەیی و گەندەڵی و سەروەت و سامانی زۆر و هەروەها هەژاریی لەرادەبەدەر و دەمارگیریی سیاسیی گەمژانەوە. کە هەم لە رۆژنامەکان و هەمیش لە کاریکاتۆرەکاندا رەنگی دەدایەوە. بەڵام زۆری پێ نەچوو بەریتانیا بەرەو ئەوە دەچوو کە زەرەر و زیان و سووکایەتیی زۆری بەرکەوێت. چەند وەرزێرێکی«بووئێر» لە «ترانسوال»ی ئافریقادا شەڕێکیان لە دژی ئێمەدا نابووەوە کە لەگەڵ یاسا و دەستوورەکانی شەڕدا نەدەهاتەوە" واتە لە پشت گرد و تەپۆڵکە و گاشەبەردە گەورەکانەوە تەقەیان لە سەربازە جل سوورەکانی ئێمە دەکرد. وەزارەتی جەنگ  بەو شتەی زانی و دەسبەجێ جلی سووری سەربازەکانی ئێمەی گۆڕی و کردی بە رەنگی خاکی. ئەگەر بووئێرەکان هەر بەو شێوەیە درێژەیان بە شەڕ بدایە، مافی خۆیان بوو و هیچ چارەسەرێکیشی نەبوو.

من زانیارییەکی زۆر کەمم لەبارەی ئەو شەڕەوە هەبوو و ئەوەش کە دەمزانی لە گۆرانیی و سروودە نیشتمانیی و هەروەها شانۆ و نــمایشی نێو هۆڵەکان  و وێنەی ژەنراڵەکان لەسەر پاکەتی جگەرەکان دەستم دەکەوت. دیارە ئەوەش شتێکی سروشتییە کە لەو جۆرە کاتانەدا دوژمن هەمیشە وەك کەسێکی بەدفەڕ و خراپکار نیشان دەدرێت.

هەواڵی خەفەتهێنەری گەمارۆدرانی«لیدی ئسمیت»مان لە لایەن بووئێرەکانــەوە بیست، بەڵام کاتێك هەواڵەکە هات کە توانیبوومان «مێفکینگ» رزگار بکەین، سەرتاسەری بەریتانیا پڕ بوو لەخۆشی و قریوە. پاشان گوتیان ئێمە سەرکەوتووین و یان بە واتایەکی تر توانیومانە هەر چۆنێك بووە بەرەی خۆمان لە ئاو بکێشینە دەرەوە. دەمدی کە هەموو کەس لەو بارەوە قسە دەکەن جگە لە

دایکم. ئەو هەرگیز تاقە ئاماژەیەکیشی بە شەڕ نەکرد، ﴿ڕەنگە لەبەر ئەوە بوو بێت﴾خۆی بە قەدەر پێویست لە شەڕێکی گەورەدا بوو لەگەڵ ژیاندا.

سیدنی تەمەنی بووبوو بە چواردە ساڵ و خوێندنگەی بە جێ هێشتبوو و وەك تەلگرافچییی لە ئیدارەی پۆست و تەلگرافی«ئەستراند»دا کاری دەکرد. ئێمە بە حەقدەستی سیدنی و هەروەها ئەو بڕە پارەیەی کە دایکم بە کاری دوورمان بە دەستی دێنا، ژیانێکی تا رادەیەك بژی و مەمرەمان هەبوو. دیارە داهاتی دایکم یەکجار کەم بوو" ئەو وردە کاری دوورمانی دەکرد و کاری بۆ دەڵاڵەکانیش دەکرد. دوانزە جاکەتی ژنانەی دەدووری بە ١ شلینگ و ٦ پێنی. ئەگەرچی قوماشی ئامادە و بڕاویشیان بۆ دێنا بەڵام دوورینی دوو جین جاکەت، دوانزە کاتژمێری دەبرد. ئەوپەڕی توانای دایکم، ٥٤ جاکەت لە حەفتەیەکدا بوو کە هەموو حەقدەستەکەی ٦ شلینگ و ٩ پێنس دەبوو. زۆربەی شەوان من لەو ژوورەی خانووەکەدا دادەنیشتم و تەماشای دایکم دەکرد کە لە سەر مەکینەی دوورمانەکەی چەماوەتەوە و چرا نەفتییەکەش خەرمانەیەك لە رووناکیی بە دەوری سەریدا دروست کردبوو. دەموچاویشی لەناو ئەو نیمچە تاریکییەدا مەیلەو خوار بووبوو و لێوەکانی بە هۆی ماندوویەتییەوە برێك کرابوونەوە و لەو حاڵەتەدا قوماشە دووراوەکان بە خێرایی لە ژێر دەرزییەکەدا تێ دەپەڕین. من ئەوەندە تەماشام دەکرد کە هاڕەهاڕی مەکینەکە دەیــنواندم. هۆی ئەو هەموو کارکردنەی دایکم تا درەنگانێك ئەوە بوو کە دەبوایە قستی قەرزەکانی بداتەوە. کێشەی دانەوەی قستی مانگانەی مەکینەی دوورمانەکە هێشتا وەکوو خۆی مابووەوە.

جارێکیان ماڵەکەمان تووشی قەیرانێکی ناخۆش هات: سیدنی پێویستی بە دەستێك جلی تازە بوو. ئەو، هەموو رۆژانی حەفتە تەنانەت رۆژانی یەکشەمە، هەر هەمان جلی فۆرمی تەلگرافچییەکانی لەبەردا بوو، تا ئەوەی کە هاوڕێکانی هێدێ هێدێ دەستیان کرد بە تانە و توانج و گاڵتە پێکردنی. دوو حەفتەی تەواو، رۆژانی پشووی کۆتایی حەفتە، لە ماڵدا مانی گرت تا دایکم توانی دەستێك جلی تازە لە قوماشێکی خوریی شینی بۆ بکڕێت. نازانم ئەو ژنە داماوە چۆن توانیبووی ١٨ شلینگ پارەی ئەو جلانە دابین بکات. ئەو خەرجە داسەپاوە، هێندە بارودۆخی ئابووریــمانی تێك دا کە دایکم ناچار بوو ئەو رۆژانەی کە سیدنی جلی فۆرمی تەلگرافچییەکانی لەبەر دەکرد و دەچوە سەر کارەکەی، ئەو جلە لە لای سوودخۆرێك بە بارمتە دابنێت و پارەی لە لا قەرز بکات. بۆ ئەو کراسە، حەوت شلینگ قەرزیان دەدایە و ئەویش هەموو رۆژانی شەمە جلەکەی



وەردەگرتەوە تا سیدنی بتوانێت لە رۆژی پشوودا لەبەری بکات. ئەم عادەتە حەفتانەیە، بوو بە نەریتێکی هەمیشەیی و ساڵ و هەندێکی خایاند تا رۆژێکیان زەبرێکی گەورەمان بەر کەوت!

دایکم بەیانیی دووشەمە وەکوو جاران چوو بۆ لای سوودخۆرەکە. پیاوەکە دوودڵیی کردبوو لە قەرزدان و وتبووی:

__ بە داخەوە خانــمی چاپلین، ئێمە ئیتر ناتوانین حەوت شلینگ قەرزتان بدەینێ.

__ دایکم بە سەرسووڕمانەوە پرسیبووی: بۆچی؟

__ قەرزدان بۆ ئەم جلە وەکوو ریسك کردن وایە. پانتۆڵەکەی تەواو سواوە(دڕاوە).

پاشان دەستی نابووە ژێر جلەکە و وتبووی:

__ تەماشاکە! دەستم لە پشت قوماشەکەوە دیارە.

دایکم گوتی:

بەڵام من شەممەی داهاتوو قەرزەکەم دەدەمەوە.

سوودخۆرەکە سەرێکی لەقاندبووەوە و وتبووی:

تەنیا کارێك کە دەتوانم بۆتی بکەم ئەوەیە کە ٣ شلینگ بۆ قات و جلیقەکەی ﴿قەرزتان﴾ پێ بدەم.

دایکم بە دەگمەن دەگریا، بەڵام ئەو زەبرە ئەوەندە گەورە بوو کە بەدەم گریانەوە گەڕایەوە بۆ ماڵەوە. ئەو داماوە بۆ بەڕێوەبردنی ئێمە لە رۆژانی حەفتەدا پشتی بەو حەوت شلینگەوە بەستبوو.

***

دایکم هەمیشە دەیوت:«پێویست ناکات کاتێك مرۆڤ دەنەوێتەوە، حەتــمەن دەبێ شتێك لە زەویی هەڵ بگرێتەوە». بەڵام لەناو دڵیشیدا باوەڕی بەو پەندە نەبوو و هەر ئەوەش زۆربەی کات لە ناخەوە زۆر بریندار دەکردم.

ئەو رۆژەی کە لە نەخۆشخانەی برامپتۆنەوە دەگەڕایەوە، لەناو کۆڵاندا وەستا تا بەرگری لەو پیرەژنە داماوە بکات کە چەند منداڵێکی لاسار و شەڕاشۆ عەزیەتیان دەکرد. پیرە ژنەکە جلێکی کۆنو پیس و پۆخڵی لەبەردا بوو. سەریشی تاشرابوو، شتێك کە لەو سەردەمەدا بە دەگمەن دەبینرا. منداڵەکان پێی پێ دەکەنین و لەبەرچاوی یەکتری پاڵیان بە یەکدییەوە دەنا و ئەدا و ئەتواریان دەردەهێنا" وەك بلێی دەترسان لەوەی کە ئەگەر دەستی لێ بدەن، تووشی نەخۆشییەك دەبن. کاتێك

دایکم گەییشتێ و لە منداڵەکان تووڕە بوو، پیرەژنەکە وەك کەڵێك کە لەناو گەمارۆی سەگانی ڕاوچییدا گیری خواردبێت، لە جووڵە کەوتبوو و جووڵەی لێ بڕابوو .

دیار بوو پیرەژنەکە دایکمی دەناسی چونکە بەو ناوە بچووکەوە بانگی کرد کە لە شانۆدا بانگیان دەکرد. لە ژێر لێوەوە گوتی:

_ لیل...! نامناسیتەوە؟...«ئیڤا لیستۆك»م ! .

دایکم هەر زوو ناسییەوە. یەکێك لە هاوڕێکانی ئەو سەردەمانەی بووە کە لە کافتریا و هۆڵەکانی شانۆدا کاری کردووە.

من وا حەپسابووم کە درێژەم بە ڕێگاکەی خۆم دا و لە سووچێکی کۆڵانەکەدا چاوەڕێی دایکم کرد. مێرمنداڵەکان بە پێکەنین و گاڵتەجاڕییەوە بە بەر دەممدا تێ پەڕین. من تووڕە بووم. ئاوڕێکم دایەوە بزانم دایکم چی لێ هات و بینیم کە شان بە شانی پیرەژنەکە بەرەوڕووی من دێن.

دایکم لێی پرسی:

_ تۆ چارلی بچکۆلەکەی منت لەبیر ماوە؟

_ پیرەژنەکە بە دەنگێکی گریاناوییەوە گوتی:

ئەی چۆن...لەبیرم ماوە! کاتێك شیرخۆرە بوو، گەلێ جاران لە باوەشم گرتووە.

هەر ئەو فکرە ساکارە کە وەها ژنێك لە باوەشی گرتبێتم، قەڵسی دەکردم، چونکە بەڕاستی ئەو ژنە هەر تەواو پیس و پۆخڵ و قێزەون بوو، هەروەها ئەوەش زۆر قەڵسی دەکردم کە دەمبینی خەڵك ئاوڕ دەدەنەوە و سەیری هەر سێکمان دەکەن.

دایکم لە هۆڵی شانۆی «ئیڤا لیستۆکی جوان»دا ئەو پیرەژنەی ناسیبوو، کە هۆڵەکە هی ئەو ژنە بووە. ﴿دایکم﴾ گوتی کە ئەم ژنە لەو کاتانەدا بەڕاستی جوان و بەگوڕ و تین بووە. ژنەکە خۆی گوتی کە ماوەیەکی زۆر لە نەخۆشخانەدا کەوتووە و لەو کاتەوە کە لەوێوە هاتۆتە دەرەوە، لەژێر پردەکان و حەشارگەکانی سەر بە «کۆمەڵەی ئاییینی»دا دەنوێت.

دایکم پێش هەموو شتێك ناردی بۆ حەمامی گشتی و منیش بەوپەڕی سەرسووڕمانەوە بینیم کە هێنای بۆ ماڵەوە و لە هەمان ژووری خانووەکەماندا جێی کردەوە. من هەرگیز نەمزانی ئاخۆ حاڵی شێواوی ئەو ژنە بە هۆی نەخۆشییەکەیەوە بوو، یان شتێکی تر. بەڵام شتێك کە زۆر تووڕەی دەکردم ئەوە بوو کە لەسەر قەرەوێڵەکەی سیدنی دەنووست. دایکم هەرچی جلی زیادەی هەبوو پێی بەخشی و



چەند شلینگێك قەرزیشی پێ دا. سێ ڕۆژ دواتر ماڵی ئێمەی بە جێ هێشت و ئیتر هەرگیز سۆراغێکمان لە «ئیڤا لیستۆکی جوان ! ! » نەزانییەوە.

باوکم زۆر بە کەمیی سەردانی کافتریای«سێ کەڵ»ی شەقامی کنینگتۆنی دەکرد، بەڵام ئەو شەوەی کە بە بەردەمیدا تێ دەپەڕیم، بە حوکمی غەریزە، سەرێکم کێشا و چاوێکم گێڕا بزانم ئاخۆ باوکم لەوێیە یان نا؟ دەرگای کافتریاکەم تۆزێك کردەوە و ئەوم بینی کە لە سووچێکدا دانیشتووە. دەمویست بگەڕێمەوە کە دەموچاوی باوکم رووناك بووەوە و ئاماژەی پێکردم کە بچم بۆ لای. سەرم لە وەها ڕەفتارێکی میهرەبانانە سووڕ ما، چونکە ئەو هەرگیز لای لێ نەدەکردینەوە و سۆزی بەرانبەر نەدەنواندین و سۆزی نەدەدایێ. پیدەچوو زۆر نەخۆش بێت. چاوەکانی بەقووڵدا چووبوون و هەموو لەشی ئاوسا بوو. بە شێوەی ناپلیۆنی ئیمپراتۆر، دەستێکی لە گیرفانی جلیقەکەی نابوو، وەك بڵێی بەو جۆرە دەیهەوێت ئاسانتر هەناسە بکێشێت. ئەو شەوە خۆی میهرەبانتر و دڵسۆزتر نیشان دەدا و هەواڵی دایکم و سیدنیشی پرسی. پێش ڕۆشتنیشم لە باوەشی گرتم و بۆ یەکەم جار لەژیانمدا ماچی کردم. ئەو شەوە دوایین جار بوو چاوم بە باوکم کەوت.

سێ حەفتە دواتر، بردیان بۆ نەخۆشخانەی«سێن تامس». هەرچییەکیان دەکرد نەدەچوو بۆ نەخۆشخانە، ئاخرەکەی مەستیان کرد ئینجا بردیان. کاتێك زانیبووی لە کوێیە، وەك منداڵێکی لاسار و هاروهاج، دەستی کردبوو بە قرم و قاڵ و هەراکردن" بەڵام ئەو ئیتر مرۆڤێکی داماو بوو و هێز و توانای جووڵانیشی نەبوو. هەرچەندە هێشتا گەنج بوو- تەمەنی٣٧ ساڵ بوو- بەڵام خەریك بوو بە هۆی نەخۆشیی ڕۆماتیزمەوە دەمرد. نزیکەی ٢٠ لیتر ئاویان لە ئەژنۆیەوە دەرهێنا.

دایکم چەندین جار سەردانی کرد، بەڵام ئەو دیدارانە هەمیشە خەمباری دەکرد. دەیوت باوکم حەز دەکات بگەڕێتەوە بۆ لای و زۆریش حەز دەکات ژیانێکی تازە لە ئافریقادا دەست پێ بکەنەوە. کاتێك بیرکردنەوە لە وەها ژیانێك خۆشحاڵی دەکردم، دایکم چونکە دەیزانی سەرچاوەی ئەو قسانە لە کوێوەیە، سەرێکی دەلەقاندەوە و دەیوت:«باوکت هەر بۆ خۆشییە ئەو قسانە دەکات».

ڕۆژێکیان دایکم حەپەساو و شڵەژاو و تووڕە لە نەخۆشخانەوە گەڕایەوە، چونکە قەشە«جان مەك نیل» کە یەکێك لە قەشەکانی ئاییینزای ئینجیلیی بوو، وێڕای سەردانی باوکم وتبووی:«چارلی! ...ئەوەی ڕاستیی بێت، من هەر کاتێك لە دەموچاوی تۆ دەڕوانم، لەخۆوە وەبیری ئەم پەندە

دەكەومەوە كە دەڵێ:« چی بكێڵێت ئەوە دەدروویتەوە». دایكیشم دەیوت:«ئاخر چۆن دەبێ لەبەردەم نەخۆشێكی سەرەمەرگدا قسەی ئاوها بكرێت؟! ».

چەند رۆژ دواتر باوكم كۆچی دوایی كرد.

نەخۆشخانە دەیویست بزانێت چ كەسێك پارەی كفن و دەفنی مردووەكە دەدات؟. دایكم كە تاقە پێنییەك پارەی شك نەدەبرد، پێشنیاری كرد كە لە«رێكخراوی خێرۆمەندیی» هونەرمەندە واریتەكان یارمەتی وەربگرن كە رێكخراوێك بوو یارمەتیی هونەرمەندانی شانۆی دەدا. ئەو قسەیە بنەماڵەی چاپلینی توورە كرد و نارەزایی زۆریان دەربڕی. كفن و دەفنێك كە لە رێگەی خێراتەوە بكرێت، سووكایەتییەك بوو كە ئەوان لێی بێزار بوون. لەو سەروبەندەدا مامە«ئالبێرت»كە برای هەرە بچووكی باوكم بوو، لە ئافریقاوە گەڕابووەوە بۆ لەندەن و، گوتی خەرجی كفن و دەفنی باوكم دەگرێتە ئەستۆ.

رۆژی بە خاك سپاردنەكە، دەبوایە هەموومان بچووینایە بۆ نەخۆشخانەی سێن تامس و لەوێ بین و لەگەڵ كەسانی تری بنەماڵەی چاپلیندا یەك بگرینەوە و بە كۆمەڵ بڕۆین بۆ قەبرستانی«تگوتینگ». سیدنی نەیدەتوانی بێت، چونكە كاری دەكرد. من و دایكم دوو كاتژمێر زووتر گەییشتینە نەخۆشخانە، چونكە دایكم دەیویست بەر لەوەی كە دەرگای تابووتەكە دابــخەن، بۆ جارێكی تر باوكم ببینێت. باوكمیان لە قوماشێكی ساتەنی سپی پێچابووەوە و بە دەوری دەموچاویدا گوڵی مینایان چنیبوو. دایكم تووشی خەم و خەفەتێكی وەها بووبوو كە ناخودئاگا پرسیی: ئەوە كێ ئەو گوڵانەی لەوێ داناوە؟ فەرمانبەری نەخۆشخانەكە گوتی سەرلەبەیانی ژنێك لەگەڵ منداڵێكی بچووكدا هاتووە و ئەو كارەی كردووە. دیارە ئەو ژنەش لویز بوو.

لەناو كالسكەی یەكەمدا من و دایكم و مامە ئالبێرت دانیشیتین. ئەو مەودایەی نێوان نەخۆشخانە و قەبرستانی تگوتینگ بە سەختیی تێپەڕ دەبوو، چونكە دایكم هەرگیز مامە ئالبێرتی نەدیبوو. مامە ئالبێرت كەسێكی تەڕپۆش و خۆدەرخەر بوو كە بە جۆرە زمانێكی دەسكردی تایبەتی قسەی دەكرد و رەفتارێكی سارد و سڕی هەبوو. دەیانوت زۆر دەوڵەمەندە و لە «ترانسواڵ»دا دامەزراوەیەكی پەروەردەكردنی ئەسپی هەیە و تەنانەت دەیانوت كە كاتی شەڕ لەگەڵ بووئێرەكاندا بە قەدەر پێویست ئەسپی بۆ دەوڵەت دابین كردووە.

لە كاتی بەڕێوەبردنی رێوڕەسمی ناشتنیدا، دایكردە باران. گۆڕهەڵكەنەكان، كڵۆبەردیان فڕێ دەدایە سەر تابووتەكە و دەنگێكی سارد و وشكیان لێ دەكەوتەوە. دەنگێكی خەمهێنەر و ترسێنەر



بوو و منیش دام لە پرمەی گریان. پاشان ئەندامانی بنەماڵە، دەستیان كرد بە فڕێدانی ئەو گوڵ و تاجەگوڵینانەی كە لەگەڵ خۆیاندا هێنابوویانن. دایكم لەبەر ئەوەی كە هیچ شتێكی پێ نەبوو بیخاتە سەر مردووەكە، دەسماڵێكی رەش كە لە ملمدا بوو و زۆریش بەنرخ بوو، لە ملی كردمەوە و لە ژێر لێوەوە گوتی:«كوڕەكەم ئەوەش لە لایەن من و تۆوە! ». دوای ئەوە، ئەندامانی بنەماڵەی چاپلین لە رێستوورانێكدا وەستان بۆ خواردنی نانی نیوەڕۆ و بەر لەوەی كە لە یەكدیی جیا ببینەوە زۆر بە ئەدەبەوە لێیان پرسین كە لە كوێ دادەبەزین! ! ئەوە بوو كە بە كالسكە ئێمەیان گەیاندەوە.

كاتێك گەڕاینەوە بۆ ماڵەوە، هیچ شتێكمان بۆ خواردن شك نەدەبرد، جگە لە پیاڵەیەك بەزی گا. دایكیشم یەك پێنی پارەی نەبوو، چونكە تەنیا دوو پێنی هەبوو كە دابووی بە سیدنی بۆ خواردنی نانی نیوەڕۆی. دایكم لەو رۆژەوەی كە باوكم نەخۆش كەوتبوو، دەرفەتی كاركردنی نەمابوو و ئەو رۆژەش كە كۆتایی حەفتە بوو، هەموو حەوت شلینگە حەقدەستەكەی سیدنیش كە وەك تەلگرافچیی وەری دەگرت، خەرج كرابوو. كە لە قەبرستانەوە گەڕابووینەوە، زۆر برسیمان بوو. بەختەوەرانە كۆنەفرۆشێك لە كۆڵانەوە تێ دەپەڕی و ئێمەش سۆبەیەكی كۆنەی نەوتیمان هەبوو. بە ناچار دایكم بە نیو پێنی فرۆشتی و نیو پێنیەكەشی دا بە نان بۆ ئەوەی لەگەڵ بەزەكەدا بیخۆین.

چونكە دایكم بێوەژنی شەرعیی باوكم بوو، بەیانیی ئەو رۆژە لە نەخۆشخانەوە داوایان لێ كرد بڕوات و كەلوپەلەكانی باوكم وەربگرێتەوە. كەلوپەلەكەش بریتی بوو لە:دەستێك قاتی رەش كە پەڵەی خوێنی پێوە بوو، هەندێك جلی ژێرەوە، بۆینباخێكی رەش، «رۆب دۆشامبر»ێكی كۆن و جووتێك دەمپێی ئسكاتلەندیی كە پرتەقاڵیان تیا دانابوو. كاتێك دایكم پرتەقاڵەكانی دەر هێنا، لە بنی دەمپێكانەوە نیو لیرەیەك كەوتە سەر قەرەوێڵەكە. ئەویش دیارییەكی خوایی بوو.

چەندین حەفتە بەنێكی رەشم لە باسكم بەستبوو. ئەو بەنە كە هێمایەیەك بوو بۆ تازیەتبارییی، لە دوانیوەڕۆیەكدا كە بۆ فرۆشتنی گوڵ چووبوومە دەرەوە، بە قازانــجم شكایەوە. دایكم رازیی كردبوو كە شلینگێكم بە قەرز پێ بدات. بەو پارەیە چووم بۆ بازاڕی گوڵفرۆشان و دوو چەپكە گوڵی نێرگزم كڕی. دوای تەواوبوونی خوێندنگە، ئەو گوڵانەم دەكردە چەپكە و هەركامم بە یەك پێنی دەفرۆشت. كاتێك هەموو گوڵەكانم فرۆشت، دیم لەسەداسەد قازانــجم كردووە.

به روخسارێكی خەمبار و خەمۆكەوە دەچوومە ناو رێستوورانەكان و لە ژێر لێوەوە دەموت: «گوڵی نێرگزم هەیە، خانم! گوڵی نێرگزم هەیە خاتوون! ». ژنانیش هەمیشە لێیان دەپرسیم:

کوڕە گیان، کێت مردووە؟ منیش بە دەنگێکی نزم و بێ هێزەوە دەمگوت:باوکم! وە ئەوانیش بڕێك پارەیان پێ دەدام. دایکم کاتێك دەیبینی شەو بە پارەیکی زیاتر لە پێنج شلینگ گەڕاومەتەوە بۆ ماڵەوە سەری دەسووڕما، چونکە بەڕاستیی ئەو پارەیە بۆ دوانیوەڕۆیەك کارکردن زۆر بوو. ڕۆژێکیان کە لە کافتریایەکەوە دەهاتــمە دەرەوە، دەستی گرتم و هەر ئەوەش کۆتایی هێنا بە چیرۆکی گوڵ فرۆشتنەکەم. ئەی چۆن...! گوڵ فرۆشتنی کوڕەکەی لە باڕەکاندا لەگەڵ باوەڕە توندە مەسیحیەکانیدا نەدەهاتەوە. پێی وتم:«کوڕم! باوکی تۆ ئەلکۆل کوشتی و پارەیەکیش کە لەو ڕێگەیەوە دەستمان بکەوێت، جگە لە بەدبەختیی هیچمان پێ نابەخشێت». لەگەڵ ئەوەشدا ئەو پارەشی هەڵگرت کە لە ڕێگای گوڵ فرۆشییەوە بە دەستم هێنابوو، بەڵام لێمی قەدەغە کرد کە هیچ کاتێکی تر گوڵ فرۆشیی نەکەم.

من بەڕاستیی بەهرە وتوانای پارە پەیداکردنم هەبوو. هەمیشە بیرم دەکردەوە و تەماشای دووکانە بەتاڵەکانم دەکرد و پرسیارم لە خۆم دەکرد کە ئاخۆ لەم دووکانەدا دەتوانم چ کارێکی پڕ دەرامەت بکەم و لە ماسی فرۆشییەوە بگرە تا سوورەوەکراوەکان و بۆن فرۆشەکان ، سەیری هەمووانم دەکرد. بەهەر حاڵ لەو باوەڕەدا بووم حەتــمەن دەبێ دووکانێکی خواردن بێت. تەنیا شتێکی کە نەمبوو دەزمایە* بوو. بەڵام دەزمایە لە کوێ دەستەبەر بکەم؟ دواجار دایکمم ڕازیی کرد کە مۆڵەتم بدات خوێندنگە بە جێ بهێڵم و کارێك پەیدا بکەم.

هەندێ کاری جۆراجۆرم دۆزییەوە. سەرەتا لە دووکانێکدا بوومە بەردەست. کاتێك دەچووم بۆ ژێرزەمینەکە بۆ هێنانی کەلوپەل و شتی تر، لە ناوەڕاستی سابوون و نشاستە و مۆم و نوقڵ و بسکویتەکاندا خۆم دەخافڵاند و هەرچییەکی شیرینم دەست کەوتایە تامم دەکرد و لێم دەخوارد، تا ئاخرییەکەی نەخۆش کەوتم.

دواتر لە نووسینگەی دوو پزیشك بە ناوەکانی«هۆڤڵ»و«کینسی تیلێر»کە پزیشکی کۆمپانیایەکی بیمە بوون لە شەقامی«سرۆ گۆمێرتۆن»دا، دامەزرام. لە سایەی سەری سیدنییەوە ئەو کارەم دەست کەوت، چونکە ئەو تکای بۆ کردبووم. کارێکی پڕ دەرامەت بوو. بۆ وەرگرتنی نەخۆشەکان و ڕێکخستنی نۆرەکانیان و پاك و خاوێنکردنەوەی ژوورەکان دوای ڕۆیشتنی پزیشکەکان. حەفتەی دوانــزە شلینگیان پێ دەدام. لە کاری وەرگرتنی نەخۆشەکاندا توانایەکی سەیرم هەبوو“ چونکە هەموو ئەو نەخۆشانەی دەبوو لە چاوەڕوانیدا بن، بەخۆومە خەریك دەکردن. بەڵام کاتێك نۆرەی



پاك و خاوێنکردنەوەی ژوورەکان دەهات، تاقەتی کارکردم نەدەبوو و سیدنی ئەو کارەی زۆر باشتر رادەپەڕاند. بەتاڵکردنەوەی شووشەکانی میز، وەڕەزی نەدەکردم، بەڵام پاککردنەوەی پەنــجەرە بەرزە سێ مەترییەکان بەڕاستی کارێکی سەخت بوو. تا وای لێهات ژوورەکان ڕۆژ لە دوای ڕۆژ تاریکتر دەبوون و زیاتر تەپ و تۆزیان بەخۆوە دەگرت. ئاخرییەکەی بە ڕێزەوە پێیان وتم کە هێشتا منداڵم و بۆ کارکردن زۆر بچووکم و هەر بۆیە جوابیان کردم.

کاتێك ئەو قسەیەم بیست دام لە پڕمەی گریان. دکتۆر کینسی تیلێر کە ژنێکی دەوڵەمەند بوو و خانوویەکی زۆر گەورەی لە«لانکاسترگەیت»دا کڕیبوو، زگی پێم سووتا و پێی وتم کە وەك کارەکەر دەمباتەوە بۆ ماڵەوە. دڵم بەو مزگێنییە خۆشە کرایەوە. کارەکەری لە خانوویەکی دەوڵەمەندانەدا، ئەویش ئەوەندە دەوڵەمەند! !

لەو ماڵەدا زۆر خۆشم لێ دەگوزەرا چونکە هەموو کارەکەرەکان خۆشیان دەویستم. وەکوو منداڵێك هەڵسوکەوتیان لەگەڵ دەکردم. کاتێك شەوانە دەیانویست بچن بنوون، ماچێکیان دەکردم و شەوباشیان پێ دەوتم. ئەگەر چارەنووس بیهێشتایە، دەبووم بە هەمەکارەی ئەو ماڵە. ڕۆژێکیان خانم ئەمری پێ کردم سووچێکی ژێرزەمینەکە کە هەندێ سندووق و وردە کەلوپەلی تری تیا کەڵەکە بووبوو، پاك بکەمەوە و زبڵەکان فڕێ بدەمە دەرەوە و سندووقەکانیش پاك بکەمەوە. لەوێدا بۆڕییەکی ئاسنیم بینی بە درێژایی نزیکەی ٢/٥ مەتر و دەستم کرد بە فوو کردن پیایدا“ وەك بڵێی زوڕنا دەژەنم. کەواتە لە کارێکدا کە پێم سپێردرابوو، کەمتەرخەمیم کرد و هاروهاجی و گاڵتەجاڕیم کرد. ڕێك لەو کاتەدا کە خەریکی یاریکردن بووم، خانم هاتە ناوەوە و سێ ڕۆژ مۆڵەتیان دام ئەوێ بەجێ بهێڵم.

لە کتێبخانەی«و. هـ. ئسمیت» و کوڕەکانیدا، بەد و داو کارم دەکرد، بەڵام هەرکە خاوەنکارەکان زانییان زۆر منداڵم، جوابیان کردم. پاشان ڕۆژێکیش لە کارخانەی شووشەسازییدا فووم لە شووشە دەکرد. لە خوێندنگەدا دەقێکم دەربارەی فووکردن لە شووشەدا خوێندبووەوە و لام وابوو کارێکی سەرنــجڕاکێشە، بەڵام تینی گەرما حاڵی تێك دام و بە بێ هۆشی هێنامیانە دەرەوە و خستمیانە سەر تەپۆڵکەیەکی لــمەوە. هەر ئەوەش بەس بوو بۆ ئەوەی کە چیتر نزیکی ئەو جۆرە شوێنانە نەکەومەوە و تەنانەت بۆ وەرگرتنی حەقدەستی ئەو تاقە ڕۆژەشم نەچوومەوە.

دواتر، لای «ئسترکێر»ی چاپچی و کاغەز فرۆش دەستم بە کار کرد. من فشەم کردبوو و وتبووم دەتوانم مەکینەی پرێسی «وارفداڵ» بسووڕێنمەوە کە دەعبایەکی زیاتر لە شەش مەتر دەبوو. من

کارکردنی ئەو مەکینەیەم لە ژێرزەمینێکدا بینیبوو و لام وابوو کارێکی سووك و ئاسانە. ئەو ڕێکلامەم لەسەر لەوحێکدا بینیبوو کە:«پێویستمان بە لاوێك هەیە بتوانێت مەکینەی وارفدالْ هەڵسووڕێنیْ». کاتێك خاوەنکارەکە بردمیە لای ئەو مەکینە دەعبایەوە، لەبەر چاومدا وەکوو دێوەزمەیەکی زەبەلاح و بەرز وا بوو. بۆ ئەوەی بتوانم مەکینەکە هەڵسووڕێنم، دەبوایە بچمە سەر سەکۆیەك بە بەرزایی ١/٥ مەتر و کاتێکیش چوومە سەر سەکۆکە، وەك لەسەر بورجی ئیفڵدا ڕاوەستابێتم وابوو.

خاوەنکارەکە گوتی:

_ دەی بیسووڕێنە!

تڕحیو! ... من و سووڕاندنی ئەو دەعبایە! ! !

ئەویش کە دڕدۆنگییەکمی بینی، دای لە قاقای پێکەنین و گوتی:

_ تۆ هەرگیز لەسەر مەکینەی وارفداڵدا کارت نەکردووە ! ! .

وتم:

_ ئەگەر یارمەتیم بدەیت، دڵنیام دەتوانم بە ئاسانی ئەنـجامی بدەم.

«سووڕاندن» بەو مانایە بوو کە دەسکەی مەکینەکە بەرەو لای خۆم ڕابکێشم تا بکەوێتە جووڵە و بسووڕێتەوە. خاوەنکار دەسکەی مەکینەکەی نیشان دام و ئەو دەعبایەی نیو دەور سووڕاندەوە. مەکینەکە بە هاڕەهاڕ و گرمەگرمێکی سەیر دستی بە سووڕان کرد و پێم وابوو هەر ئێستاکە قووتم دەدات. ئەو وەرەقە کاغەزانەی کە لە ژێریەوە تێدەپەڕین، ئەوەندە گەورە بوون کە تەنیا یەکێکیان بەس بوو بۆ ئەوەی لە خۆی بـمئالێنێت. من بە کەوگیرێکی سپیی، وەرەقەکانم لە یەکدیی جیا دەکردەوە، پاشان قەراخەکانیانم دەقرتاند و بە دیقەتەوە دەمنانە بەر ددانەکانی مەکینەکە و لەو کاتەشدا ئەو دەعبایە ئامادە بوو بیانگرێت و قووتیان بدات و لەو لاوە بیانداتە دەرەوە. لە کۆتایی ڕۆژی یەکەمدا ئەوەندە بیرم لەوە کردبووەوە کە لەوانەیە ئەو دەعبا برسییە پێش من بکەوێت، تەواو هیلاك و ماندوو بووبووم. هەرچۆنێك بێت بە حەقدەستێکی دوانـزە شلینگ لە حەفتەیەکدا لەسەر ئەو کارەدا مامەوە.

لە خەو هەستان و ڕێگەبڕینی بەیانییانی زوو و پێش هەڵاتنی خۆر، لەو هەوا سارد و سڕەدا و هەروەها لەناو ئەو کۆڵانە تاریك و چوڵ و هۆڵانەدا، ئەویش بۆ کارکردن، ڕەهەندێکی سەرچڵیی و



ئەفسانەییشی هەبوو. لەو کاتەدا جگە لە یەك دوو تارمایی کە بۆ خواردنی نانی بەیانیی دەچوون بۆ چاخانەی «لۆکارت»، کەسی تر لەو کۆڵانەدا نەدەبینرا. خواردنەوەی چایەکی داخ لەو کەش و هەوا خۆش و گەرم و نەرمەدا، پێش دەسبەکاربوون، جۆرە خۆشی و چێژێکی بە کۆمەڵی بە هەمووومان دەبەخشی. کاری منیش لە چاپخانەدا کارێکی ناخۆش نەبوو" بێجگە لەکارێکی سەخت کە دەبوایە لە کۆتایی حەفتەدا ئەنـجامم بدایە" ئەویش شۆردنی ئەو مەرەکەبانە بوو کە تکابوونە سەر خلۆرتە گەورە و قورسە ژلاتینییەکانەوە و هەرکام لەو خلۆرتانەش زیاتر لە پەنـجا کیلۆ کێشیان هەبوو. کارەکەم باش بوو و تەحەمول دەکرا. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا سێ حەفتە دواتر تووشی نەخۆشیی«گریپ» هاتم و کەوتــمە سەر جێگا. دایکیشم سوور و پێداگر بوو لەسەر ئەوەی بگەڕێــمەوە بۆ خوێندنگە.

سیدنی تەمەنی ببوو بە شانـزە ساڵ و بە خۆشحاڵییەوە گەڕایەوە بۆ ماڵ، چونکە لە پاپۆڕێکی بازرگانیی کە لە هێڵی کەشتیوانیی «دونوان و کاسێل»دا کاری دەکرد و هاتوچۆی ئافریقای دەکرد، کاری کەڕەناژەندنیان پێ سپاردبوو. کارەکەشی ئەوە بوو کە بۆ ڕاگەیاندنی کاتی نانی بەیانی و نانی نیوەڕۆ و نانی ئێوارە و ... کەڕەناکەی بژەنێت. ئەو لە کەشتییەکی تایبەتیدا کە مەلەوانی پەروەردە دەکرد، فێری کەڕەناژەندن بووبوو و لەو کاتەشدا بە کەڵکی هات. دەبوایە مانگانە دوو لیرەی وەربگرتایە بەڵام چونکە خزمەتکردنی سێ دانە مێزی دەرەجە دوو(٢) شی لە ئەستۆدا بوو، لەوێشدا شاگردانەی وەردەگرت. بەڵێنیان پێ دابوو کە پێش حەرەکەت کردنی پاپۆڕەکە، ٣٥ شلینگ یارمەتیی پێ بدەن و بە دڵنیاییشەوە ئەو ٣٥ شلینگەی دەدا بەدایکم. بەو وەزعە خۆشەوە کە چاوەڕێــمان دەکرد، دوو ژوورمان لە نهۆمی سەرەوەی سەرتاشخانەیەك لە شەقامی«چێستر»دا بە کرێ گرت.

هاتنەوەی سیدنی لەدوای یەکەم سەفەری، ئەو توانایەی بۆ ڕەخساندین جەژنێکی بچووك بگرین، چونکە بێجگە لە مانگانەکەی خۆی، سێ لیرە شاگردانەشی وەرگرتبوو کە هەمووشی وردەپارەی زیو بوو. وابزانم لە ژیانــمدا ئەوەندە پارەم بە جارێك نەدیبوو و نەمدەتوانی دەستیان لێ هەڵگرم. مشتێکم لێ هەڵدەگرتن و دەمڕشتەوە و پاشان وردەپارەکانم لەسەر یەك دادەنان و یاریم پێ دەکردن، تا ئاخرەکەی دایکم و سیدنی لێم تووڕە بوون و گوتیان کوڕێکی هەتیمچە و سەرسواڵکەریت.

ئاخ. . چ خۆشگوزەرانییەك! چ ژیانێکی بەشکۆ! هاوین بوو و وەرزی نان شیرینیی و چلوورە ، بەڵام ئێمە هەندێ خواردنی تری شاهانەشمان دەناسی. وەرزی «شاماسیی دووکەڵدراو» و چەند جۆر ماسیی دیکە و نانی برژاو بۆ قاوەڵتوون و نان شیرینیی و نان برنـجیی بۆ بەیانییانی یەکشەمە.

سیدنی تووشی هەڵامەتێکی قورس بوو و چەندین ڕۆژ لە جێگادا کەوت. من و دایکم بەردەوام بەسەر سەریەوە بووین. ئەو کاتانە بوو کە لە خواردنی چلوورەدا زێدڕۆییمان دەکرد. من بە یەك پێنی، کاسەیەکی گەورە چلوورەم دەکڕی. کاسەکەم هەڵدەگرت دەچوومە لای چلوورەفرۆشە ئیتاڵییەکە و ئەو چەتیوەش لە دەستم تووڕە دەبوو. بۆ جاری دوەم کە دەچوومە لای، پێی گوتم ئەمــجارەیان تەشتێکی گەورە لەگەڵ خۆم بەرم! ! یەکێك لە خواردنەوە خۆشەویستەکانی ئێمە لە وەرزی گەرمی هاویندا لیمۆناد و شیر بوو. بڵقی لیمۆنادەکە کە لەناو تۆژگی شیرەکەوە هەڵدەقولان، تێکەڵەیەکی زۆر بەتام و چێژیان دروست دەکرد.

سیدنی هەندێ بەسەرهاتی خۆشی لە سەفەرەکەی بۆ دەگێڕاینەوە. دەیوت بەر لە سواربوونی کەشتی، خەریك بوو کارەکەی لە دەست بدات و ئەویش کاتێك بوو کە یەکەم کەڕەنای بۆ ڕاگەیاندنی کاتی نانی نیوەڕۆ لێ دابوو. دەنگی زڕناکەی زۆر بەرز نەبووبوو و سەربازەکانی سەر گۆڕەپانی کەشتییەکە «هوو»یان لێ کردبوو. ئەفسەری گۆڕەپان بەوپەڕی تووڕەییەوە پێی وتبوو:

_ ئەمە چ جۆرە کەڕەنا ژەندنێکە؟

سیدنی لە وەڵامدا وتبووی:

_ بە داخەوەم بەڕێز! لێوەکانم هێشتا بەو کەڕەنایە ڕانەهاتوون.

_ کەواتە پێت دەڵێم تا بە ڕێ نەکەوتووین، ئەو کێشەیە چارەسەر بکە، ئەگینا داتدەبەزێنین!

لە کاتی دابەشکردنی چێشتیشدا سەفێکی درێژ لە گارسۆنەکان دروست دەبوو کە ڕاسپاردەی خۆیان ڕادەگەیاند. بەڵام کاتێك نۆرە دەگەییە لای سیدنی، ڕاسپاردەکانی لەبیر چووبووەوە و ناچار دەبوو دیسان بڕوات و پرسیار بکاتەوە و بکەوتایەتە کۆتایی سەفەکەوە. سیدنی بۆی دەگێڕاینەوە کە ڕۆژانی یەکەم ئەو لە کاتێکدا سووپ یان ئاوگۆشتی دەبرد کە هەموو موسافیرەکان میوەی دوای چێشتیان دەخوارد.

سیدنی ئەوەندە لە ماڵەوە مایەوە تا هەموو پارەکانی خەرج بوو. بۆ سەفەرێکی تر دایانــمەرزاندبوو و دیسانەوە ٣٥ شلینگ یارمەتییان پێ دابوو کە دیارە ئەویش پارەکەی دا بە دایکم. بەڵام ئەو پارەیەش زۆری نەخایاند. سێ حەفتە لەدوای ڕۆشتنی سیدنی، پارەکەمان تەواو بوو و دەبوایە بۆ سێ حەفتەی تر چاوەڕێی هاتنەوەی بکەین. هەرچەند دایکم بەردەوام درێژەی بە کاری دوورمان



دەدا، بەڵام ئەو بڕە پارەیەی کە بە دەستی دێنا، ئەوەندە نەبوو کە بتوانین چێشتێکی گەرمی پێ بــخۆین" هەر بۆیە دیسان تووشی قەیرانێکی تازە هاتینەوە.

بەڵام من ئینسانێکی بێ مێشك نەبووم و عەقڵم تۆزێك کاری دەکرد. دایکم تەلیسێك جلی کۆنی هەبوو و کە بەیانیی شەممە پێشنیارم کرد بیانبەمە بازاڕ بیانفرۆشم، تۆزێك خەم دایگرت و گوتی ئەم جلانە بە کەڵکی هیچ نایەن و هیچ بەهایەکیان نییە. بەڵام من خستمنە ناو سەرچەفێکی کۆنەوە و چووم تا گەییشتمە«نوینگتۆن باتس». لەوێ پریاسکە بچووکەکەم لەسەر شۆستەکە پان کردەوە" پاشان خۆشم لە قەراخی جۆگەکەدا دانیشتم و لەگەڵ ئەوەیدا کە کراسێکی کۆنم بە دەستەوە گرتبوو و دەمسووڕاندەوە، هاوارم دەکرد:« های...کێ ئەم کراسە دەکڕێت بە یەك شلینگ، بە شەش پێنس، بە سێ پێنس، بە دوو پێنس؟...». لەوەش دەترسام ئەگەر تەنانەت بڵێم یەك پێنس کەس لێمی نەکڕێت! خەڵك ڕادەوەستان، بە سەرسووڕمانەوە لێم دەڕوانین و پاشان دەیاندا لە قاقای پێکەنین و ملی ڕێگەیان دەگرتەبەر. وردەوردە هەستم بە بێ تاقەتیی دەکرد، بەتایبەت کاتێك کە چەند کەسێك لەناو زێڕفرۆشییەکی بەرانبەری کەلوپەلەکەمدا دانیشتبوون و لە پشت جامــخانەی دووکانەکەوە چاوێکیان کردبووە چووار چاو و سەیری منیان دەکرد. بەڵام من وەك نە بام دیبێ و نە بۆران. دواجار دوای ماوەیەك هاوار کردن و چاوەڕێکردن، جووتێك پێڵاوم فرۆشت بە شەش پێنس کە زۆریش کۆنە نەبوون. بەڵام هەرچی زیاتر دەمامەوە، زیاتر هەستم بە بێ تاقەتی دەکرد. دوای ماوەیەك خاوەنی زێڕفرۆشییەکە لێم نزیك بووەوە بە شێوەزمانێکی تۆخ کە لە ڕووسی دەچوو، لێی پرسیم کە لە کەیەوە کۆنەفرۆشیی دەکەیت؟ هەرچەند دەموچاوێکی زۆر جیددیی هەبوو بەڵام لە جۆری قسەکردنیدا وام هەست دەکرد کە گاڵتەم پێ دەکات و منیش زۆر بە جیددی وەڵامم دایەوە کە تازە دەستم پێ کردووە.

بە هێواشی ڕۆیشت بۆ لای هاوڕێکانی تری کە لە پشت جامــخانەی دووکانەکەوە سەیریان دەکردم. ئیتر بەس بوو. پێم وابوو کاتی ئەوە هاتووە پریاسکەکەم کۆ بکەمەوە و بگەڕێــمەوە بۆ ماڵەوە. کاتێك بۆ دایکم گێڕایەوە کە جووتێك پێڵاوم فرۆشتووە بە شەش پێنس، لێم تووڕە بوو و گوتی:«ئەوە چ کارێك بوو کردت! ئەو پێڵاوانە زۆر باش و جوان بوون و ڕەنگە زیاتر لەوەیان بکردایە! ».

بەو وەزعەی کە ئێمە هەمانبوو ئیتر نیگەرانی دانی کرێی خانووەکەشمان نەبووین. ئەو کێشەیە زۆر بە ئاسانی و بەو شێوەیە چارەسەر کرا کە ئەو ڕۆژەی کە بەرپرسی کۆکردنەوەی کرێ خانووەکان

هاتبوو، ئێمە لە دەرەوە بووبووین. وە چونکە کەلوپەلەکەشمان بەهایەکی ئەوتۆی نەبوو، ئەگەر بـمانویستایە عارەبانەیەك بگرین و بیانگوێزینەوە، کرێکەی زیاتر لە بەهای کەلوپەلەکە خۆی دەبوو" هەربۆیە بەبێ کەلوپەل دیسان گەڕاینەوە بۆ«پاونال تراس»" خانووی ژمارە «سێ» مان.

هەر لەو سەردەمەدا بوو کە لەگەڵ پیرەمێردێك و کوڕەکەیدا کە لەناو گەوڕە کۆنەکانی پشت شەقامی کنینگتۆندا کاریان دەکرد ئاشنا بووم. ئەو باوك و کوڕە کایەکڵەی منداڵانیان دروست دەکرد و ﴿فرۆشیاری﴾ گەڕۆك بوون. لە بنەڕەتدا خەڵکی «گلاسکۆ» بوون و شتە دەسکردەکانیشیان شار بە شار دەگێڕا. سەربەست و بێ کۆت و بەند بوون و من ئێرەییم بە ژیانیان دەبرد. کارەکەیان سەرمایەی زۆری نەدەویست، هێندەی کە تەنانەت دەیانتوانی بە یەك شلینگ کارەکەیان جێبەجێ بکەن. مەقەبای کەوشیان بە خۆڕایی لە دووکانی پێڵاوفرۆشەکاندا کۆ دەکردەوە و هەروەها خاکەمشاریشیان بە خۆڕایی دەست دەکەوت کە بە کەڵکی بەستەبەندیی کردن دەهات. هەموو سەرمایەکەیان بریتی بوو لە:

کڕینی یەك پێنی چەسپ، یەك پێنی چێو، دوو پێنی بەن، یەك پێنی کاغەزی رەنگیی تایبەت بە چەژنی نۆئێل و سێ پاکەت پوولەکەی رەنگیی بریقەدار هەرکام بە دوو پێنی. بە یەك شلینگ دەیانتوانی حەوت دووجین کەشتیی دروست بکەن و هەرکامیان بە یەك پێنی بفرۆشن. لاشەی کەشتییەکە لە مقەبای کەوش دروست دەکرا کە بە تەختاییەکی مقەباییەوە دەدوورا. چەسپیان لە تەختاییەکە دەدا و ئاردەمشاریان لەسەر دەڕشت. بورجەکانیان بە بەنی پوولەکە لێدراو دەبەستەوە و هەندێ ئالای شین و زەرد و سووریان بە بورجەکانەوە دەلکاند. ئالاشیان بە بەر و دوای کەشتییەکەوە دەلکاند. کاتێك نزیکەی سەد دانە لەو کەشتییانە لە بەساتێکدا بۆ فرۆش دادەنران، دیـمەنێکی جوان و سەرنـجڕاکێشیان دروست دەکرد و مشتەرییان بەرەو لای خۆیان رادەکێشا و بەئاسانی دەفرۆشران.

کە لەگەڵیاندا ئاشنا بووم، منیش دەستم کرد بە یارمەتیدانیان بۆ دروستکردنی کەشتیی و زۆری نەخایاند کە فێری ئەو کارە بووم. کاتێك ئەو باوك و کوڕە لەو گەڕەکەوە چوون، من بۆ خۆم دەست بە کار بووم. بە سەرمایەیەکی کەمی شەش پێنی و هەروەها ئەو تۆقلانەی کە بە هۆی بڕینی مقەباوە لەسەر دەستم هەڵیاندابوو، توانیم لە ماوەی حەفتەیەکدا سێ دووجین کەشتی دروست بکەم.

بەڵام لەو ژوورە بچووکەی کە تیایدا دەژیاین، ئەوەندە جێگامان نەبوو کە هەم دایکم کاری تیا بکات و هەم منیش پریاسکەکەم پان بکەمەوە" لە لایەکی تریشەوە دایکم ئازاری دەبینی لە بۆنی



ئەو چەسپەی کە من دەمکولاند و دەفری چەسپەکەش - کە قسەی خۆمان بێت هەمیشەش لەناو ژوورەکدا پرژ و بڵاو بوون- مەترسییەکی دایـمی بوو بۆ جاکەتە کەتانییەکان. لەبەر ئەوەی کە داهاتی من کەمتر لە داهاتی دایکم بوو، کەواتە کارەکەی ئەو واجبتر بوو، هەر بۆیە من ناچار بووم دووکانی کەشتی سازییەکەم دابـخەم.

ماوەیەك بوو باوەگەورەمم نەبینیبوو. ئەو لە پارەکە بەملاوە تەندروستیی زۆر باش نەبوو. دەستەکانی بە هۆی نەخۆشیی نقرسەوە رواڵەتیان گۆڕابوو، هەر بۆیە نەیدەتوانی وەکوو پێویست کارەکەی کە پینەچێتیی بوو راپەڕێنێت. پێشتر هەرکاتێك بیتوانیایە دوو سێ شلینگێك یارمەتی دایکمی دەدا. هەندێ جاریش داوەتی نانی ئێوارەی دەکردین و چێشتێکی پێ دەدایـن بەناوی «ڕاگۆی هەژاران». ئەم چێشتە تێکەڵێك بوو لە یەوی رەش و پیازی کولاو لەناوشیردا کە بڕێك خوێ و بیبەریشیان تێ دەکرد. لە شەوانی زستاندا ئەوە باشترین چێشتێك بوو کە هێزی خۆڕاگرتن لە بەرانبەر سەرمای زستانی پێ دەبەخشین. لەو کاتانەدا کە زۆر منداڵ بووم، باوەگەورەم بە پیرەمەردێکی ناوچاوگرژ و تووڕە دەهاتە بەرچاوم چونکە هەمیشە رەخنەی لە جۆری رەفتار یان رێزمانی من دەگرت. بە هۆی هەر ئەو پێکدادانە بچووکانەوە باوەگەورەم وردەوردە لە زەینمدا وەك مرۆڤێکی خراپ و قێزەون هەڵکۆڵرابوو. بەڵام لەو کاتەدا لە نەخۆشخانەدا کەوتبوو و بە دەس ئێش و ئازاری رۆماتیسمەوە دەینالاند و دایکیشم هەموو رۆژێك سەردانی دەکرد. دیارە ئەو سەردانانە قازانـجیشیان هەبوو چونکە دایکم زۆربەی جار بە توورەیەکی پڕ لە هێلکەوە دەگەڕایەوە و بۆ ئەو سەردەمە قات و قڕییەی کە ئێمەی تێدا دەژیاین، خواردنێکی شاهانە بوو. کاتێك دایکم نەیدەتوانی خۆی بچێت بۆ ئەوێ، منی دەنارد، و من زۆر سەرم دەسووڕما لەوەی کە باوەگەورەم بەڕاستیی میهرەبان بوو و بە بینینی منیش خۆشحاڵ دەبوو. پەرستارەکانیش زۆریان خۆش دەویست. رۆژانێك دواتر بۆی دەگێڕامەوە کە لەگەڵ پەرستارەکاندا هەندێ قسەی خۆشی کردووە و پێیانی وتووە کە هەرچەند رۆماتیزم تەنگی پێ هەڵچنیوە، بەڵام بە تەواوەتی لە کار نەکەوتووە! ! ئەو هاش و هووش و فشقیاتە پەرستارەکانی دەخستە پێکەنین و حەزیان لەو جۆرە قسانە بوو. کاتێك رۆماتیزمەکەی هێور دەبووەوە، لە چێشتخانەی نەخۆشخانەکەدا کاری دەکرد و هێلکەکانیش لەوێوە دەگەییشتنە لای ئێمە. ئەو رۆژانەی کە دەچووینە سەردانی، زۆربەی جار لەسەر تەختەکە بوو و بە بێ ئەوەی کە کەس ئاگای لێ

بێت، توورەکەی هێلکەکانی لە ژێر بەتانییەکەوە دەردێنا و دەیدا بە من و منیش دەمتەپاندە ناو ئەو پانتۆڵە مەلەوانییەی کە لە بەرمدا بوو.

ئێمە چەندین حەفتەمان بەو هێلکانە تێ پەڕاند و بە هەموو جۆرێکەوە لە هێلکەوڕۆنەوە بگرە تا کولاوی لەگەڵ شیر و...دروستمان دەکردن. هەرچەند باوەگەورەم پێی وتم کە پەرستارەکان هەموویان وەکوو هاوڕێی وان و کەم تا کورتێك لە مەسەلەی ناردنە دەرەوەی هێلکەکان ئاگادارن بەڵام من هەمیشە لە کاتی چوونەدەرەوەم لە نەخۆشخانەوە، ترسی ئەوە دایدەگرتم کە نەکا لە پڕێکدا لەسەر تەختاییە ساف و لووسەکەی هۆڵەکەدا بـخلیسکێم یان پانتۆڵە فوو تێکراوەکەم ببینن و گومانم لێ بکەن! سەریشم لەوە دەسووڕما کاتێك دەمویست بڕۆم ، کەس دیار نەبوو و پەرستارەکان ون دەبوون. بەڕاستی چ ڕۆژێکی خەماوی بوو ئەو ڕۆژەی کە باوەگەورەم چاك بووەوە و نەخۆشخانەی بەجێ هێشت.

شەش حەفتە دەبوو سیدنی ڕۆشتبوو و نەگەڕابووەوە. سەرەتا دایکم زۆر نیگەران نەبوو بەڵام کاتێك حەفتەیەکی تریشی پێ چوو و هیچ هەواڵێکمان لێی نەبوو، نامەیەکی بۆ نووسینگەی کەشتیوانیی«دونوال و کاسێل»نووسی و ئەو وەڵامەیان دایەوە کە سیدنییان بە هۆی تووشبوون بە نەخۆشیی ڕۆماتیسمەوە لە«کاپ»دا دابەزاندووە و لە نەخۆشخانەی ئەوێدا چاودێریی دەکرێت. ئەو هەواڵە دایکمی نیگەران کرد و تەندروستیی خستە مەترسییەوە. سەرەڕای ئەوەش بەردەوام درێژەی بە کاری دوورمان دا و منیش بەخت یارم بوو و کارێکم دۆزییەوە. کارەکەشم ئەوە بوو کە دوانیوەڕۆیان کە لە خوێندنگە دەهاتـمەوە، بنەماڵەیەکم فێری سەما دەکرد و حەفتەیەك پێنج شلینگم وەردەگرت.

هەر لەو کاتانەشدا بوو کە بنەماڵەی«مەك کارتی» هاتن و لە شەقامی کنینگتۆندا گیرسانەوە. خانـمی مەك کارتی کە ژنێکی ئیرلەندیی بوو و سەردەمانێك ئەکتەری شانۆ بووە، هاوڕێی دایکم بوو. ئەو مێردی بە پیاوێك بە ناوی«واڵتەر مەك کارتی» کردبوو کە شارەزای ژمێریاری بوو. بەڵام کاتێك دایکم ناچار بوو واز لە کاری شانۆ بهێنێت، ئێمە خانـم و ئاغای مەك کارتیمان ون کردن و ئیتر نەمانبینینەوە تا حەوت ساڵ دواتر کە هاتن و لە«ڤاڵکێت مەنشێنـز»دا نیشتەجێ بوون کە جوانترین بەشی شەقامی کنینگتۆن بوو.

کوڕەکەیان واتە«والی مەك کارتی»هاوتەمەنی من بوو. هەرچەند هەردووکمان منداڵ بووین بەڵام حەزمان دەکرد دەوری مرۆڤە گەورەکان ببینین. بە شێوەیەك خۆمان دەردەخست کە وەك بڵێی



ئەکتەری شانۆین و جگەرەی خەیاڵیمان دەکێشا و لەناو کاسکەی خەیاڵیدا بۆی پاڵ دەکەوتین و دایك و باوکیشمان تەواو بەو یارییانەی ئێمە پێ دەکەنین و چێژیان لێ دەبینی.

لەو کاتەوەی کە مەك کارتییەکان هاتبوون بۆ ڤاڵکێت مەنشێنـز، دایکم بە دەگمەن چاوی پێ دەکەوتن بەڵام لە نێوان من و والیدا هاوڕێیەتییەکی پتەو درووست بووبوو. هەر کە خوێندنگە دادەخرا، بەڕاکردن دەگەڕامەوە ماڵەوە و پرسیارم لە دایکم دەکرد کە ئاخۆ کاری دەرەوەی هەیە بۆی ئەنـجام بدەم یا نا، پاشان بەڕاکردن دەچووم بۆ ماڵی مەك کارتییەکان. لەوێ لەگەڵ والی لە پشت بیناکەدا شانۆگەرییمان دەکرد و چونکە من هەمیشە خۆم دەرهێنەر بووم، ڕۆڵی خیانەتکارەکانم بۆ خۆم دادەنا، چونکە بە پێی غەریزە دەمزانی کە دەوری ئەوان ﴿خیانەتکاران﴾ زیاتر لە دەوری قارەمانەکان سەرنجڕاکێشن. ئەوەندە یاریـمان دەکرد کە کاتی نانی نیوەڕۆی والی دەهات. زۆربەی جار منیشیان داوەت دەکرد و منیش ئەو زرنگییەم دەکرد کە هەمیشە لە کاتی خواردنی نانی نیوەڕۆدا لە ماڵیاندا بم. بەڵام هەندێ جار ئەو تەڕدەستییانەم سەریان نەدەگرت و دەبوایە بە ئاخ و داخەوە بگەڕێـمەوە بۆ ماڵ! دایکم هەر کاتێك دەگەڕامەوە بۆ ماڵەوە خۆشحاڵ دەبوو و بۆ نانی نیوەڕۆ شتووکەیەکی بۆ دروست دەکردم. بۆ نـموونە نانی لەناو چەورییدا سوور دەکردەوە یان یەکێك لە هێلکەکانی باپیرەمی لەگەڵ چایەکدا پێ دەدام. دایکم کتێب یان گۆڤاری دەخوێندەوە، یان هەردووکمان لەبەردەم پەنـجەرەدا دادەنیشتین و ئەویش بە قسە خۆشەکانی و هەروەها ئەو قسە پێکەنیناوییانەی کە سەبارەت بە ڕێبوارەکان﴿ی ناو کۆڵانەکە﴾ دەیکرد، دەیـخستمە پێکەنینەوە. «ئەگەر ئەمڕۆ بەخت یاری بێت، کالسکەیەکی دوو ئەسپەی نیوداش (دەسەدوو) بۆ خۆی و دەزگیرانەکەی دەکرێت».

پاشان پیاوێك تێ دەپەڕی کە هێواش هێواش و ساردوسڕ و شل و شپرێو بە ڕێگەدا دەڕۆییشت. دایکم دەیوت:«ئاها...! ئەمەیان خەریکە دەچێتەوە بۆ ماڵ و خێزانەکەی بۆ نانی نیوەڕۆ«ڕاگۆ»ی لەگەڵ گێزەری کێویی بۆ لێ ناوە و دیارە هیچ حەزیشی لەو چێشتە نییە.

پاشان یەکێکی تر تێدەپەڕی کە زۆر لەخۆباییانە و بە فیزەوە ڕێگەی دەبڕی. دایکم دەیگوت:«فەرموو...! ئەویش لاوێکی لە ئۆتوو دراو! بەڵام ئەو کابرایە جارێك هەموو بیری لە لای ئەو کونەیە کە لە لاقنگی پانتۆڵەکەیدایە. »

پاشان، کەسێك تێ دەپەڕی کە وەکوو تیر وابوو. دایکم دەیوت:«ئەم کابرایە «مسهل »ی خواردووە و وا دیارە «مسهل»ەکەشی زۆر کاریگەر بووە! . منیش بەو قسانەی دایکم ئەوەندە پێدەکەنیم خەریك بوو دەبوورامەوە.

حەفتەیەکی تریش تێپەڕی و هیچ هەواڵێکمان لە سیدنی پێ نەگەیشتبوو. ئەگەر من گەورەتر بوومایە و زیاتر دەرکم بەو نیگەرانییەی دایکم بکردایە، دەمزانی بارودۆخەکە چۆنە. یان سەرنجی ئەوەم بدایە کە چەند رۆژێکە دایکم بەردەوام لە پشت پەنجەرەکەوە دادەنیشێت بەڵام لەداڵغە دایە و بیری لە شوێنێکی ترە و کارەکانی ماڵەوەش راناپەڕێنێت و زۆر پەشێو و خەمبارە. هەروەها منیش نیگەران دەبووم لەو کاتەیدا کە کراس فرۆشەکان وردەوردە بیانوو لە کاری دوورمانی دایکم دەگرن و ئیتر کراسی پێ نادەن بدوورێت. هەروەها لەو کاتەیدا کە لەبەر دواکەوتنی دانەوەی قستی مەکینەی دوورمانەکەی، مەکینەکەیان لێ سەندۆتەوە و منیش ئەو پێنج شلینگەی کە بۆ فێرکردنی سەما وەرم دەگرت، ئیتر وەرم نەدەگرت. هەروەها لەوە تێ دەگەیشتم کە بەو هەموو داماویی و چارەڕەشییەوە دایکم هێشتا خۆڕاگرە و مێشێکیشی لێ میوان نییە.

کتوپڕ خانمی مەك کارتی کۆچی دوایی کرد. ماوەیەك بوو بە دەست نەخۆشییەکەوە دەیناڵاند و تەندروستیی خستبووە مەترسییەوە و دواجار چۆکی پێ دادا و مرد. لەو کاتەدا بیرۆکەیەکم بە مێشکدا هات. بە خۆمم وت:«چەند باش دەبوو ئەگەر ئاغای مەك کارتی دایکمی دەس بگرتایە! من و والیش کە زۆر پێکەوە برادەر بووین! جیا لەوەش ئەوە باشترین چارەسەر بوو بۆ هەموو ئەو کێشە و گرفتانەی کە دایکم تووشیان بووبوو».

ماوەیەك دواتر کە خانمی مەك کارتی بە خاك سپێردرا، من لەو بارەوە لەگەڵ دایکمدا قسەم کرد.

_ دایە! تۆ دەبێ کارێکی وا بکەیت کە زیاتر چاوت بە ئاغای مەك کارتی بکەوێت. من مەرجت لەگەڵدا دەکەم کە ئەو خۆشحاڵ دەبێ لەوەی کە لەگەڵ تۆدا ژیانی هاوبەش پێك بهێنێت.

دایکم بە زەردەخەنەیەکی بێ هێزەوە گوتی:

_ ئاخ...رۆڵە گیان لێگەڕی با ئەو پیاوە داماوە برێك بحەسێتەوە.

_ دایە! تۆ ئەگەر تۆزێك بە خۆت رابگەیت و جلی جوان لەبەر بکەیت و وەك جاران خۆت جوان بکەیت و خۆت برازێنیتەوە، دڵنیام کارەکە سەر دەگرێت” بەڵام تۆ هیچ تەقەلایەك نادەیت. تۆ هەمیشە لەناو ئەم ژوورە چڵکنەدا دادەنیشیت و لە خۆت بایی دەبیت.



ئەی دایکە داماوەکەم...! ئێستا چەند پەشیمانم کە ئەو کاتە ئەو قسانەم لەگەڵ دەکرد! من ئاگام لەوە نەبوو کە نەبوونی خواردن و کەمبوونی ڤیتامین و شتە پێویستەکانی تری لەش، ئاوها کز و لاوازی کردبوو. بەڵام بەو حاڵەشەوە رۆژی دواتر چاوم لێ بوو کە بە هەوڵ و تەقەلایەکی یەکجار زۆرەوە خۆی بە کاری ماڵدارییەوە خەریك کردووە.

کاتی پشووی هاوینەی خوێندنگە بوو. کەواتە بڕیارم دا هەر لە بەیانیی زووەوە بڕۆم بۆ ماڵی مەك کارتییەکان. ئەو رۆشتنانەشم تەنیا لە بەر ئەوە بوو کە لە نەگبەتیی و نەهامەتیی ئەو خانووە بچووکە رزگارم بێت. ئەوان منیان داوەت کردبوو کە بۆ نانی نیوەڕۆ لە لایان بمێنمەوە، بەڵام دەنگێکی دەروونیی پێی دەوتم کە دەبێ بگەڕێمەوە بۆ لای دایکم. کاتێك گەییشتمە پاونێل تراس، منداڵانی گەڕەکەکە رایان گرتم و کیژۆڵەیەك پێی وتم:

_ دایکت شێت بووە!

_ بە چرپەوە وتم:

_ چی دەڵێی؟ مەبەستت لەو قسەیە چییە؟

منداڵێکی تر گوتی:

_ راست دەکات. دایکت شێت بووە. ئەمڕۆ کەوتۆتە ئەم کۆڵانەوە و لە دەرگای هەموو ماڵەکانی دەدا و بە هەر ماڵێك پارچە خەڵووزێکی دەدا و دەیوت کە ئەوە دیاریی لەدایکبوونی منداڵەکەتانە. ئەگەریش باوەڕ ناکەن لە دایکم بپرسن.

بە بێ ئەوەی لەوە زیاتر گوێ لە قسەکانیان بگرم، بە پەلە خۆم گەیاندە ماڵەوە” هەر چوار پلیکانەم دەکردە یەکێك و دەرگای ژوورەکەمانم کردەوە. چرکەیەك جووڵەم نەکرد تا هەناسەم بێتەوە سەر خۆی و بە وردی لە سیمای دایکم ورد بوومەوە. دوانیوەڕۆی رۆژێکی هاوین بوو و هەوا یەکجار گەرم و قورس و خنکێنەر بوو. دایکم وەکوو جاران لەبەر پەنجەرەکەدا دانیشتبوو. بە ئارامی سووکە ئاوڕێکی لێ دامەوە تا سەیرم بکات و بینیم کە زۆر بزرکاو و خەمبارە.

بە دەنگێکی مەیلەو هاوارکردن وتم:

دایە!

بە بێ هێزییەوە گوتی:

_ ها، چییە! چ بووە!

ڕام کرد و لە تەنیشتیدا چۆکم دادا، پاشان سەرم بردە ناو چینی کراسەکەی و دام لە پڕمەی گریان.

دایکم دەستی بە سەرمدا هێنا و لەسەرخۆ گوتی:

_ ئاخ...چی بووە! چی رووی داوە!

بەدەم گریانەوە وتم:

_ دایە تۆ تەندروستیت باش نیە، وا نییە!

_ بە دەنگێکی دڵگەرمکەرەوە گوتی:

_ نا...زۆریش باشم.

بەڵام بە حاڵەتێکی ئەوەندە تەماوییی و بە شێواویی ئەو قسەیەی کرد کە من وتم:

نا ! نا ! وابزانم تۆ دەرگای ماڵی خەڵکت لێداوە و...(چونکە نەمدەتوانی قسەکەم تەواو بکەم، دیسان دام لە پرمەی گریان).

بە چرپەوە گوتی:

_ بە دوای سیدنیدا دەگەڕام. لێیان شاردوومەتەوە.

ئەو کاتە زانیم ئەو منداڵانە هەرچییەکیان وتبوو راست بوو. وتم:

_ ئاخ...دایە! توخوا ئاوا قسە مەکە! تکات لێ دەکەم. ئارام بەو دان بە خۆتدا بگرە تا بڕۆم پزیشکێك بێنم.

ئەویش بەدەم دڵدانەوەمدا گوتی:

_ ئەم مەك کارتیانە دەزانن سیدنی لە کوێیە و لە منیان شاردۆتەوە.

_ دایە تکات لێ دەکەم با بڕۆم پزیشکێك بێنم!

هەستام و چووم بەرەو دەرگاکە.

ئەو بە ناڕاحەتییەوە گوتی:

_ بۆ کوێ دڕۆی؟

_ دەچم دکتۆرێك بێنم. زۆرم پێ ناچێت.

ئەویش بەبێ ئەوەی کە وەڵامم بداتەوە بە نیگایەکی دڕدۆنگەوە لێی دەڕوانیم. لە پلیکانەکان هاتــمە خوار و چوومە لای خاوەن ماڵەکەمان و وتم:

_ من دەبێ دەسبەجێ بڕۆم دکتۆرێك بێنم. حاڵی دایکم باش نییە.



خاوەن ماڵ گوتی: دکتۆرمان بانگ کردووە.

پزیشکی گەڕەك، پیرەمێردێکی نێوچاوان تاڵ و تووڕە بوو. پاش ئەوەی کە قسەی خاوەن ماڵەکەمانی خستە پاڵ قسەی منداڵەکان و پێکەوە هەڵی سەنگاندن، بە خێرایی دایکمی پشکنی و دواجار گوتی:

_ ئەم ژنە شێتە، دەبێ لە شێتخانە بـکەوێت.

ڕاپۆرتێکیشی نووسی. لەو ڕاپۆرتەدا جیا لەو شتانە، ئەوەش نووسرابوو کە دایکم بە هۆی نەبوونی خواردنەوە تووشی کێشە بووە و دکتۆرەکە ئەوەشی پێ گوتم کە مەبەستی لەو قسەیە ئەوەیە کە ئەو وەکوو پێویست خواردن ناخوات.

ژنە خاوەن ماڵ بۆ دڵدانەوەی من گوتی:

_ لەوێ حاڵی باشتر دەبێت، چونکە بە قەدەر پێویست خواردنی دەدەنێ.

یارمەتیشی دام تا کەلوپەلەکانی دایکم کۆ بکەمەوە و جلەکانیشی لەبەری کەم. دایکم ڕێك وەکوو منداڵێك گوێڕایەڵ بوو. ئەوەندە لاواز بوو کە هیچ هێز و ئیرادەیەکی نەمابوو. لە کاتێکدا ماڵمان بە جێ هێشت کە دراوسێکان و منداڵەکان لەبەر دەرگاکانیاندا کۆ بووبوونەوە و بە نیگایەکی سەرسووڕمانانەوە سەیریان دەکردین.

شێتخانە هەزار و پێنج سەد مەتر لەولاتری ماڵمانەوە بوو. دایکم لە کاتی ڕێ کردندا وەکو ژنێکی مەست، لەتری دەبردەوە و چەند جارێك بە هۆی لاوازییەوە خەریك بوو لە زەویی بدات، بەڵام من دەمگرتەوە. هەتاوی هەڵدڕاوی دوانیوەڕۆ، بێ بەزەییانە هەموو لایەکی روون دەکردەوە و بارودۆخەکەی ئێمەی بۆ هەموان ئاشکرا دەکرد. کەسانێك کە لەناو ڕێگەدا پێمان دەگەییشتن پێیان وابوو دایکم مەستە، بەڵام لەبەر چاوی مندا هەموو ڕێبوارەکان لە تارماییەك دەچوون کە لە خەوندا دەمبینین. دایکم قسەی نەدەکرد بەڵام وەك بڵێی دەزانێت بۆ کوێ دەچین و بۆچی پەلەش دەکەین کە زووتر بگەینێ. لەناو ڕێگەدا هەوڵم دا دڵنیای بکەمەوە کە هیچ نییە بەڵام ئەویش تەنیا بزەیەکی دەهاتە سەر لێوی و هیچی تر" چونکە لەوەش لاوازتر بوو قسە پێ بکرێ.

کە گەییشتینە شێتخانە، پزیشکێکی لاو دەستی دایکمی گرت و دوای ئەوەی ڕاپۆرتی پزیشکەکەی پێشتری خوێندەوە، بە ئارامی گوتی:

_ باشە، خانــمی چاپلین، تکایە لێرەوە تەشریف بێنن!

دایکم بە قسەی کرد. بەڵام لەو کاتەدا کە پەرستارەکان دەیانبرد، ئاوڕێکی دایەوە و تازە زانیبووی کە لە من جیا بۆتەوە.

منیش هەوڵم دەدا خۆم وەك کەسێکی شاد دەربــخەم و هاوارم کرد:

_ دایە...! بەیانی دەتبینمەوە!

ئەویش هێشتی لەگەڵ خۆیاندا بیبەن و سووکەنیگایەکی پڕ لە دڵەڕاوکێی لێ کردم. کاتێك لەبەرچاوم ون بوو، پزیشکەکە رووی لەمن کرد و گوتی:

_ تۆ چیت بەسەر دێت بچکۆل؟

من چونکە رقم بوو لە خوێندنگەکانی هەژارخانە، بە ئەدەبەوە وتم:

_ بەڕێز، دەڕۆم لەگەڵ پوورمدا دەژیم.

کاتی گەڕانەوەم لە شێتخانەوە، ئەوەندە خەم و خەفەتم خواردبوو گێژ و کاس بووبووم. بەڵام لە هەمان کاتیشدا تۆزێك هێور بوومەوە چونکە دەمزانی دایکم لە نەخۆشخانەدا ئیسراحەت بکات باشترە لەوەی کە لەناو ئەو ژوورە تەنگ و تاریکەدا دانیشێت و هیچیشی بۆ خواردن دەست نەکەوێت. بەڵام من ئەو نیگا دڵتەزێنەی کە لە کاتی بردنیدا لە منی کرد، هەرگیز فەرامۆش ناکەم. بیرم لە هەموو ئەو شتانە دەکردەوە کە دایکمی لە لام خۆشەویست دەکرد، بیری شادیی و بەکەیفبوونی، سۆز و خۆشەویستییەکەی" دەکەوتــمەوە بیری ئەو تارماییە هیلاك و ماندووەی کە بەو پەڕی هیلاکییەوە لە کۆڵانەکەدا رێی دەکرد و هەمیشە خەمۆك و خەمبار بوو جگە لەو کاتانەی نەبێت کە منی دەبینی بەرەو رووی دەچم و خۆم دەهاوێشتە ئامێزیەوە. دێتەوە بیرم کە چۆن لەو کاتانەدا دەموچاوی دەگۆڕدرا و چۆن بزە دەکەوتە سەر لێوانی و منیش بە تەماعێکی زۆرەوە چاوم دەبڕیە ئەو توورەکە کاغەزییەی کە پێی بوو و هەمیشە لەو شیرینییە بچووکانەی تێدا بوو کە بۆ من و سیدنی دەهێنان. تەنانەت ئەو بەیانییەش کە نوقڵی بۆ کڕیبووم و دایبوو پێم و من هێشتا بە ئەژنۆکانیەوە نووسابووم و دەگریام.

لە شێتخانەوە یەکسەر نەگەڕامەوە بۆ ماڵەوە چونکە نەمدەتوانی. بەرەو بازاڕی «نوینگتۆن باتس» بەڕێ کەوتم و تا دەمەدەمی ئێوارە سەیری جامــخانەی دووکانەکانم کرد. دواجار کاتێك کە گەڕامەوە بۆ خانووە بچووکەکە، بۆنی بۆشاییەکم هەست پێ دەکرد و بۆنی لۆمەم دەبیست. تەشتێکی نیوە ئاو لەسەر کورسییەکدا بوو. دوو دانە لە کراسەکانی من و ژێرکراسییەکی دایکمی تێدا



خووسێنرابوو. لەناو ماڵەکدا دەستم بە گەڕان کرد. لە دۆڵابەی تایبەتی خواردەمەنییەکاندا بێجگە لە پاکەتێکی نیوەی چایی، هیچم نەدۆزییەوە. لەسەر سۆبەکە، جانتای پارەی دایکمم بینییەوە کە سێ وردەپارەی نیو پێنیی تێدا بوو و دەستە کلیلێك و چەند بەڵگەنامەی ئەو خاوەن قەرزانەی کە پارەیان بە قەرز دابوو﴿بە دایکم﴾. لە گۆشەی مێزەکەدا هێشتا ئەو نوقڵانە مابوونەوە کە دایکم پێی دابووم" لەوێشدا نەمتوانی خۆم رابگرم و دام لە پڕمەی گریان.

لەبەر ئەو هەموو رەنج و ئازارەی کە چێشتبووم، ئەو شەوە چوومە خەوێکی قورسەوە. بەیانیی کە لە خەو هەستام چونکە زۆر شێواو و دڵتەنگ بووم، بە تەواوەتیی لە ژوورەکەدا هەستم بە نەبوونی شتێك دەکرد. وەك بڵێی هەتاویش کە بەرەپێی ژوورەکەی نوقمی رووناکیی کردبوو، هەواڵی ونبوونی دایکمی پێ بوو. برێك دواتر ژنی خاوەن ماڵ لە پلیکانەکانەوە سەرکەوت و هات بۆ لام و پێی وتم تا کاتێك کە کرێچیی تازەی بۆ نەهاتووە دەتوانی لەم ژوورەدا بـمێنیتەوە و ئەگەریش پێویستت بە شتێك بۆ خواردن هەبوو دەتوانی لێم داوا بکەیت. سوپاسم کرد و پێم وت هەر کاتێك سیدنی برام هاتەوە هەموو قەرزەکانــمان دەداتەوە. بەڵام زۆر شەرمنتر لەوە بووم کە داوای خواردنی لێ بکەم.

بە پێچەوانەی ئەو بەڵێنەی کە دابووم، رۆژی دواتر نەچووم بۆ سەردانی دایکم. من نەمدەتوانی ئەو کارە بکەم چونکە بەڕاستیی دیتنی ئەو لەو حاڵەتەدا تێکی دەدام و دەیشڵەژاندم. بەڵام ژنە خاوەن ماڵ چاوی بە پزیشکەکە کەوتبوو و پزیشکەکە پێی وتبوو کە دایکمیان گواستۆتەوە بۆ شێتخانەی«کین هیل». ئەو هەواڵە خەمناکە تۆزێك ویژدانی ئاسوودەکردم، چونکە شێتخانەی کین هیل زیاتر لە سێ کیلۆمەتر لە ئێمەوە دوور بوو و منیش هیچ ﴿سەیارە یان شتێکی تر﴾م لەبەر دەستدا نەبوو پێی بچم بۆ ئەوێ. لەوانە بوو سیدنی بەو زوانە بگەڕێتەوە و ئینجا هەردووکمان پێکەوە دەچووین بۆ سەردانی دایکمان. تا چەند رۆژێك لە خزم و دۆستان کەسم نەبینی و هیچیشم بۆ کەس باس نەکرد.

بەیانییان زوو بە دزییەوە لە ماڵ دەچوومە دەرێ و تا ئێوارە لە دەرەوە دەبووم. هەمیشەش دەمتوانی لە شوێنێکدا شتێك بۆ خواردن پەیدا بکەم. جیا لەوەش نەخواردنی ژەمێك، شتێکی ئەوەندە سەخت و ئازاردەر نییە. رۆژێکیان ژنە خاوەن ماڵ لە کاتێکدا ناکاوگیری کردم کە بە نووکەپێ لە پلەکانەوە دەهاتــمە خوارێ و لێی پرسیم کە ئاخۆ سۆحانەت خواردووە یان نا. منیش سەرم لەقاندەوە. لەو کاتەدا بەو دەنگە بەرز و ناحەزەیەوە گوتی:

_ کەواتە وەرە بۆ ئێرە!

من خۆم لە مەك كارتییەكان بەدوور دەگرت بۆ ئەوەی كە پێیان نەڵێم دایكم لە چ حاڵێكدایە و وەكوو هەڵاتوویەك خۆم لە هەموو كەس دەدزییەوە.

❊❊❊

حەفتەیەك دەبوو كە دایكم چووبوو و منیش تووشی جۆرە دۆخێكی قەیرانی بووبووم كە نە هەڵگری خەمێكی قووڵ بوو، نە شادییەكی راستەقینە. گەورەترین نیگەرانیم ژنە خاوەن ماڵ بوو، چونكە ئەگەر سیدنی هەرچی زووتر نەهاتایەتەوە، ناچار دەبوو رادەستی بەرپرسانی قەڵەمڕەوی ئایینیم بكات و ئەوانیش دیسانەوە دەیانناردمەوە بۆ خوێندنگەی هانۆل. هەر لەبەر ئەوەش بوو كە خۆم لە ژنە خاوەن ماڵ بەدوور دەگرت و بۆ ئەو مەبەستەش تەنانەت هەندێ شەو نەدەچوومە بۆ ماڵ و لە دەرەوە دەنووستم.

لەو ماوەیەدا لە كۆڵانێكی بنبەستی پشت شەقامی كنینگتۆندا لەگەڵ چەند دارتاشێكدا ئاشنا بووم. ئەوان كەسانێكی پەراوێزكراوی كۆمەڵگای مرڤایەتیی بوون كە لە هەمارێكی نیوەتاریكدا كاری سەخت و پڕزەحمەتیان دەكرد و زۆر بە هێواشیی و بە چرپە قسەیان لەگەڵ یەكتریی دەكرد و بەیانیی تا ئێوارە چێویان دەتاشی و جۆرە چێوێكی سپییان دروست دەكرد كە هەركامیان بایی نیو پێنیی بوون. من لەبەر دەرگای ئاوەڵای هەمارەكەدا، رادەوەستام و تەماشام دەكرد. دەمبینی كە چێوێكی بە ئەستووریی نزیكەی ٣٠ سانتیمتریان هەڵدەگرت و دەیانبڕی و دەیانكردە چەندین چێوی بڕاوی ٢ تا ٣ سانتیمتریی، تا چۆكڵە شقارتەیان لێ دروست بكەن. ئەوان ئەوەندە بە خێرایی چێوەكانیان دەبڕی كە من سەرسام مابووم و بەڕاستیی كارەكەیان سەرنـجی راكێشابووم. زۆری نەخایاند كە منیش كەوتم لەگەڵیاندا. ئەوان لە بریكارەكانی رووخاندنی بیناكان سەكۆیان دەكڕی و دەیانبردنە هەمارەكەیان و لەسەر یەك دایان دەنان و ئەم كارەش یەك رۆژی دەخایاند. رۆژی دواتر چێوەكانیان مشار دەكرد و رۆژی دواتریش دەیانبڕین و سافیان دەكردن. هەینی و شەمەش چێوە سپییەكانیان دەفرۆشت. ئەوەی كە لای من سەرنـجڕاكێش بوو، فرۆشتنی چێوە سپییەكان نەبوو، بەڵكوو ئەو هاوكاریی و هاوسۆزییەی نێوان ئەو كەسانە بوو كە لەو هەمارەدا كاریان دەكرد. ئەو پیاوە میهرەبان و كەم قسانە ، تەمەنیان نزیكەی چل ساڵ دەبوو بەڵام زۆر بەتەمەنتر دەهاتنە بەرچاو. سەرۆكێكیان هەبوو كە ئەوان بە ناوی «سەرۆك ! » بانگیان دەكرد و كەپۆیەكی هەبوو كە بە هۆی نەخۆشیی شەكرەوە سوور بوبووەوە و تەنیا تاقە ددانێكی لە لای سەرەوەی دەمیدا مابووەوە. سەرەڕای ئەوەش دەموچاوەكەی



میهرەبانیی و سۆزێكی زۆری پێوە بوو. بزەیەكی پێكەنیناویی هەبوو كە ئەو تاقە ددانەی بە شێوەیەكی سەیر دەردەخست. كاتێك پیاڵەیان نەبوایە كە چایان تێ كردایە، قوتوویەكی «شیری وشك»ی هەڵدەگرت و جوان دەیشۆرد و بەدەم پێكەنینەوە دەیوت:«مەگەر هەر ئەم قوتووە، پێویستییەكانی بۆ جێبەجێ نەكردووین؟». هاوڕێكەی هەرچەند پیاوێكی میهرەبان بوو، بەڵام هەمیشە ناوچاوی دابوو بە یەكدا و دەموچاوێكی ئاماڵ زەرد و لێوێكی ئەستووری هەبوو“ زۆر ئارام و لەسەرخۆش قسەی دەكرد. نزیك كاتژمێری ١ «سەرۆك» رووی لە من كرد و گوتی:

_ تۆ تا ئێستا كولیچەی «ولشیی»ت خواردووە كە بە كەرەی پەنیر دروستی دەكەن؟

منیش وەڵامم دایەوە:

_ ئەی... هەندێ جار خواردوومە.

لەو كاتەدا دەم بە پێكەنین و بە بزەیەكی میهرەبانانەوە وردەپارەیەكی دوو پێنیی پێ دەدام. منیش دەسبەجێ دەچووم بۆ لای«ئیش» كە لە سووچێكی شەقامەكەدا دووكانی وردەواڵە و شتی تری هەبوو و منیشی زۆر خۆش دەویست. یەك پێنیی كێكی پەنیر و یەك پێنییش نانم كڕی و چونكە خۆشی دەویستم هەمیشە لەبری پارەكەم تۆزێك زیاتری پێ دەدام. پاش ئەوەی كە پەنیرەكەمان چاك دەشۆردەوە و ورد وردمان دەكرد، بڕێك ئاو و خوێ و بیباریشمان تێ دەكرد. هەندێ جاریش«سەرۆك» پارچەیەك چەوریی بەراز و پیازێكی وردكراویشی تێ دەكرد و لەگەڵ چایی داخدا چێشتێكی زۆر بەتامو خۆش دەبوو.

هەرچەند هەرگیز داوای پارەم نەدەكرد بەڵام «سەرۆك» خۆی لە كۆتایی حەفتەدا شەش پێنسی پێ دام و ئەو پارەیەش بۆ من بەڕاستیی شتێكی كتوپڕ بوو و زۆریش خۆشحاڵی كردم.

«جۆ» پیاوێكی رەنگ زەرد بوو كە بەردەوام دەبوورایەوە و لە هۆش دەچوو و «سەرۆك» كاغەزی لە ژێر لووتیدا دەسووتاند بۆ ئەوەی بێتەوە هۆش. هەندێ جاریش دەمی پڕ دەبوو لە كەف و قەپی لە زمانی خۆی دەگرت و كاتێك دەهاتەوە سەرخۆی، زۆر هەستی بە شەرمەزاریی دەكرد.

چێوبڕەكان لە بەیانییەوە تا ٧ی شەو كاریان دەكرد و هەندێ جار زیاتریش. كاتێكیش هەمارەكەیان دادەخست بۆ ئەوەی كە بچنەوە ماڵەكانیان، خەمی دنیا دایدەگرتم. شەوێكیان سەرۆك بڕیاری دا لە هۆڵی شانۆی «ساوس لەندەن میوزیك هۆڵ»دا بە دوو پێنیی بۆ من و جۆ جێگا بگرێت. ئێمەش دەموچاومان شت و خۆمان پاك و خاوێن كرد و چاوەڕێی سەرۆكمان دەكرد. من زۆر هەژانم

هەبوو چونکە لەو حەفتەیەدا شانۆی «یەکەمین باڵندەکان»نـمایش دەکرا. ئەو شانۆنامەیە بەرهەمی«فرێدکارنۆ »بوو(کە چارەنووس وای کرد ساڵانێك دواتر ببمە ئەندامی گرووپەکەی). جۆ پاڵی دابوو بە دیوارەوە و منیش لە بەرانبەریدا راوەستابووم و لەوپەڕی شەوق و هەژاندا بووم کە لە پڕێکدا دیم جۆ تووشی یەکێك لەو حاڵەتانەی بوورانەوە بوو” هاوارێکی کرد و کەوتە سەر زەویی. ئەو داماوە بەڵێنی بە خۆی دابوو کە ئەو شەوە خۆش رایبوێرێت. سەرۆك دەیویست لە لای بـمێنێتەوە و پەرستاریی لێ بکات بەڵام جۆ پێی لەسەر ئەوە دادەگرت کە ئێمە بچین بۆ تەماشاخانە و واز لەو بێنین‌و گوتیشی تا بەیانیی حەتـمەن چاك دەبێتەوە.

هەرەشەی گەڕانەوەی من بۆ خوێندنگە، مۆتەکەیەك بوو کە وازی لێ نەدەهێنام. دارتاشەکان هەندێ جار لەو بارەوە پرسیاریان لێ دەکردم. کاتێك پشووی هاوینە تەواو بوو، ئەوان تۆزێك خەمبار دەهاتنە بەرچاو، چونکە من لە کاتژمێر٤/٥ ی دوانیوەڕۆوە دەمتوانی بچمە لایان، واتە پاش تەواوبوونی خوێندنگە. رۆژانی خوێندنگە لەناو قرم و قاڵی بێ سۆز و عاتیفەی کۆلانەکان و چاوەڕێ کردنی گەییشتنی دوا کاتژمێری وانەکان، زۆر بە سەختیی تێپەڕ دەبوو و منیش بەردەوام لە بیری ئەوەدا بووم کە هەرچی زووتر بچم بۆ ژوانەکەی خۆم و هاوڕێ دارتاشەکانم ببینم.

شەوێك کە بێدەنگ لە پلەکانەکانی ماڵەوە سەردەکەوتم، بۆ ئەوەی کە بڕۆم بنووم، ژنە خاوەن ماڵ بانگی کردم. دیارە تا ئەو درەنگانی شەوە بە دیار منەوە دانیشتبوو. لەکاتێکدا زۆر خۆشحاڵ دیار بوو، تەلگرافێکی دایە دەستم کە لەسەری نووسرابوو:«بەیانیی کاتژمێر ١٠ دەگەمە وێستگەی«واترلۆ». ماچتان دەکەم. سیدنی».

بۆ پێشوازیی براکەم لە وێستگەی شەمەندەفەر، لە جیاتی ئەوەی سەر و سیمایەکی شاد و گەشم هەبێت، بە پێچەوانەوە خەمبار بووم. جلەکانم زۆر شڕ و پیس بوون و بەری ناوەوەی کڵاوەکەشم وەك چۆن کراسی ژنان لە ژێر داوێنەکەیانەوە دێتە دەرەوە، لە قەراخی کڵاوەکەمەوە هاتبووە دەرەوە. بۆ دەموچاو شتنیش کەڵکم لە شێری هەماری دارتاشەکان وەردەگرت. چونکە بەوجۆرە ناچار نەدەبووم سەتڵێك ئاو تا نهۆمی سێهەم هەڵبگرم و بە بەردەم چێشتخانەی ژنی خاوەن ماڵیشدا تێپەڕم. هەر بۆیە کاتێك سیدنیم لە وێستگەدا بینی، سەر و ملم زۆر پاك و خاوێن نەبوو.

_ چاوێکی لە سەرتاپای کردم و گوتی:

_ چی قەوماوە؟



پێچ و پەنام نەخستە قسەکەوە و یەکسەر وتم:

_ دایکمان شێت بووە و ناچار بووین بینێرین بۆ شێتخانە.

دەموچاوی دا بە یەکدا بەڵام توانیی بەسەر خۆیدا زاڵ بێت. پرسیاری کرد:

_ ئەی تۆ لە کوێ دەژیت؟

_ هەر لەوێ، لە پاونێل تراس.

سەری بەولادا وەرسووڕاند کە وەك بڵێی سەیری چەمەدانەکانی دەکات، بەڵام من بینیم کە رەنگی روخساری هەڵبزرکابوو و حاڵەتێکی لاوازی هەبوو. بانگی کالسکەیەکی کرد و کۆڵکێشەکانیش چەمەدانەکانیان خستە ناوی، یەکێکیان سندووقێك مۆز بوو.

پرسیم:

_ ئەم سندووقە مۆزە هی خۆمانە؟

بە سەر وەڵامی بەڵێی دایەوە و گوتیشی:

_ هێشتا کاڵن. دەبێ یەك دوو رۆژ دایان بنێین تا زەرد بن ئینجا دەخورێن.

لە رێگەدا هەندێ پرسیاری دەربارەی دایکم کرد. منیش حاڵم زۆر لەوە خراپتر بوو کە بتوانم هەموو بەسەرهاتەکەی موو بە موو بۆ بگێڕمەوە، بەڵام ئەو خۆی دەرکی بە بارودۆخەکە کرد. ئینجا بۆی گێڕامەوە کە ناچار بووە ماوەیەك لە نەخۆشخانەیەکی «کاپ»دا بـخەوێت و لە گەڕانەوەشیدا ٢٠ لیرەی پاشەکەوت کردبوو کە بیدا بە دایکم” گوتیشی کە ئەو پارەیەی لە رێگەی رێکخستنی لاتارییەو هەندێ کایەی تر بۆ سەربازەکان بە دەست هێناوە.

باسی لە پلانەکانی خۆی کرد و گوتی حەز دەکات واز لە دەریاوانی بهێنێت و ببێتە ئەکتەری شانۆ. حسابی کرد کە بەو پارەیە دەتوانین ٢٠ حەفتەیەك بژێین و لەو ماوەیەشدا بە دوای کارێکدا دەگەڕێت کە لە شانۆییێکدا دابـمەزرێت.

گەییشتنەوەمان ئەویش بە کالسکەیەك و سندووقێك مۆزەوە، کاریگەرییەکی زۆری هەم لەسەر دراوسێکانـمان دانا هەم لەسەر خاوەن ماڵەکەمان. ئەو ژنە دەربارەی دایکم هەندێ قسەی بۆ سیدنی کرد بەڵام نەچوە ناو وردەکارییە دڵتەزێنەکانەوە.

هەر ئەو ڕۆژە سیدنی چوو بۆ بازاڕ و دەستێکی تەواو جلی بۆ کڕیم. هەر ئەو شەوەیش لە هۆڵە شانۆییەکەی "ساوس لەندەن میوزیك هۆڵ"دا جێگەی گرت و چووین بۆ سەیری شانۆ. لە کاتی نـمایشەکەدا بەردەوام دەیوت:«بیری لێ بکەوە...ئەمشەو دەبوایە لەگەڵ دایکمدا بووینایە».

لەو حەفتەیەدا بۆ سەردانی دایکم چووین بۆ کین هیل. لە ژووری چاوەڕێکردندا دانیشتبووین و بەڕاستی چاوەڕێ کردنەکەمان ئەوەندەی خایاند تەواو وەڕەزی کردین. لەبیرمە دەنگی سووڕاندنی کلیلێکم لەناو قفڵەکەدا بیست و هەروەها دەنگی پێی دایکم کە دەهاتە ناو ژووری چاوەڕێکردنەکەوە. بێڕەنگ¬وڕوو دەهاتە بەرچاو" لێوەکانی شین بوون، هەرچەند ئێمەی ناسییەوە بەڵام شەوق و زەوقێکی ئەوتۆی نیشان نەدا. ئەو سۆز و خۆشەویستییەی جارانی نەمابوو. پەرستارێکی هێمن و لەسەرخۆ بەڵام چەنەبازی لەگەڵدا بوو و دەیویست خۆی لە قسەکانمان هەڵقوتێنێ. پێی گوتین:

_ مەخابن کە لەم ساتەوەختەدا هاتن، چونکە ئەمڕۆ زۆر سەرحاڵ و بەکەیف نین. وا نییە ئازیزەکەم؟!

مەبەستیشی لە«ئازیز»دایکم بوو. دایکم نیگایەکی بە ئەدەبانەی لێ کرد و بزەیەکی هاتێ، وەك بڵێی چاوەڕێی ئەوەی دەکرد کە پەرستارەکە بڕوات و بەجێمان بهێڵێت.

پەرستارەکە دیسان گوتی:

_ دەبێ هەر کاتێك حاڵمان لەمە باشتر بوو، دیسان سەردانـمان بکەنەوە.

دواجار ژوورەکەی بەجێ هێشت و چوە دەرەوە.

سیدنی هەوڵی زۆری دا دایکم لەو حاڵەتی خەم و خەفەتەدا دەربهێنێت و باسی ڕۆژە خۆشەکانو هەروەها بەسەرهاتەکانی خۆی بۆ کرد و ڕوونیشی کردەوە کە بۆچی ئەوەندە درەنگ هاتۆتەوە بۆ ماڵ. بەڵام دایکم بەردەوام سەری دەلەقاندەوە و حاڵەتێکی گێژ و وێژ و دڵتەنگی هەبوو. من دڵنیام کردەوە کە بەم زوانە چاك دەبێتەوە.

ئەویش بە دەنگێکی داخدارەوە گوتی:

_ بەڵێ بەڵام ئەگەر تۆ ئەو دوانیوەڕۆیە پیاڵەیەك چاییت پێ دابایەم، من حاڵم باشتر دەبوو.



پاشان پزیشك بۆ سیدنی ڕوونی کردەوە کە حاڵی دایکم بە هۆی نەبوونی خواردنەوەوە وای لێ هاتووە و پێویستی بە چاودێریی زۆر هەیە و هەرچەند ڕەنگە بۆ ماوەیەکی کەم، بێتەوە سەرخۆ، بەڵام چەندین مانگی دەوێت تا بە تەواوەتی چاك ببێتەوە. بەڵام من ڕۆژانە دەکەوتـمەوە بیری ئەو ڕستەیەی کە دایکم پێی وتبووم:

«بەڵام ئەگەر تۆ ئەو دوانیوەڕۆیە پیاڵەیەك چاییت پێ دابایەم، من حاڵم باشتر دەبوو».

## ٥

## گەشت لە شارەکاندا

ئەم قسەیە هی«جۆزێف کێنراد »ە کە بۆ یەکێك لە هاوڕێکانی نووسیبووی:« لە ژیاندا بەو دەرەنــجامە گەییشتووم کە مشکێکی کوێرم لە سووچێکدا و هەردەم چاوەڕێی ئەوە دەکەم یەکێك بێتو بــمپلیشێنێت و سەرم پان بکاتەوە». رەنگە ئەم بەراوردکردنە لەگەڵ هەندێ لایەنی خەماویی ژیانــی ئێمەدا بێتەوە، بەڵام لەوانەیە ﴿هەر ئەو داماویی و دەستەوەستانییە﴾ خێری لێ بکەوێتەوە﴿و وەك دەڵێن ئاقیبەت بە خێر بێن﴾" وەك چۆن بۆ خۆم رووی دا.

من رۆژنامەفرۆشییم کرد، بوومە کرێکاری چاپخانە، کایەکڵەی منداڵانم دروست کرد، لە کارخانەی شووشەسازییدا فووم لە شووشە کرد، لە نووسینگەی پزیشکیدا بوومە خزمەتکار و...، بەڵام سەرەڕای هەموو ئەو بەسەرهاتانە منیش وەکوو سیدنی بۆ تاقە چرکەیەك ئامانــجی کۆتایی خۆمم لەبیر نەکردبوو، واتە ئەکتەربوون لە شانۆدا. هەر بۆیە هەر کاتێك وازم لە کارێك دێنا و دەستم بە کارێکی دیکە دەکرد، بەر لە هەموو شت کەوشەکانم بۆیاخ دەکردەوە. بە فڵچەیەك جلەکانم پاك دەکردەوە و یەخە و بۆینباخێکی خاوێنم دەبەست و سەردانێکی نوێنەرایەتیی نـمایشەکانی«بلەك مۆر»لە شەقامی«بەدفۆرد» لە نزیکەی«ئێستراند»م دەکرد. ئەو کارەشم تا ئەو رۆژە درێژە پێ دا کە ئیتر سەر و وەزعم بۆ ئەوە نەدەبوو بچم.

یەکەمــجار کە چووم بۆ ئەوێ، نووسینگەی نوێنەرایەتی پڕ بوو لەوانەی عاشقی «تێسپیس » بوون، بە ژن و پیاوەوە، کە بە شێوەیەکی وەك بێ گوناحان جلیان لەبەر کردبوو و راوەستابوون و بە رێکوپێکی پێکەوە قسەیان دەکرد. من بە ترس و لەرزەوە لە سووچێکی نزیك دەرگای چوونەژوورەوەدا راوەستام و زۆریش دەترسام و هەوڵیشم دەدا جلە کۆنەکانم کە بە هۆی کەش و هەوای ناسازگارەوە تێك چووبوون و هەروەها پێڵاوە گەورەکانم کە سەرپەنــجەکانیان تۆزێك ناشیرین بووبوون، لەبەر چاوی ئەوانی تر بشارمەوە. خزمەتکارێکی لاو هەر چەند خولەك جارێك دەهاتە بەردەم دەرگای نووسینگەی



نوێنەرایەتی و هاواری دەکرد:«ئای...فلاّنی هیچ کارێکمان بۆ تۆ نییە. بۆ فلاّنە کەسیش کارمان نییە. بۆ فلاّنیش نییە...». قسەکانی وەك تەرزە دەیدا لە سەری داواکارانی کاری شانۆ ﴿کە لەوێ وەستابوون﴾. پاش بیستنی قسەکانی ئەو، نووسینگە چۆڵ و هۆڵ دەبوو، رێك وەك کڵێسەی پاش کۆتاییهاتنی رێوڕەسمی ئایینیی. تەنیا یەك جار ئەوە رووی دا کە من دوا کەس بووم کە هێشتا لەوێ مابوومەوە. کاتێك خزمەتکار منی بینی، دەسبەجێ وەستا و پرسیاری کرد:

_ تۆ چیت دەوێ؟

وەمدەزانی «ئۆلیوێر تویست »م و داوای مافێکی زیاتر لەوەی خۆم دەکەم. بە تۆزێك مینگەمینگەوە وتم:

_ ئێوە دەوری کوڕی بچووکتان لە ناو شانۆکەتاندا نییە؟

پرسیی: پێشتر ناوت نووسیوە؟

سەرێکم لەقاندەوە.

بەوپەڕی سەرسووڕمانەوە بردمیە ژوورەکەی تەنیشت و ناو و ناونیشان و ئەوشتانەی تر کە پێویست بوو نووسی و گوتی ئەگەر پێویست بوو بانگت دەکەین. من بەو هەستە خۆشەوە کە وەك بلێی ئەرکێکم راپەڕاندووە ئەوێم بەجێ هێشت و لەو روەشەوە زۆر ئاسوودە بووم کە هیچ هەرایەکی لێ نەکەوتەوە.

مانگێك دوای هاتنەوەی سیدنی، رۆژێکیان کارت پۆستاڵێکم بۆ هات کە لەسەری ئاوا نووسرابوو:«تکایە ئەگەر پێتان خۆشە، خۆتان بە نووسینگەی نوێنەرایەتیی بلەك مۆر لە شەقامی بەد فۆرد بناسێنن».

جلە تازەکانم لەبەر کرد و چووم. منیان بردە لای خودی ئاغای بلەك مۆر کە بەردەوام دەم بە بزە بوو و زۆریش میهرەبان بوو. ئەو بلەك مۆرەی کە من لە لای خۆمەوە پێموابوو بوونەوەرێکی دەسەڵاتدار و بەهێز و تێژبینە، بەوپەڕی میهرەبانییەوە پێشوازیی لێ کردم و نامەیەکی بۆ ئاغای«سی. ئەی. هەمیلتۆن» نووسی و پێی وتم بیبە بۆ ئیدارەی نـمایشی«چارلز فروهمان».

ئاغای هەمیلتۆن نامەکەی خوێندەوە و پێ دەچوو هەم لە بالاّ کورتەکەی من سەری سووڕ ماوە و هەمیش پێی خۆشحاڵ بووە. دیارە سەبارەت بە تەمەنم درۆم لەگەڵ کرد و پێم وت چواردە ساڵمە و لە کاتێکدا دوانــزە ساڵ و نیوم بوو. ئەو بۆی روون کردمەوە کە دەبێ دەوری «بیلی»

کارەکەری«شێرلۆك هۆڵـمێس»ببینم، ئەویش لە گەشتێکدا بۆ شارەکانی تر کە چل حەفتە دەخایەنێتو لە سەرەتای پاییزەوە دەست پێ دەکات.

پاشان ئاغای هەمیلتۆن گوتیشی:

_ هەروەها دەورێکی زۆر باشی ترمان بۆ کورە بچووکێك هەیە بە ناوی «جیم» کە کوڕێکی لەندەنی یە و شانۆنامەکەشی ئاغای «ئێچ. ئەی. سەنتسبۆری» نووسیویەتی. ئەکتەرێك کە لە گەشتێکی تردا لە شانۆگەریی شێرلۆك هۆڵـمێسدا یاری دەکات.

دەبوایە پێش دەسپێکردنی گەشتی شێرلۆك هۆڵـمێس، شانۆگەرییەکەی «جیم»یان چەند جارێك لە «کینگستۆن»دا بۆ تاقیکردنەوە ببردایەتە سەر شانۆ. حەقدەستی من دوو لیرە و دە شلینگ بوو لە حەفتەیەکدا، واتە هێندەی ئەو حەقدەستەی کە بۆ نـمایشی شێرلۆك هۆڵـمێس پێیان دەدام. هەرچەند ئەو حەقدەستە بۆ من نیعمەتێکی کتوپڕ و باوەڕنەکردە بوو، بەڵام وەك بە شتێکی ئاساییم زانیبێت، بە جیددییەتەوە وتم:

_ دەبێ دەربارەی ئەو کارە لەگەڵ براکەمدا راوێژ بکەم.

ئاغای هەمیلتۆن تریقایەوە و قسەکەم بە لایەوە زۆر پێکەنیناویی بوو و هەموو کارمەندانی نوێنەرایەتیشی بانگ کرد بۆ ئەوەی بـمبینن. کاتێك هەموویان هاتن، گوتی:

_ ئەمەش ئەو «بیلی» بچکۆلەیەی کە دەمانویست. راتان دەربارەی ئەو چۆنە؟

هەموویان بە خۆشحاڵییەوە بزە هاتە سەرلێویان. چی رووی دابوو؟ وەك بڵێی دنیا یەکسەر گۆڕاوە و بە سۆز و خۆشەویستییەوە لە ئامێزی گرتووم و وەك منداڵی خۆی قبوڵی کردبووم. پاشان ئاغای هەمیلتۆن نامەیەکی بۆ ئاغای سەنتسبۆری نووسی و گوتی کە برۆم بۆ یانە(کلووپ)ی «گرین رۆم» لە گۆڕەپانی«لیسستر»دا کە چاوم پێی بکەوێت. لە خۆشییاندا لە پێستی خۆمدا نەدەگونـجام و چووم بۆ ئەوێ.

***

لە یانەی گرین رۆمیشدا بە هەمان شێوە پێشوازییان لێکردم و ئاغای سەنتسبۆری کارمەندانی یانەکەی بانگ کرد تا چاویان پێم بکەوێت. دەسبەجێ دەقێکی پێ دام کە دەوری«سامی»تێدا نووسرابوو و گوتی سامی یەکێك لە قارەمانە گرینگەکانی شانۆگەرییەکەیەتی. من تۆزێك نیگەران بووم لەوەی کە کتوپڕ داوام لێ بکات نامیلکەی دەقی رۆڵەکە لەبەر دەمیدا بـخوێنمەوە، لەو



حاڵەتەدا زۆر ناخۆش دەبوو چونکە من بە کردەوە توانای خوێندنەوەم نەبوو. بەختەوەرانە پێی وتم کە نووسینەکە ببەمەوە ماڵ و لەسەر دەرفەت بیخوێنمەوە و جەختیشی لەسەر ئەوە کردەوە کە هیچ پەلەی نییە چونکە تەمرینەکان نزیکەی حەفتەیەکی تر دەست پێ دەکەن.

بە پاس گەڕامەوە بۆ ماڵەوە. ئەوەندە خۆشحاڵ بووم وەخت بوو بفڕم و تازە خەریك بوو تێ دەگەییشتم کە چ رووداوێکی خۆشم بۆ هاتۆتە پێشێ. لە پڕێکدا لە ژیانێکی هەژارانە رزگارم بووبوو و خەونێکم هاتبووە دی کە ساڵانێك بوو خەوم پێوە دەبینی. خەونێکم هاتبووە دی کە دایکم چەندین جار لەبارەیەوە قسەی لەگەڵ کردبووم. من خەریك بوو دەبوومە ئەکتەری شانۆ! تازە...ئەو سەرکەوتنەش ئاوها کتوپڕیی بە دەست هاتبوو! پەیتاپەیتا لاپەڕەکانی دەقی رۆڵەکەم دەدایەوە کە بەرگێکی تازەی قاوەیی هەبوو و بە راستی ئەو بەڵگەیە گرینگترین بەڵگەیەك بوو کە لە هەموو تەمەنـمدا گرتبێتم دەستەوە.

کاتێك بەسەرهاتەکەم بۆ سیدنی گێڕایەوە، فرمێسك لە چاوانیدا قەتیس بوون. لەسەر قەرەوێڵەکە دانیشتبوو و بە حاڵەتێکی دڵتەنگ و خەمبار لە پەنـجەرەوە تەماشای دەرەوەی دەکرد و هەندێ جار سەری دەلەقاندەوە و هەندێ جاریش سەری بەرزی دەکردەوە“ پاشان بە جیدیەتەوە گوتی:

_ ئێمە کەوتووینەتە خاڵی وەرگۆڕان لە ژیاندا. خۆزگە دایکیشمان لێرە بوایە و لەو خۆشییەدا بەشدار دەبوو!

من بە شەوق و زەوقێکی زۆرەوە وتم:

_ کورە بیری لێ بکەرەوە! چل حەفتە، هەر حەفتەیەکیش دوو لیرە و دە شلینگ پارە وەردەگرین! من بە ئاغای هەمیلتۆنم گوت دەبێ لەگەڵ براکەمدا راوێژ بکەم، چونکە بەوم گوتووە کە تۆ چاودێریی گرێبەستەکانی من دەکەیت. ئەو قسەشم بۆ ئەوە کرد بەشکەم حەقدەستی زیاتر وەربگرم. بە هەرحاڵ ئێمە ئەمساڵ دەتوانین شەست لیرەی ئسترلینگ پاشەکەوت بکەین.

پاش ئەوەی برێك ئەو شەوق و هەژانەمان دامرکایەوە، بیرمان لەوە کردەوە کە دو لیرەی ئسترلینگ بۆ رۆڵێکی بەو گرنگییە، بەڕاستی زۆر کەمە. سیدنی چوو بزانێت ئاخۆ دەتوانێت لەوە زیاتر وەربگرێت یان نا. من پێم گوت.

_ بە هەر حاڵ دەبێ تاقیی بکەینەوە. رەنگە ئاکامێکی هەبێت.

بەڵام ئاغای هەمیلتۆن ناوچاوی دا بە یەکدا و گوتی :دوو لیرە و دە شلینگ ئەوپەڕی حەقدەستێکە کە دەتوانم بیدەم.... دیارە ئێمە بەو پارەیەش هەر زۆر رازیی بووین.

سیدنی نامیلکەی رۆڵەکەی منی دەخوێندەوە و یارمەتیی دەدام لەبەری بکەم. رۆڵێکی زۆر و درێژ بوو" نزیکەی ٣٥ لاپەڕەی تەواو بوو" منیش لە ماوەی سێ رۆژدا لەبەرم کرد.

تەمرینی شانۆنامەکەی جیم، لە ژووری ئەکتەرەکانی شانۆخانەی «درۆری لین» لە نهۆمی یەکەمدا دەکرا. سیدنی ئەوەندە بە باشی کاری لەگەڵ کردبووم کە من دەورەکەی خۆمم تەقریبەن بەبێ هەڵە دەزانی و تەنیا لەسەر وشەیەك زمانم گیری دەکرد. رستەکە ئاوابوو:«...پێت وایە تۆ کێیت... ئاخۆ «پیرپۆنت مۆرگان»یت؟ من دەموت:«پۆتر پینت مۆرگان». ئاغای سەنتسبۆری زۆریش حەزی لەو جۆرە ئەدا کردنە کردبوو، ئیجازەی دام هەر بە هەمان شێوەی«پۆتر پینت مۆرگان» ئەدای بکەم. تەمرینە سەرەتاییەکان زۆر شتیان بۆ روون کردمەوە و فێری دنیایەك مەسەلەی تەکنیکی بووم. لەوە پێش هەرگیز بیرم لەو نەکردبووەوە کە سەکۆی شانۆ و موزیك و ئەو تایـمانەی کە دەبێ دیاریی بکرێن و ئەو وەڵامانەش کە دەبێ بدرێنەوە و هەروەها جۆری دانیشتن، فەن و تەکنیکی تایبەتی خۆیان هەیە. هەموو ئەوانەشم لە کاتی ئەو تەمرینانەدا دەست کەوت. من لە کارەکەمدا تەنیا یەك عەیبم هەبوو و ئەویش ئاغای سەنتسبۆری بۆی چاك کردم. عەیبەکەشم ئەوە بوو کە لە کاتی قسەکردندا سەرم دەجووڵاند و زۆریش مۆن دەبووم.

پاش ئەوەی کە چەند سێکانسمان تەمرین کرد، ئەو سەرسووڕمانی خۆی دەربڕی و لێی پرسیم ئاخۆ پێشتریش لەسەر شانۆدا کاری نواندنت کردووە؟ من لەبەر ئەوەی کە سەرنـجی ئاغای سەنتسبۆری و کەسانی تری گرووپەکەم راکێشابوو، زۆر خۆشحاڵ بووم، بەڵام شەوق و هەژانەکەی ئەوانم بە ئاسانی قبووڵ دەکرد، وەك بڵێی شتێکی سادە و ساکار لە ئارادایە.

شانۆنامەی جیم سەرکەوتنی بە دەست نەهێنا، دیارە رەخنەی زۆریشی لێ گیرا، سەرەڕای ئەوەش من چەند جارێك دەسخۆشیم لێ کرا. یەکێك لە وتارەکان کە ئاغای«چارلز رام» ئەندامی گرووپەکەی خۆمان نیشانی دام، بە پێچەوانەی ئەوانی تر، پۆزەتیڤانە باسی شانۆنامەکەی کردبوو. خودی ئاغای چارلز رام یەکێك لە ئەکتەرە قەدیـمیەکانی«ئادێلفی » بوو کە بەناوبانگ بوو و زۆربەی ئەو سێکانسانەش کە نـمایشم دەکرد، لەگەڵ ئەودا بوو. کاتێك وتارەکەی دایە دەستم، زۆر راشکاوانەوە گوتی:«ئەی کوڕە گەنـجەکە! ها...ئەوە بـخوێنەرەوە، بەڵام ئاگات لە خۆت بێت لەکاتی



خوێندنەوەیدا لەخۆت بایی نەبیت! ». دوای ئەوەش کە دەربارەی خاکەڕایی و چاکەکردن هەندێ شتی فێر کردم، ئەو رەخنەیەی بۆ خوێندمەوە کە لە رۆژنامەی«لەندەن تاپیکاڵ تایـمز»دا نووسرابوو و من ئێستاکەش وشە بە وشەیم لەبیر ماوەتەوە. رەخنەگرەکە پاش لێکدانەوەیەکی بێ بەزەییانەی شانۆگەرییەکە، وەها درێژەی بە قسەکانی دابوو:«بەڵام خاڵێك هەیە کە زۆر باش و بەهێزە و زۆرێك لە کەموکووڕییەکان قەرەبوو دەکاتەوە و ئەویش رۆڵی «سامی»»، کوڕە بچکۆلە رۆژنامە فرۆشەکەیە کە یەکێکە لە بەهرە بەتواناکانی کۆڵانەکانی لەندەن، کە لایەنی کۆمێدیی شانۆگەرییەکە، تا رادەیەکی زۆر بەندە بە بوونی ئەوەوە. هەرچەند ئەم رۆڵە تا رادەیەك کۆنە و باوی نەماوە، بەڵام کەسایەتی سامی، بە هۆی دەورگێڕانی پرشنگداری ئاغای چارلز چاپلینەوە کە ئەکتەرێکی گەنج و بە توانا و بەهرەمەندە، زۆر خۆش و سەرنـجڕاکێش بووە. من تا ئێستا هیچم دەربارەی ئەو کوڕە بچووکە نەبیستووە بەڵام هیوادارم لە داهاتوویەکی نزیکدا شتی زیاتر دەربارەی بزانم». سیدنی دە دوانـزە دانە لەو رۆژنامەیەی کڕی.

پاش دوو حەفتە نـمایشکردنی جیم، دەستمان کرد بە تەمرینی نـمایشی شێرلۆك هۆڵـمێس. لەو ماوەیەدا من و سیدنی هەر لە خانووەکەی پاونێل تراسدا بووین چونکە لە رووی ئابوورییەوە پێگەیەکی ئەوەندە بەهێزمان نەبوو.

لە مەودای نێوان تەمرینەکاندا من و سیدنی بۆ بینینی دایکمان سەردانێکی «کین هیل»مان کرد. پەرستارەکان دەستیان کرد بە قسەکردن سەبارەت بەوەی کە ناتوانین چاومان بە دایکمان بکەوێت چونکە﴿گوایە﴾ئەو رۆژە حاڵی باش نییە. لە لایەکی تریشەوە سیدنییان بردە سووچێك و شتێکیان بە گوێیدا چرپاند و منیش بیستم کە سیدنی وەڵامی دانەوە کە:

_ نا، پێم وا نییە رازیی ببێت...

پاشان بە سیمایەکی خەمبارەوە ئاوڕێکی لە من دایەوە و گوتی:

_ تۆ دەتەوێت کە دایکم لە ناو ژوورێکی تاکەکەسیی و داخراودا ببینیت؟

لە حاڵێکدا کە بەرەو دوا هەنگاوم دەنا، وتم:

_ ئاه...نا...! تاقەتی بینینیم نییە!

بەڵام سیدنی چوو بۆ لای، دایکم ئەوی ناسییەوە و یادەوەرییەکەی گەڕایەوە. چەند خولەك دواتر پەرستارێك هات و پێی راگەیاندم حاڵی دایکم باشتر بووە و ئەگەر حەز بکەم دەتوانم بچم بۆ لای و

بیبینم. منیش چووم و هەر سێکمان لە ژوورێکی بچووك و داخراودا دانیشتین و قسەمان کرد. دایکم بەر لەوەی کە روخسەتی هەستانمان بدات، منی کێشایە کەنارێکەوە و بە گوێمدا چرپاندی:

_ خۆت ون نەکەیت، ئەگینا دەتهێنن بۆ ئێرە و لێرەدا راتدەگرن.

دایکم هەژدە مانگ لە کین هیلدا مایەوە تا تەندروستیی باش بووەوە. لەو ماوەیەشدا کە من لە گەشت و سەفەردا بووم، سیدنی بەردەوام دەچوە سەردانی.

***

ئاغای ئێچ. ئەی. سەنتسبۆری کە لە نمایشە گەڕۆکەکاندا دەوری شێرلۆك هۆلمێسی دەگێڕا، وەلامێکی بەهێز بوو بۆ ئەو وێنانەی کە لە گۆڤاری«ئستراند مەگەزین»دا چاپ دەکران. دەموچاوێکی درێژ و تەوێلێکی بەرزی ئیلهام بەخشی هەبوو. لە هەموو ئەو کەسانەی کە دەوری شێرلۆك هۆلمێسیان بینیبوو، یان دەیانبینی و تەنانەت لە خودی«ویلیام ژیلت»ی نووسەری شانۆنامەکەش، بە باشتریان دەزانی.

لە گەشتی یەکەمدا، بەڕێوەبەری گرووپ بڕیاری دا کە من لەگەڵ ئاغا و خانمی «گرین» پێکەوە لە یەك خانوودا بژێین. ئاغای گرین دارتاشی گرووپ بوو و خانمی گرینی هاوسەریشی جل رێکخەری گرووپ بوو. ئەو هاومەنزڵییە لەگەڵ ئەواندا بۆ من شتێکی ئەوەندە خۆش نەبوو. جیا لەوەش ئاغا و خانمی گرین تۆزێك حەزیان لە مەشرووب بوو“ جیا لەوەش من حەزم نەدەکرد رێك لە کاتی نان خواردندا بخۆمەوە کەچی ئەوان دەیانخواردەوە“ یان حەزم نەدەکرد لە هەمان چێشت بخۆم کە ئەوان دەیخۆن. لە لایەکیشەوە دڵنیا بووم لەوەی ئەوانیش کەیفیان بەوە نایە من لەوێم. هەر بۆیە پاش سێ حەفتە بڕیارمان دا لێك جیا بینەوە. چونکە من هێشتا لەوەمنداڵتر بووم کە لەگەڵ ئەندامانی تری گرووپدا ببمە هاومەنزڵ، بڕیار درا بە تەنیا بژیم. لە شارە غەریبەکاندا تەنیا بووم، لە ژوورە بچووکەکاندا تەنیا بووم و بە دەگمەن پێوەندیم لەگەڵ کەسێك دەگرت. هەر بۆیە پێش دەسپێکردنی نمایشی شەو، جگە لە دەنگی خۆم، ئەویش کاتێك کە لەگەڵ خۆمدا قسەم دەکرد، دەنگی کەسی ترم نەدەبیست. هەندێ جار دەچووم بۆ ئەو بارانەی وا ئەندامانی گرووپیان تیا کۆ دەبوونەوە و تەماشای یاریی بیلیاردی ئەوانم دەکرد“ بەڵام هەمیشە هەستم بەوە دەکرد کە حزووری من دەبێتە هۆی پچڕاندنی قسەکانیان و ئەوانیش بە ئاشکرا منیان لەوە تێ دەگەیاند. هەرکاتێکیش بە هۆی گاڵتەکانیانەوە بزەیەکم دەکرد، ئەوان بە جۆرە تووڕەییەکەوە تەماشایان دەکردم.



زۆری نەخایاند تووشی حاڵەتێکی مالیخولیایی هاتم. کاتێك ئێوارەیەکی رۆژێکی شەمە دەچووینە ناو شارەکانی باکوورەوە لە کاتی پیاسەی شەوانەی شەقامەکاندا دەنگی خەماویی زەنگی کەنیسەم دەبیست، ئەو دەنگانە بە هیچ شێوەیەك لە ئێش و ئازاری تەنیاییمی کەم نەدەکردەوە. رۆژانی حەفتە بە بازاڕەکاندا دەگەڕام تا هەم پیاسەیەکم کردبێت و، هەمیش گۆشت و دانەوێڵە و بەهاراتم دەکڕی بۆ ئەوەی ژنە خاوەن ماڵەکەم بۆم لێ بنێت. هەندێ جاریش پانسیۆنیان دەکردم و لەو کاتانەدا من لەگەڵ ئەندامانی تری گرووپدا نانم دەخوارد و ئەوەش زۆر بە لامەوە خۆش بوو“ چونکە چێشتخانەکانی باکوور زۆر پاك و خاوێن بوون و سۆبەکانیشیان میلەی ئاسنینی پاك و خاوێن و وریجەداریان تێدا بوو و فڕنەکانیشیان رەش نەبووبوونەوە. کاتێك ژنە خاوەن ماڵ نانی دەکرد، مرۆڤ کەیفی دەهاتێ لەوەی کە سەرما و سۆڵە و تاریکیی ناو کۆڵان جێ بهێڵێت و لەبەردەم سۆبەی گەرم و رووناکی چێشتخانەیەکی لانکشایر دابنیشێت و سەیری قاڵبە هەویرەکانی سەر سۆبەکە بکات و لەگەڵ ئەندامانی گرووپدا چایی بخواتەوە. تامی ئەو نانە گەرم و نەرمەی کە لە تەنوورکەوە دەهاتە دەرێ و بە کەرەی تازە دروست دەکرا، تام و چێژێکی وای هەبوو هەر نەبێتەوە.

شەش مانگێك دەبوو کە لە گەشتدا بووین. لەو ماوەیەدا سیدنی نەیتوانیبوو کارێك لە شانۆدا بدۆزێتەوە، هەربۆیە ناچار بوو واز لە خەونەکانی بە ئەکتەربوون بهێنێت و لە مەیخانەی«ترۆ ئاشاربێن»دا ببێتە کۆڵ کێش“ واتە فرۆشیاری سەر بارەکان. ١٥٠ کەس داوای ئەو کارەیان کردبوو و لە ناویاندا ئەویان هەڵبژاردبوو. بەڵام ئەو خۆی ئەو کارەی پێ خۆش نەبوو و هەستی بە داڕووخان و هەڵوەشانەوەیەکی مەترسیدار دەکرد.

بەردەوام نامەشی بۆ من دەنووسی و هەواڵی دایکمانی پێ دەدام بەڵام من بە دەگمەن وەڵامی نامەکانم دەدایەوە. زیاتر لەبەر ئەوەش بوو کە شوێن و جێگەیەکی تایبەتی و دیاریکراوم نەبوو. یەکێك لە نامەکانی کاری زۆری تێکردم و بووە هۆی ئەوە کە﴿لە رووی دەروونییەوە﴾ زیاتر لە یەکدیی نزیك ببینەوە. لەو نامەیەدا لۆمەی کردبووم کە بۆچی وەڵامی نامەکانی نادەمەوە و هەروەها باسی ئەو سەختی و چەرمەسەرییانەی کردبوو کە پێکەوە تەحەمولمان کردبوو و بەڕاستیی دەبوایە ببوونایەتە هۆی هاودڵی و هاوڕایی زیاترمان. سیدنی لەو نامەیەدا نووسیبووی:«لەو کاتەوە دایکمان نەخۆش کەوتووە، ئەم دوو برایە بێجگە لە یەکتریی کەسی ترمان لەم دنیایەدا نییە. کەواتە تۆ دەبێ هەمیشە نامەم بۆ بنووسیت تا هەمیشە بخەیتەوە بیرم کە برایەکم هەیە». نامەکەی هێندە

خەفەتهێنەر بوو کە دەسبەجێ وەڵامم بۆ ناردەوە. لەو رۆژە بە دواوە سیدنیم بە جۆرێکی تر دەبینی و ئەو نامەیەی هێندە کاریگەر بوو و بینای برایەتیمانی پتەوتر کرد کە تا ژیانم ماوە هەر درێژەی دەبێت.

وردەوردە لەگەڵ ژیانی تەنیایی راهاتم. بەڵام عادەتی قسەکردنم وەها لەبیر چوبووەوە کە کاتێك یەکێك لە ئەندامانی گرووپم دەبینی و دەمویست قسە بکەم، لێم تێك دەچوو. کاتێك پرسیارێکیان لێ دەکردم نەمدەتوانی بە خێرایی بیرم کۆ بکەمەوە و وەڵامێکی گونـجاویان بدەمەوە. هەربۆیە وازیان لێ دێنام و دەڕۆشتن و دڵنیاش بووم کە تۆزێك خەفەت بۆ عەقڵ و شعوورم دەخۆن. بۆ نـموونە خانـمی«گریێ تاهان» ژنە ئەکتەری گرووپ کە ژنێکی زۆر جوان و سەرنـجڕاکێش و یەکجار میهرەبانیش بوو. سەرەڕای ئەوەش کاتێك لە شەقامێکدا دەمبینی کە بەرەوڕووی من دێت، بە پەلە سەرم هەڵدەگەڕاندەوە و خۆم بە تەماشاکردنی جامـخانەی دووکانێکەوە سەرگەرم دەکرد، یان خۆم دەکرد بە کۆڵانێکدا بۆ ئەوەی تووشی نەبم.

وام لێهات لە جلوبەرگ لەبەرکردنیشدا تەمەڵ و بێعار بووبووم. کاتێك لەگەڵ گرووپدا سەفەرمان دەکرد، هەمیشە درەنگتر لەوانی تر و لە دواخولەکدا دەگەیشتمە وێستگەی شەمەندەفەر، ئەویش بە قژی شێواو و ئالۆزەوە و بەبێ یەخە و بۆینباخ“ لەبەر ئەوەش هەمیشە سەرزەنشت دەکرام و پرتە و بۆڵەیان دەکرد بە سەرمدا.

بۆ رزگاربوون لە تەنیایی و بێکەسی، کەروێشکێکم کڕی و دەچووینە هەر جێیەك ، بە دزیی خاوەن ماڵەکەوە دەمبردە ژوورەوە. ئاژەڵێکی جوان و خنجیلانە بوو بەڵام رانەهاتبوو لەناو ئاپارتـماندا بژیێت. تووکێکی ئەوەندە سپی و خاوێنی هەبوو کە لەگەڵ بۆگەنی لەشی یەکی نەدەگرتەوە. لەناو قەفەزێکی چێویندا رامدەگرت و قەفەزەکەشم لە ژێر قەرەوێڵەکەمدا دەشاردەوە. ژنە خاوەن ماڵەکە، بە پێکەنین و خۆشحاڵییەوە سینی نانی بەیانی لەسەر دەست، دەهاتە ژووریێ و پاشان بەو لووتە هەستیارەی خۆیەوە ئەو بۆگەنەی هەست پێ دەکرد و بە سەرسووڕمان و ناوچاوگرژییەوە دەچووە دەرەوە. هەرکە دەچووە دەرێ، ئاژەڵەکەم لە قەفەزەکەی دەردەهێنا و لەناو ژوورەکەدا بەرەڵام دەکرد و ئەویش دەستی دەکرد بە هەڵبەز و دابەز و یاریی کردن.

فێرم کردبوو لەگەڵ تەقەی دەرگا هات رابکات و بڕواتەوە ناو قەفەزەکەی. کاتێك ژنە خاوەن ماڵەکەم بەو نهێنییەمی دەزانی، کەروێشکەکەم ناچار دەکرد هەندێ شیرینکاریی بۆ بکات و زۆربەی



جار ئەو کارەش دڵی خاوەن ماڵەکەی نەرم دەکرد و ئەو حەفتەیەی کە لەوێ دەبووین، من و کەروێشکەکەمی تەحەمول دەکرد.

بەڵام لە «تونی پاندی» لە ئەیالەتی«گال»دا کاتێك شیرینکاریی کەروێشکەکەم نیشانی ژنە خاوەن ماڵەکەم دا، ئەو تەنیا بزەیەکی ماناداری هاتە سەر لێوی و هیچی نەگوت، بەڵام کاتێك شەو دوای تەواوبوونی نـمایش هاتـمەوە، دیم هاوڕێ بچووکەکەم ون بووە و کاتێکیش بەدوایدا گەڕام ژنە خاوەن ماڵ تەنیا سەرێکی لەقاندەوە و گوتی:

_ یان هەڵاتووە یان کەسێك دزیویەتی.

وابزام خۆی رێگەچارەیەکی کاریگەری بۆ ئەو کێشەیە دۆزیبووەوە!

لە «تونی پاندی»ەوە چووین بۆ شاری کانزایی «ئاب ویل» کە دەبوایە تەنیا سێ شەو لەوێ نـمایش بکەین. زۆریش خۆشحاڵ بووم لەوەی کە سێ شەو زیاتر لەوێ نامێنینەوە، چونکە ئاب ویل لەو سەردەمەدا شارەدێیەکی ترسناك و شێدار و سارد بوو کە لە چەند ریز خانووی ناشیرین و هاوشێوەی یەکدیی دروست بووبوو کە دوابەدوای یەکتری هەڵکەوتبوون و هەر کامەشیان چوار ژووری هەبوو کە بە چرای نەوتی رووناك دەبوونەوە. زۆربەی ئەندامانی گرووپ لە هۆتێلێکی بچووکدا نیشتەجێ بوون. خۆم و بەختم من لە لای بنەماڵەیەکی کانزاچیی(کرێکاری کانزا) ژوورێکم دەست کەوت کە هەرچەند بچووك بوو بەڵام راحەت و خاوێن بوو. شەوانە کە لە نـمایش دەبووینەوە و دەهاتـمەوە ماڵ، دەمدی شێوەکەمیان لە تەنیشت ئاگردانەکە داناوە بۆ ئەوەی لێم سارد نەبێتەوە.

ژنە خاوەن ماڵەکە، کە ژنێکی باڵابەرز و جوان و گەڕاوە بوو، هەمیشە خەرمانەیەك خەم و خەفەت بە دەموچاویەوە دیار بوو. بەیانییان خواردنی بۆ دێنام بەڵام کەمتر قسەی لەگەڵ دەکردم. من دەمبینی هەمیشە دەرگای چێشتخانەکەی داخراوە. هەموو جارێك کە شتێکم پێویست بوو دەبوایە تەقەم لێ دابایە و ئەویش تەنیا هێندەی درزێك دەرگاکەی دەکردەوە.

شەوی دووهەم لە کاتێکدا کە خەریکی نانـخواردن بووم، مێردەکەی هاتەوە. پیاوێك بوو تەقریبەن هاوتەمەنی ژنەکەی. ژنەکەی ئەو شەوە چووبوو بۆ شانۆ و دیارە زۆری پێ خۆش بووبوو. مێردەکەی چەند خولەکێك لە ژوورەکەی مندا وەستا و قسەی لەگەڵ کردم و مۆمێکی داگیرساویشی بە دەستەوە بوو وەك بڵێی ئامادەی نووستن بێت. لە پڕێکدا قسەکانی وەستاند و ماوەیەك بێدەنگ بوو، پێدەچوو پێشتر بیری لەو قسانە دەکردەوە کە دەیویست بیکات. ئاخرەکەی گوتی:

_ گوێ بدەنێ، من شتێکم هەیە لەوانەیە بۆ ئەو کارەی ئێوە دەیکەن سەرنـجڕاکێش بێت. ئاخۆ تا ئێستا ئینسانی «بۆقیی»(بۆق ئاسا)تان بینیوە؟. ئێوە مۆمەکە راگرن منیش چراکە. کەوتە رێ و بردمیە چێشتخانە و چراکەی لەسەر دۆڵابەیەکدا دانا کە پەردەیەك بە لای خوارەوەیدا هەڵواسرابوو. پەردەکەی بەرز کردەوە و گوتی:

_ «ژیلبێر»! ...وەرە دەرەوە!

گیانلەبەرێکی نیوە ئینسان و نیوە بۆق کە قاچی نەبوو" بە سەرێکی زل و قژی ساف و خورمایی، دەموچاوێکی بێ رەنگ و نەخۆش ئاسا، لووتی پان و دەمی زل و شان و باڵی پان و بە هێز، وەك خشۆکان خوشی و هاتە دەرەوە. ژێر پانتۆڵێکی«فەلانێل»ی لەبەردا بوو کە دەلینگەکانیان لە لای رانەوە بڕیبوون و هەر دە پەنـجەی قاچەکانی کە زل و کورت بوون، کەوتبوونە دەرەوە. گیانلەبەرێکی سەرسووڕهێنەر بوو کە تەمەنی هەم لە بیست ساڵ دەچوو هەم لە چل ساڵ. چاوی هەڵبڕی و بە رووما پێکەنی و ددانە زەرد و ناشیرین و دوور لە یەکەکانی خستە دەرەوە.

باوکی پێی گوت:

_ دەی ژیلبێر...! هەستە بزانم. . !

ئەو داماوەش سەرەتا لار دەبووەوە و پاشان بە یارمەتیی باسکەکانی ئەوەندەی بالای من بەرز بووەوە.

پیاوەکە گوتی:

_ پێتان وا نییە بۆ ئەم پیاوە بۆقییە لە سێرکێکدا کارێك بدۆزرێتەوە؟

من ئەوەندە ترسابووم کە بە زەحمەت توانیم وەڵامی بدەمەوە. بەڵام ناوی چەندین سێرکم بۆ برد و گوتم دەتوانێت نامەیان بۆ بنووسێت.

پیاوەکە ئەو ئینسانە بۆقییە داماوەی ناچار کرد هەندێ کار و یاریی تریش ئەنـجام بدات، بۆ نـموونە هەڵبەزێت بۆ سەرەوە، لە دیوار بچێتە سەرێ، یان خۆی بە دەسکەی کورسییەوە هەڵواسێت و هاوسەنگیی خۆی رابگرێت. کاتێك یارییەکانی تەواوبوو، من بە رواڵەت خۆشحاڵیی خۆم دەربڕی و دیارە واش نەبووم. پێش چوونەدەرەوە وتم:

_ شەوباش ژیلبێر!

ئەو بوونەوەرە داماوەش بە دەنگێکی کپ و خەفەوە وەڵامی دایەوە:

_ شەو باش!



چەندجار لە خەو راچڵەکیم و خۆم بە دەرگاکەوە خەریك کرد بزانم ئاخۆ باش داخراوە یان نا. بەیانیی رۆژی دوایی ژنی خاوەن ماڵ میهرەبانتر و شیرینتر لە جاران دەهاتە بەرچاو و گوتی:

_ وا دیارە دوێنێ شەو ژیلبێرت بینیوە! دیارە شوێنی نووستنی ئەو، ژێری دۆڵابەکەی چێشتخانە نییە، مەگەر ئەو شەوانەی کە ئەکتەرانی شانۆ میوانـمان بن.

لە پڕێکدا ئەو بیرۆکە ترسناکەم بە مێشکدا هات کە من شەو لە جێی ژیلبێردا نووستووم...!!!

لە وەڵامدا وتم: بەڵێ!

بە شەوق و تاسەیەکی دەسکرد و درۆیینەوە باسی ئیمکاناتێکم بۆ کرد کە بۆ دامەزراندنی ئەو لە سێرکێکدا هەیە.

ژنی خاوەن ماڵ سەرێکی لەقاندەوە و گوتی:

_ ئێمە زۆر جار بیرمان لەو مەسەلەیە کردۆتەوە.

پێدەچوو شەوق و تاسەکەی من- یان باشتر بڵێم شەوق و تاسە درۆیینەکەی من- بووبێتە هۆی خۆشحاڵیی ژنی خاوەن ماڵ. پێش چوونە دەرەوە، چووم بۆ چێشتخانە و ویستم خواحافیزیی لە ژیلبێر بکەم. هەوڵم دا ئاسایی و دۆستانە لەگەڵیدا رەفتار بکەم و دەستی درشت و پینەبەسراویم لەناو دەستمدا گوشی و ئەویش دەستی منی بە ئارامی گوشی.

پاش گەشتێکی چل حەفتەیی لە شارەکاندا، دواجار بۆ نـمایشێکی هەشت حەفتەیی چووین بۆ دەوروبەری لەندەن. لەبەر ئەوەی کە نـمایشی شێرلۆك هۆڵمێس سەرکەوتنێکی یەکجار زۆری بە دەست هێنابوو، بڕیار درا سێ حەفتە دوای گەشتی یەکەم، خۆمان بۆ گەشتێکی تر ئامادە بکەین.

لەو کاتەدا بوو کە من و سیدنی بڕیارمان دا ماڵە بچکۆلەکەی پاونێل تراس بە جێ بێڵین و خانوویەکی ئابڕوومەندانەتر لە شەقامی کنینگتۆندا بە کرێ بگرین. ئێمەش وەکوو مارەکان دەمانویست پێست بگۆڕین و هەرچییەکی رابردوومان بوو فڕێی بدەین.

لە گەشتی داهاتوودا رۆڵێکی بچووك لە شانۆنامەی شێرلۆك هۆڵمێسدا هەبوو کە من دەربارەی سیدنی لەگەڵ بەڕێوەبەری نـمایشدا قسەم کرد و داوام لێ کرد ئەو رۆڵە بە سیدنی بسپێرێت. بەڕێوەبەر قبووڵی کرد و لەبری ٣٥ شلینگ لە حەفتەیەکدا ئەو رۆڵەیان پێ سپارد. ئەمـجارەیان پێکەوە چووین بۆ گەشتی شارەکان.

سیدنی هەموو حەفتەیەك نامەی بۆ دایكمان دەنووسی. نزیكەی ئاخر و ئۆخرەكانی گەشتی یەكەم بوو كە نامەیەكمان لە شێتخانەی كین هیلەوە بۆ هات و تیایدا نووسرابوو كە حاڵی دایكمان باش بووەتەوە. ئای.... چ هەواڵێكی خۆش بوو! . دەسبەجێ هەوڵمان دا لەو شوێنە بیهێنینە دەرەوە تا لە «ڕیدینگ»دا یەك بگرینەوە و یەك بگرینەوە. بۆ ئەوەش كە جەژنی ئەو هەواڵە خۆشە بگرین، ئاپارتمانێكی گەورە و جوانمان بە كرێ گرت كە دوو ژووری نووستن و هۆڵێكی میوانداریی و پیانۆیەكیشی تێدا بوو و هەروەها چەپكە گوڵێك كە لە ژوورەكەی دایكمدا دانرابوو. لەگەڵ ئەوەشدا دەستووری چێشتێكی ڕێكوپێكیشمان دابوو.

ئینجا من و سیدنی چووین بۆ وێستگەی شەمەندەفەر تا بیهێنینەوە و هەردووكیشمان زۆر شادو خۆشحاڵ بووین. لەگەڵ ئەوەشدا من بە جۆرە نیگەرانییەكی تایبەتەوە و لەناو دڵی خۆمدا ئەوەم دەوت كە ئەگەر دایكم بزانێت ئەو پێوەندییە گەرمە و ئەو سۆز و خۆشەویستییەی جاران هەرگیز وەك خۆی نابێتەوە، چۆن دەتوانێت سەرلەنوێ جێی خۆی لەناو ئەو ژیانەی ئێمەدا بگرێتەوە.

دواجار شەمەندەفەرەكە هات. ئێمەش كە زۆر هەژابووین و لە هەمان كاتیشدا دڕدۆنگ بووین، بەوردی سەرنجی دەموچاوی ئەو مسافیرانەمان دەدا كە لە واگۆنەكانەوە دادەبەزین. دواجار دایكم لە حاڵێكدا كە بزەی لەسەر لێو بوو و بە هێمنی و لەسەرخۆ هەنگاوی دەنا، هات. كاتێك چووینە پێشوازی، هیچ هەژانێكی لە خۆی نیشان نەدا، بەڵام بە حاڵەتێكی تاڕادەیەك سۆزاوییەوە بە پیرمانەوە هات. گومان لەوەدا نییە كە ئەویش پێویستی بەوە هەبوو خۆی لەگەڵ ئەو بارودۆخە تازەیەدا بگونجێنێت.

لەو ماوەیەدا كە بە كالسكە لە شەمەندەفەرەوە تا ماڵەوە چووین، قسەمان لەسەر دەیان شتی جۆراوجۆر كرد و قسەمان لەسەر هەمو شتێك كرد.

كاتێك ئەو هەژانە سەرەتاییەی نیشاندانی ئاپارتمان و گوڵەكان و پیانۆكەی ناو ژوورەكەی دایكمان دامركایەوە، چووینە ناو هۆڵەكەوە و بە هەناسە بڕكێوە لە یەكترمان دەڕوانی. ئەو ڕۆژە ڕۆژێكی تاو و ساو بوو و ئاپارتمانەكەشمان لە كۆڵانێكی چۆڵ و ئارامدا بوو. بەڵام لەو ساتەدا ئەو بێدەنگییە شتێكی ئازاردەر بوو و چونكە حەزم دەكرد رازی و خۆشحاڵ بم، بەناچار كەوتمە شەڕ لەگەڵ ئەو خەمەی لەسەر دڵم نیشتبووەوە. دایكی داماوم كە بۆ شاد ژیان و رازییبوون، چاوەڕوانییەكی كەمی لە ژیان هەبوو، رابردوویەكی خەفەتهێنەری دەهێنایەوە یادم، لەگەڵ ئەوەشدا



دوایین كەس بوو لە دنیادا كە منی بەوجۆرە دڵتەنگ و خەمبار كردبێت. بەڵام من ئەوپەڕی هەوڵم خستە گەڕ تا ئەو هەستەم بشارمەوە. دایكم بڕێك پیر و بڕێكیش قەڵەو بووبوو. من هەمیشە شانازیم بە جل و بەرگ و هەڵسووكەوتی دایكمەوە دەكرد و چێژم لە جۆری پۆشینی جلوبەرگی دەبرد. زۆریش حەزم دەكرد بۆ جارێك لە باشترین حاڵەتیدا، نیشانی ئەندامانی گرووپم دابایە. بەڵام لەو ساتەدا تۆزێك شپرزە و شێواو دەهاتە بەرچاوم. وەك بڵێی هەستی بە حەپەساوییەكەم كردبێت، چونكە بە حاڵەتێكی پرسیاركەرانەوە ئاوڕی لێ دامەوە. منیش بە شەرم و حەیایەكی تەواوەوە تاڵێك لە قژە شێواوەكەیم بۆ ڕێك كردەوە و دەم بە بزەوە گوتم:

_ بەر لەوەی گرووپەكەمان بناسیت، حەز دەكەم لە باشترین شێوەدا دەربكەویت.

سەیرێكی كردم و پاشان قوتووی بۆدرەكەی دەرهێنا و تۆزێكی لە دەموچاوی دا و بە خۆشحاڵییەكی راستگۆیانەوە گوتی:

_ هەر ئەوەندەی زیندووم و نەمردووم، بۆ من جێی خۆشحاڵی یە.

بۆ راهاتن لەگەڵ بارودۆخی تازەدا كاتێكی ئەوەندەی نەبرد و خەم و خەفەتەكەی من هەر زوو رەوییەوە. ئەو باشتر لە ئێمە دەیزانی سەردەمی ئەو سۆز و میهرەبانییەی رۆژانی منداڵی بەسەر چوە و ئەو ساتانەی وا ئەوی﴿واتە دایكم﴾ لای ئێمە خۆشەویست دەكرد، كۆتایی هاتووە. كاتێك ئێمە لە گەشتدا بووین، ئەو كارەكانی دەرەوەی ئەنجام دەدا و شتی دەكڕی و میوە و شیرینی و هەمیشەش چەند چڵێك گوڵی دەكڕی. چونكە تەنانەت ئەو كاتانەش كە زۆر هەژار بووین و دایكم ئێوارانی شەمە بۆ شت كڕین دەچوە دەرەوە، هەمیشە دەیتوانی بایی یەك پێنی گوڵی شەوبۆ بكڕێت. هەندێ جار زۆر دڵتەنگ و خەمبار بوو و ئەو ساردوسڕییەشی خەمی دەخستە دڵی منەوە، چونكە لەناو ماڵدا بەشێوەیەك رەفتاری دەكرد وەك بڵێی میوانمانە نەك دایكمان.

دوای مانگێك ویستی بگەڕێتەوە بۆ لەندەن، زۆریش پەلەی بوو، پەلەكەشی هی ئەوە بوو هەرچی زووتر بچێت خانوویەك بە كرێ بگرێت تا كاتێك ئێمە لە گەشتەكەمان بووینەوە، جێگە و رێگەیەكمان هەبێت. لە لایەكی ترەوە وەك خۆی دەیوت لە ماڵدا بێت زیاتر بە قازانجمانە وەك لەوەی لەگەڵماندا سەفەر بكات و ئێمەش ناچار بین بلیتێكی زیادی بۆ ئەویش بكڕین.

ئاپارتمانی سەرەوەی سەرتاشخانەی شەقامی«چێستر»ی بە كرێ گرت كە پێشتریش لەوێ بووبووین. بە دوو لیرە پێش قستیش، مۆبڵێكی قستیی كڕی. دیارە ژوورەكانی ئەو ئاپارتمانە، نە

ئەوەندەی ژوورەکانی کۆشکی «ڤێرسای» گەورە و بەرچاوگیر بوون، نە هێندەی ئەوانیش جوان و دڵڕفێن بوون، بەڵام دایکم سندووقە پرتەقاڵی لەناو ژوورەکاندا دانا و بە قوماشێکی جوانی لە جۆری کەتان داپیۆشین، بە شێوەیەك کە شکڵی کورسییان بەخۆوە گرت. من و سیدنی پێکەوە چوار لیرە و پێنج شلینگ لە حەفتەیەکدا داهاتــمان بوو کە لەو پارەیە یەك لیرە و پێنج شلینگمان بۆ دایکمان دەنارد.

من و سیدنی لە کۆتایی گەشتی دووهەمدا گەڕاینەوە بۆماڵەوە و چەند حەفتەیەك لەگەڵ دایکماندا ژیاین. بە رواڵەت هەوڵمان دەدا وای نیشان بدەین خۆشحاڵین لەوەی کە لەگەڵیداین، بەڵام لە دڵەوە ئارەزوومان دەکرد هەرچی زووترە بچین بۆ گەشت. چونکە ئاپارتــمانەکەی شەقامی چێستر کەیف و خۆشیی ئاپارتــمانی شارەکانی تری نەبوو و هەروەها ئەو سەرگەرمییانەی تێدا نەبوو کە من و سیدنی پێیان راهاتبووین. بێگومان دایکیشم بەوانەی دەزانی. کاتی رۆشتنمان کە بۆ بەڕێکردنــمان هاتە وێستگەی شەمەندەفەر، بە رواڵەت وای نیشان دەدا خۆشحاڵە بەڵام هەردووکمان لەو کاتەدا کە لە تەنیشت شەمەندەفەرەکەدا راوەستابوو و بزەی دەهاتێ و دەسماڵەکەی بۆ رادەوەشاندین، بە تەواوەتی خەمو خەفەتــمان بە دەم و چاویەوە دەبینی.

لەکاتێدا کە خەریکی گەشتی سێهەممان بووین، دایکم نامەیەکی بۆ ناردین کە تیایدا نووسیبووی بە پێی کایە پێکەنیناوییەکانی چارەنووس، خانــمی لویز واتە زڕدایکەکەمان-کە رۆژگارێك من و سیدنی لە شەقامی کنینگتۆن لەگەڵیدا ژیابووین- لە هەژارخانەی لامبێسدا واتە هەر ئەو شوێنەی کە ئێمەیان ماوەیەك لەوێدا راگرت، ماڵاوایی لە ژیان کردووە و ئەو کوڕە بچووکەشی کە لە خوێندنگەی«هانۆڵ»دا بوو، بە تەنیا و بێکەس بەجێ هێشتووە“ هەمان ئەو خوێندنگەیەی کە من و سیدنیشی لێ بووین.

دایکم نووسیبووی کە سەردانی ئەو کوڕە بچووکەی کردووە و خۆی پێ ناساندووە و پێی وتووە کە من و سیدنی ماوەیەك لە شەقامی کنینگتۆندا لەگەڵ ئەو و باوکیدا ژیاوین، بەڵام کوڕەکە هەرچی بیری کردۆتەوە هیچی بەبیر نەهاتۆتەوە چونکە لەو کاتەدا تەمەنی چوار ساڵ زیاتر نەبووە. نووسیبووی کوڕەکە ئێستا تەمەنی دە ساڵانە و پاشناوەکەشی هەمان ناوی بنەماڵەی لویزە . ئەوەندەش کە دایکم بەدوایدا چووە، بێکەسوکارە. نووسیبووی منداڵێکی زۆر جوان و ژیکەڵەیە“ بێدەنگ و هێمنە و سیمایەکی غەمناکی هەیە. پاکەتێك نوقڵ و شیرینی و سێو و پرتەقاڵی بۆ



بردووەو بەڵێنیشی پێ داوە هەمیشە سەردانی بکات. دیارە دایکم تا ئەو کاتەی نەخۆش کەوت و ناچار بوو بگەڕێتەوە بۆ شێتخانەی کین هیل، هەروا سوور بوو لەسەر بەڵێنەکەی خۆی.

هەواڵی دووبارە نەخۆش کەوتنەوەی دایکم زەبرێکی گەورە بوو بۆمان، ئەگەرچی هەرگیز لە وردەکارییەکانی رووداوەکە ئاگادار نەبووینەوە. ئێمە تەنیا هەواڵێکی رەسمیمان پێ گەییشت کە دەیوت ئەویان وێڵ و سەرگەردان و لە کاتێکدا کە قسەی نابەجێی کردووە، لە کۆڵانەکاندا دۆزیوەتەوە. ئێمەش هیچ کارێکمان پێ نەدەکرا بێجگە لەوەی بەو چارەنووسە رەشەی دایکمان رازیی بین. ئەو هەرگیز عەقڵی خۆی بە دەست نەهێنایەوە. ئەو داماوە چەندین ساڵ لە شێتخانەی کین هیلدا توایەوە، بەڵام دواجار دۆخی ئابووریــمان باشتر بوو و توانیمان لەوێ بیهێنینە دەرەوە و بینێرین بۆ حەوانگەیەکی ئابڕوومەند.

هەندێ جار خواوەندەکانی بەدبەختی و چەرمەسەری، لە عەزیەت و ئازاردانی خەڵك ماندوو دەبن و کلاوڕۆژنەیەکی سۆز و میهرەبانییان بە روودا دەکەنەوە“ وەك چۆن بۆ ئێمە وەها شتێك هاتە ئاراوە. دایکم حەوت ساڵی کۆتایی ژیانی بە ئارامش و ئاسوودەیی و لەناو ﴿باخچەی﴾گوڵ و لەژێر تیشکی هەتاودا تێپەڕاند و کوڕە ئازاکانی خۆی دەبینی کە بە ناوبانگ و رێز و حورمەتێکی وەها گەییشتوون کە ئەو هەرگیز بیریشی لێ نەکردبووەوە.

❊❊❊

بە هۆی گەشتێکەوە کە خەریکی نــمایشکردنی شێرلۆك هۆڵمێس بووین، چەندین حەفتەی خایاند تا من و سیدنی توانیمان چاومان بە دایکمان بکەوێت. گەشت لەگەڵ گرووپی«فرۆمان»دا راوەستێنرا. لەو ماوەیەدا ئاغای «هاری یۆرك» خاوەنی شانۆی«ڕۆیاڵ» لە «بلاکبێرن»دا ئیمتیازی نــمایشکردنی شێرلۆك هۆڵمێسی لە فرۆمان کڕی بۆ ئەوەی لە شارە بچووکەکاندا نــمایشی بکات. منو سیدنی لەو گرووپە تازەدا دامەزراین بەڵام حەقدەستەکەمان کەم بووەوە بۆ ٣٠ شلینگ لە حەفتەیەکدا.

نــمایشکردن لە شارە بچووك و بێ ناونیشانەکانی باکوور و ئەویش لەگەڵ گرووپێکی بچووك و نەناسراودا داڕووخانێکی دڵتەزێن بوو. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر ئەو مەسەلەیە وای لێکردم ئەو گرووپە لەگەڵ گرووپەکەی پێشتردا بەراورد بکەم. هەوڵم دا ئەو بەراورد کردنەش نەك بە ئاشکرا بەڵکوو لە کاتی تەمرینەکاندا بیکەم. ئەویش بە بیانووی یارمەتیدانی دیکۆراتۆری شانۆکە، کە پەیتا

پەیتا دەربارەی کایەی سەرشانۆ و بەدوای یەکداهاتنی وەڵامەکان و مەسەلە تەکنیکییەکانی تر پرسیاری لێ دەکردم و منیش بە تایبەتیی بۆم روون دەکردەوە کە هەرکام لەو کارانە لە گرووپی فرۆماندا بە چ شێوەیەك ئەنجام دەدرا. دیارە ئەکتەرەکانی تر حەزیان لەو خۆ تێ کوتانەی من نەبوو و منیان بە کوڕێکی نانۆرماڵ(نائاسایی)دەزانی و بۆیان تەحەمول نەدەکرام. بڕێك دواتر دەرهێنەری تازە، کەوتە لەنج کردن لەگەڵم و بۆ ئەو قۆپچەیەی کە لە جلەکەمەوە داکەوتبوو و چەند جارێکیش هوشداری پێ دابووم، دە شلینگ لە حەقدەستەکەی کەم کردمەوە.

ویلیام ژیلت نووسەری شانۆنامەی شێرلۆك هۆڵمێس لەگەڵ«مێری درۆ» بە مەبەستی نواندن لە شانۆگەرییەك بە ناوی«کلاریسا» هات بۆ لەندەن. ئەو رەخنانەی کە لە شانۆگەرییەکە گیرا و هەروەها ئەو رەخنانەش کە لەجۆری دەربڕینی(ئەدا کردن) خودی ژیلت گیرا، بووە هۆی ئەوە کە لە وەڵامیاندا شانۆنامەیەکی کورتی یەك پەردەیی بنووسێت بە ناوی«دۆخی نالەباری شێرلۆك هۆڵمێس» کە خودی ژیلتیش تیایدا دەوری دەبینی بەڵام تاقە یەك قسەشی نەدەکرد. ئەو شانۆنامەیە تەنیا سێ رۆڵی هەبوو:دەوری ژنێکی شێت، خودی هۆڵمێس و خانە شاگردەکەی. وەك بڵێی دەنگێکی ئاسمانی بوو کە من تەلگرافێکم لە لایەن ئاغای ژیلتەوە بۆ هات و داوای لێ کردبووم بچم بۆ لەندەن و لە شانۆنامەکەیدا دەوری «بیلی» خانە شاگرد ببینم.

من هەر زۆر نیگەران بووم چونکە پێم وا بوو گرووپەکەمان ناتوانێت بۆ ئەو گەشتەی کە لە پێشیەتی، ئەویش لەو ماوە کەمەیدا کە هەیبوو، جێگرێك بۆ بیلی بدۆزێتەوە و منیش چەندین رۆژ لە چاوەڕوانییەکی تاقەتبڕ و بەئازاردا دەژیام. بەڵام دواجار گرووپ توانی«بیلی»یەکی تر بدۆزێتەوە.

گەڕانەوە بۆ لەندەن و نـمایشکردن لە شانۆی«وۆسست ئەند»دا بەڕاستی بۆ من وەکوو ژیانەوە و لەدایکبوونێکی تر وابوو. هەموو رووداوەکانی ئەوێ تەنانەت بچووکترینیشیان بۆم سەرنـجڕاکێش بوون: چوونم لە کاتی ئێوارەدا بۆ شانۆی«دووك دیۆرك» و چاوپێکەوتنم لەگەڵ ئاغای«پستانت»ی دەرهێنەر کە منی برد تا شوێنی «لۆژ»ەکە و لای ئاغای ژیلت. هەروەها قسەکانی ئاغای ژیلت دوای ئەوەی بەویان ناساندم و لێی پرسیم:«ئاخۆ حەز دەکەیت لەگەڵ من لە شانۆی شێرلۆك هۆڵمێسدا دەور ببینیت؟» و هەژانی من بۆ ئەو وەڵامەی کە دامەوە و گوتم:«ئاه...ئەی چۆن ئاغای ژیلت! »" هەموو ئەمانە بۆ من دڵخۆشکەر بوون. رۆژی دواتریش کە لەسەر شانۆ چاوەڕێی هاتنی کاتی تەمرینم دەکرد و خانـمی«مێری درۆ»م بۆ یەکەمـجار بینی کە جوانترین جلی سپیی هاوینەی لەبەردا بووا! .



چۆن راچڵەکیم کاتێك بوونەوەرێکی وەها جوانم لە وەها ساتەوەختێکی بەیانییدا بینی! . خانم بە کالسکەیەکی تایبەتیی ئینگلیزیی هاتبوو و پەڵە رەنگێکی لەسەر کراسە جوانەکەیدا بینیبوو و دەیپرسی ئاخۆ بەرپرسی کەرەسە پێویستەکان شتێکی هەیە ئەو پەڵە رەنگەی پێ پاك بکاتەوە؟ چونکە بەرپرسی کەرەسە پێویستەکانیش وەڵامێکی جیددیی نەدایەوە و دیار بوو هیچی پێ نییە ئەو کارەی بۆ بکات، ئەویش بە ناز و عیشوەیەکی مەیلەو تووڕەییەوە قیڕاندی:«ئاخ...خوایە...!

ئەو خانـمە هێندە جوان بوو کە من رقم لێی هەستابوو. بە هۆی گرژکردنی لێوە ناسکەکانیەوە، دەرنەختنی ددانە سپی و رێکوپێکەکانی، چەناگە جوان و دڵڕفێنەکەی، قژی رەشی وەك شەوەزەنگەکەی و هەروەها چاوە تاریك و رەمزاوییەکانی، هەمیشە لۆمەم دەکرد. ئەو تووڕەییە دەسکردە و ئەو جوانی و دەلالییەی ئەوم زۆر پێ ناخۆش بوو کە هەر بەو هۆیەشەوە بە دەستی هێنابوو. لەو هەموو ماوەیەی کە لەگەڵ بەرپرسی کەرەسە پێویستەکاندا قسەی دەکرد، هەرچەند من لە تەنیشتیدا وەستابووم و نوقمی جوانییەکەی بووبووم، بەڵام وەك نە بای دیبێ و نە باران، سووکە ئاوڕێکیشی لێ نەدامەوە. وەك بڵێی من هەر نامبینێت. من تازە تەمەنم بووبووە شانـزە ساڵ و نزیك بوون لەو بووکەڵە جوان و سەرنـجڕاکێشە وای لێ کردم هەوڵ بدەم دڵم بۆی نەکورکێنێ. بەڵام مەخابن! ... ئای خوایە...! چەند جوان بووا! هەور بوو، بروسکە بووا!

لە شانۆی یەك سێکانسیی «بارودۆخی نالەباری شێرلۆك هۆڵمێس»دا خانـمی«ئەیرن وانبرۆگ»کە ئەکتەرێکی زۆر بەتوانا بوو، دەوری ژنە شێتەکەی دەبینی و هەر ئەویش بوو کە لە هەموو ماوەی نـمایشەکەدا قسەی دەکرد، لە کاتێکدا هۆڵمێس تەنیا دانیشتبوو و گوێی رادەگرت. ئەوە شێوازێکی تایبەتیی ئەو بوو بۆ گاڵتەکردن بە رەخنەگرەکان. یەکەم وەڵامەکان من دەمدانەوە: بە دەنگ و هەرایەکی زۆرەوە دەچوومە ناو ئاپارتـمانەکەی هۆڵمێسەوە و خۆم بە دەرگاکانەوە هەڵدەواسی و هاوکاتیش جەماوەر وەك بڵێی تەپڵ لێ بدەن، بە مستەکۆڵە لە دەرگاکانیان دەدا. پاشان لە کاتێکدا کە من هەوڵم دەدا هەر چۆنێك بووە بارودۆخەکە بۆ هۆڵمێس روون بکەمەوە، ژنە شێتەکە دەهاتە ژوورەوە! ئەو ژنە دەربارەی کارێك کە دەیویست بە هۆڵمێسی بسپێرێت، ماوەی بیست خولەك قسەی نابەجێ و هیچ و پووچی دەکرد. هۆڵمێس بە نهێنیی شتێکی دەنووسی و زەنگێکی لێ دەدا و نووسینەکەی دەدایە دەست من. بڕێك دواتر دوو پیاوی زل و زەبەلاح دەهاتنە ژووری و ژنە شێتەکەیان

به راكێش راكێش دەبردە دەرەوە و من و هۆڵمێسیان بە تەنیا بە جێ دەهێشت. منیش دەموت:«حەقت بوو گەورەم! هەر شێتخانە بۆی باشتر بوو! ».

ڕەخنەگران ئەو گاڵتەیان زۆر بە دڵ بوو، بەڵام «كلاریسا» واتە هەمان ئەو شانۆنامەیەی كە ژیلت بۆ خانـمی«میری درۆ»ی نووسیبوو هیچ سەركەوتنێكی بە دەست نەهێنا. رەخنەگران وێڕای پیاهەڵدانیان بە جوانیی خانـمی «میری درۆ»دا گوتیان بەداخەوە تەنیا جوانییەكەی ئەو بەس نییە بۆ ئەوەی مێلۆدرامێك سەركەوتوو بێت. هەربۆیە ژیلت باقیی وەرزەكەی بە نـمایشكردنی شێرلۆك هۆڵمێس دایە سەر و منیشیان بۆ رۆڵی بیلی دامەزراند.

من زۆر خۆشحاڵ بووم كە لەگەڵ ئەكتەر و هونەرمەندێكی ناوداری وەك ژیلتدا نـمایش دەكەم و ئەوەندەش تووشی هەژان بووبووم كە لە بیرم چوەوە باسی هەلومەرجی گرێبەستی دامەزراندنەكەمی لەگەڵ بكەم. دواجار لە كۆتایی حەفتەدا، وەك كەسێك كە بیهەوێت داوای لێبوردن بكات، لێم نزیك بووەوە و پاكەتێكی بە دەستەوە بوو كە بۆ منی هێنابوو. پێی وتم:

_ بەڕاستی زۆر شەرمەزارم كە ناتوانم لەو بڕە پارەیە زیاترت بدەمێ. بەڵام لە ڕێكخراوی «فرۆمان»دا پێیان وتم كە دەبێ هەر ئەو حەقدەستەت بدەمێ كە پێشتر وەرت دەگرت واتە دوو لیرە و دە شلینگ.

من هەم سەرم سووڕ ما و هەمیش خۆشحاڵ بووم.

لە كاتی تەمرینی شانۆنامەی شێرلۆك هۆڵمێسدا، جارێكی تر خانـمی میری درۆم جوانتر و دەلالتر لە جاران بینییەوە و هەرچەند بڕیارم دابوو نەهێڵم وەسوەسەم بكات بەڵام وردە وردە هەستم كرد كە خەریكە دەكەومە گێژاوی عەشقێكی بێ ئاكام و خامۆشەوە. لەو خاڵە لاوازەی خۆم بێزار بووم و زۆر لە خۆشم تووڕە بووم كە بۆچی ناتوانم خۆم رابگرم و ناتوانم كەسایەتیی خۆم بپارێزم. هەستێكی تێكەڵ پێكەڵم هەبوو:واتە هەر لەو كاتەدا هەم لەو ژنە بێزار بووم و هەمیش خۆشم دەویست“ جیا لەوەش ئەو بە راستی جوان و دڵڕفێن بوو و هەروەها یەكێك لە میهرەبانترین ژنەكان بوو.

ئەو لە شانۆنامەی هۆڵمێسدا دەوری خانـمی«ئالیس ڤاڵكنێر»ی دەبینی و ئێمەش هیچ سێكانسێكمان نەبوو كە تیایدا پێكەوە دەور ببینین. بەڵام من هەمیشە چاوەڕێی ئەوەم دەكرد ئاخۆ كەی لەناو راڕەو یان لەسەر پلیكانەكان بەرەوڕووی ببمەوە و شڵەژاو و حەپەساو شەوباشێكی پێ بڵێم و



ئەویش بە رووكراوەییەوە وەڵام بداتەوە:«شەوباش! » و لەنێوان من و ئەودا لەو تاقە وشەیە زیاتر هیچ پێوەندییەكی تر لە ئارادا نەبوو.

شانۆنامەی هۆڵمێس سەركەوتنی باشی بەدەست هێنا. «شاژن(مەلەكە) ئەلكساندر» شەوێكیان لەو نـمایشەدا ئامادە بوو. لە لۆژی پاشایەتیدا لەگەڵ پاشای یۆنان و شازادە«كریستیان»دا دانیشتبوون. بێگومان شازادە باسی ئەو شانۆیەی بۆ پاشا دەگێڕایەوە. لە هەستیارترین كاتدا واتە ئەو كاتە كە من و هۆڵمێس بە تەنیا لەسەر شانۆ بووین و هەردووكیشمان بێدەنگ بووین، دەنگێكی گڕ لە هۆڵەكەوە بەرز بووەوە كە دەیوت:«بۆ منی مەگێڕەرەوە! بۆ منی مەگێڕەرەوە! ».

«دیۆن بۆسیكلێت» لە شانۆی دووك دیۆركدا بۆ خۆی جێگە و پێگەیەكی هەبوو و هەر كاتێك بەوێدا تێدەپەڕی، بە لێدانێكی زۆر نەرم و بچووك ئافەرینی لێ دەكردم“ رێك وەكوو «هاڵ كین» كە زۆربەی كات بۆ بینینی ژیلت دەهاتە بەشی پشتەوەی شانۆ. تەنانەت جارێكیان ئەو شانازییەم پێ بڕا كە لۆرد«كیچنەر» زەردەخەنەیەكی بۆ كردم.

لەو كاتەدا كە شانۆی شێرلۆك هۆڵمێسمان نـمایش دەكرد، «سێر هێنری ئیروینگ» كۆچی دوایی كرد و منیش لە ڕێوڕەسمی بە خاك سپاردنی لە كڵێسەی«وێست مینستر»دا ئامادە بووم. چونكە من یەكێك لە ئەكتەرەكانی شانۆی وێست ئەند بووم، بەڵگەی تایبەتیی هاتوچۆیان پێدابووم و لەو روەشەوە شانازییم بە خۆوە دەكرد. لە كاتی ئەنـجامدانی ڕێوڕەسمە ئایینییەكەدا لە ناوەڕاستی كەسانێكی بەناوبانگی وەك«لویس واڵەر» و دكتۆر«واڵفرێد بادی»دا دانیشتبووم. لویس واڵەر دەموچاوێكی مۆن و خۆپەرستی هەبوو و لەو سەردەمەدا بە بوتی ئەفسانەیی شانۆكانی لەندەن لە قەڵەم دەدرا. دكتۆر واڵفرێد بادی بۆ گێڕانی دەوری پزیشك و نەشتەرگەران بەناوبانگ بوو و هەمیشەش ئەو دەورانەیان پێ دەسپارد و منیش دواتر لە شانۆیەكدا لاساییم كردەوە. لەو ساتەدا واڵەر، لایەكی روخسارە جوانەكەی دەرخستبوو و لەوە دەچوو لە جێی خۆیدا وەك بزمار داكوترابێت و نە سەیری لای راستی دەكرد و نە لای چەپ. بەڵام دكتۆر بادی بۆ ئەوە لە كاتی ناردنە خوارەوەی تەرمی «سێر هێنری»دا باشتر ببینێت، پەیتاپەیتا قەبری «دووك »ێكی لەبەرچاوە تووڕە و قەڵسەكانی ئاغای واڵەردا پێخوست دەكرد. من بەش بەحاڵی خۆم وازم لە هەموو جۆرە سەیركردنێك هێنا و لە جێی خۆمدا دانیشتم و تەنیا پشتی ئەو كەسانەم دەبینی كە لەبەردەممدا راوەستابوون.

دوو حەفتە بەر لە دوایین نـمایشی شێرلۆك هۆڵمێس، ئاغای بوسیکلێت، بەڵگەیەکی پێ دام کە بیبەم بۆ لای ئاغا و خانـمی کەنداڵ کە زۆر بەناوبانگ بوون، بەو ئومێدەی کە لە شانۆنامە تازەکەیاندا رۆڵێکم بدەنێ. کاتی چاوپێکەوتن کاتژمێر ١٠ ی بەیانیی بوو و دەبوایە لە نووسینگەی شانۆدا چاوم بە خانـمی کەنداڵ بکەوێت. خانـم بیست خولەك درەنگ هات. . ! . دواجار تارماییەك لە دوورەوە لە کۆڵانەکەوە دەرکەوت کە خانـمی کەنداڵ بوو. ژنێکی قەبە و قەڵەو کە کاتێك چاوی پێم کەوت گوتی:

_ ئاه...ئەو گەنـجە تۆیت؟! ئێمە بەم زوانە بە شانۆگەرییەکی تازەوە گەشتێك بۆ شارەکان دەست پێ دەکەین و من حەزم دەکرد تۆ رۆڵەکەی خۆت لەبەردەممدا بـخوێنیتەوە. دیارە ئێستا زۆر سەرقاڵین. ئاخۆ دەکرێت بەیانی هەر لەم کاتەدا بێیتەوە بۆ ئێرە؟

_ بە سارد و سڕیی وەڵامم دایەوە:

_ بە داخەوەم خانـم، من هەرگیز ناتوانم لە دەرەوەی لەندەندا کارێك قبووڵ بکەم.

کڵاوەکەم هەڵگرت و لە نووسینگەی شانۆکە چوومە دەرەوە. بانگی ئەو کالسکەیەم کرد کە لەوێوە و.... ئەوەندەی لە بیرم مابێت، ١٠ مانگی رەبەق بێکار بووم ! ! .

دوایین شەوێك کە شانۆی شێرلۆك هۆڵمێس لە شانۆی دووك دیۆرکدا نـمایش کرا و خانـمی مێری دەبوایە رۆژی دواتری بگەڕێتەوە بۆ ئامریکا، من تاك و تەنیا کەوتـمە ناو شەقامەکان و بڕیارم دا ئەو خەم و خەفەتەم لەناو ئەڵکوڵدا نوقم بکەم. دوو سێ ساڵ دواتر «مێری»م لە «فیلادێلفی»دا بینییەوە. لەوێدا کردنەوەی شانۆیێکی تازەی رێبەرایەتیی دەکرد کە دەبوایە منیش هاورێ لەگەڵ گرووپی فرێد کارنۆ تیایدا نـمایش بکەم. هەر ئەو جوانی و دڵڕفێنییەی جارانی هەبوو. لەو کاتەدا کە ئەو خەریکی لێدوانێکی بچووك بوو، من لە پشتەوەی شانۆدا بەو گریـمەی کردبووم، تەماشام دەکرد بەڵام بە هۆی شەرمنییەوە نەمتوانی خۆمی پێ بناسێنم.

لەو کاتانەدا کە نـمایشەکانی شێرلۆك هۆڵمێس لە خودی لەندەندا کۆتایی دەهات، گەشتی دەرەوەی لەندەنیش کۆتایی دەهات، ئیتر من و سیدنی بێکار ماینەوە. بەڵام سیدنی کاتی خۆی بۆ دۆزینەوەی کار بە فیڕۆ نەدا" لە رۆژنامەیەکی پیشەییدا بە ناوی«ئارا »کە تایبەت بە شانۆ و ئەو بابەتانە بوو، رێکلامێکی بینی و لەناو گرووپێکی ئاکرۆباتدا بەناوی گرووپی «چارلی مانێن»دا دامەزرا. لەو سەردەمەدا ئەو جۆرە گرووپانە زۆر بوون و لە بارِەکاندا گەشتیان دەکرد و زۆربەیان



ئەکتەری لاساییکەر بوون. چەند کۆمێدییەکی گاڵتەجاڕیی و پێکەنیناوییان نـمایش دەکرد کە مۆسیقایەکی شاد و دڵخوازیشیان لەگەڵدا بوو. خەڵك پێشوازیی زۆر باشیان لێ دەکردن. بەناوبانگترین و سەرنـجڕاکێشترینی ئەو گرووپانە گرووپی فرێدکارنۆ بوو کە چەندین بەرنامەی کۆمێدییان هەبوو. ناوی هەموو ئەو کۆمێدیەنانە بە ناوی باڵندە دەستی پێ دەکرد، بۆ نـموونە:«ئەو باڵندانەی کەڕەی بەیانی بخەبر دێن»، «باڵندە فیکەکەرەکان» ، «باڵندە بەدفەڕەکان» و...

کارنۆ بەدەست پێکردن لەم سێ کۆمێدییە بچووکەوە، رێکخراوێکی گەورەی درامای دامەزراند کە لەخۆگری زیاتر لە ٣٠ کۆمپانیی دەبوو کە هەر لە نـمایشە پانتۆمیمەکانی نۆئێلەوە بگرە تا کۆمێدیی مووزیکاڵیان هەبوو. وە لە قوتابـخانەکەشیەوە ئەکتەرانێکی گەورەی وەك «فرێد کەیچن»، «جۆرج گریوز»، «چارلی بێل» و زۆر کەسی تریش پەروەردە بوون و دەرکەوتن.

هەر لەو کاتەدا کە سیدنی لە گرووپی «مانن»دا کاری دەکرد، فرێدکارنۆ چاوی پێ کەوت و بە حەقدەستێکی چوار لیرە لە حەفتەدا دایـمەزراند. من کە چوار ساڵ لە سیدنی بچووکتر بووم، لە لای بەرێوەبەرێکی شانۆدا حیسابێکی ئەوتۆم بۆ نەدەکردا﴿ بە واتایەکی تر" بە پیاوی نەدەزانیم﴾، بەڵام لەو ماوەیەدا کە لە لەندەندا نـمایشم دەکرد، هەندێك پارەم پاشەکەوت کردبوو و لەو کاتەدا کە سیدنی لە گەشتەکانی خۆیدا بوو، من لە شاردا مابوومە و کاتم لە بارِەکاندا بەسەر دەبرد.

## ٦

## یەکەمین خۆشەویستی

تازە گەیشتبوومە ئەو تەمەنە قەیرانیی و پڕ لە خرۆشانەی هەرزەکاری و، هەمان ئەو هەستانەم هەبوو کە هەموو کوڕە شانـزە تا هەژدە ساڵەکان هەیانە. من لایەنگری ئەو رۆڵانەبووم کە تێکەڵ بوون بە نەترسی و بێ باکی و هەروەها حەزم لە مێلۆدرام بوو“ واتە ئەو دراماییانەی خەڵکی رەشۆکی حەزیان لێ بوو. ئینسانێك بووم هەمیشە فرمێسکم ئامادەی هەڵڕژان بوو و بەدەست ژیانەوە هەراسان بووم و لەگەڵ ئەوەشدا دەمپەرست“ بە کورتی، فکر و رۆحی من هێشتا لەناو شیلەیەکدا بوو کە هەندێ جار باڵقبوون و کامڵبوونی پێوەدیار بوو. لەناو ئەشکەوتێکی پڕ لە ئاوێنەی ناشیریندا گیرم خواردبوو و جاروبارە هەستی پلەوپایەخوازییم سەری قوت دەکردەوە. وشەی«هونەر» نە بەناو مێشکمدا چوو و نە لە قاموسیشمدا مانایەکی دۆزییەوە. شانۆ بۆ من تەنیا ئامرازێك بوو بۆ دابین کردنی بژێویی ژیان و هیچی تر.

دواجار لە سێرکی«کەیسی»دا لە دیـمەنێکی گاڵتەجاڕیی لە نـمایشێك بەناوی«دیك توربینی چەتە»دا و هەروەها لە نـمایشێکدا لەگەڵ دکتۆر واڵفرێد بادی، دەورێکم دۆزییەوە. لەگەڵ دکتۆر بادیدا زیاتر سەرکەوتوو بووم چونکە نـمایشی ئەو، هەندێك لە کۆمێدیی گاڵتەجاڕ پێشکەوتووتر و لەسەرتر بوو. لەوێدا دەوری من لاساییکردنەوەی پرۆفیسۆرێکی بیرمەند بوو کە من باش توانیم خۆم وەك ئەو لێ بکەم. من ئەکتەری پلە یەکی گرووپ بووم و حەفتەیەك سێ لیرە حەقدەستم وەردەگرت. چەند کوڕی بچووکیش هەبوون کە دەوری مرۆڤە گەورەکانیان لەناو کۆڵانێکی تەسکدا دەبینی. بەڕای من ئەوە نـمایشێکی پلەخوار(پەست) و کەم بەها بوو. بەڵام هەر ئەوەش دەرفەتی بۆ رەخساندم کە تواناکانی خۆم لە نواندندا کامڵتر بکەم.

کاتێك سێرکی کەیسی لە لەندەندا نـمایشی دەکرد، شەش کەس لە کوڕەکان لە شەقامی کنینگتۆندا خانووی بێوەژنێکی ٦٥ ساڵە بە ناوی«فیلڵدز»مان بەکرێ گرت کە سێ کچی هەبوو.



بەناوەکانی: فێردریکا، تێلما، فۆب. فێردریکا مێردی بە وەستایەکی مۆبڵساز رووسی کردبوو کە پیاوێکی زۆر میهرەبان، بەڵام ناشیرین و خوێنتاڵ بوو و دەموچاوی لە دەموچاوی تاتارەکان دەچوو“ قژی خورمایی و سمێڵیشی سپیی و چاوێکی برێك خێل بوو. ئێمە هەر شەشمان لە چێشتخانەدا نانـمان دەخوارد و هەربۆیە لەگەڵ هەموو ئەندامانی بنەکاڵەکەدا، ناسیاویی تەواومان پەیدا کردبوو. بەڵام سیدنی لە لەندەندا کاری دەکرد و هەر لەوێشدا خانووی گرتبوو.

کاتێك وازم لە سێرکی کەیسی هێنا و چووم، دیسانەوە گەڕامەوە بۆ شەقامی کنینگتۆن و هەر لە خانوەکەی خاتوو«فیلڵدز»دا دانیشتم. پیرەژنێکی یەکجار زەحمەتکێش و هێمن و لەسەرخۆ بوو و تەنیا سەرچاوەی داهاتی، هەر ئەو سێ ژوورە بوون کە بە کرێی دەدان. کچە گەورەکەی واتە فێردریکا کە مێردی هەبوو، لە ماڵی مێردەکەیدا دەژیا. تێلما و فۆب لەگەڵ دایکیاندا بوون و لە راپەڕاندنی کارەکانی ماڵەوە یاریدەی دایکیان دەدا. فۆب تەمەنی ١٥ ساڵ بوو و زۆریش جوان بوو. دەموچاوێکی سەرنـجڕاکێشی هەبوو کە مرۆڤی دەخستە ژێر کاریگەریی خۆیەوە. منیش هەم لەڕووی جەستە وهەم لەڕووی رۆحییەوە تەواو بۆی دەسووتام. سەرەڕای هەموو ئەوانە شەرم لەگەڵ مەیلە دەروونییەکانـمدا دەکرد، چونکە هێشتا تەمەنم نەگەیشتبووە ١٧ ساڵ و ئیحساسیشم لە بەرانبەر کچاندا هەستێکی پاكو شەرافەتـمەندانە بوو. لە هەمان کاتدا ئەویش کچێکی پاك و پیرۆز بوو و هەر بۆیە هیچ شتێك لە نێوانـماندا رووی نەدا. بەڵام ئەویش حەزی لە من کرد و بووین بە هاوڕێی یەکتری.

ئەندامانی بنەماڵەی فیلڵدز، کەسانێکی زۆر هەستیار و دڵناسك بوون و هەندێ جار دەمقاڵە و شەڕەدەندووکی گەورە لە نێوانیاندا ساز دەبوو. ئەو شتانەی کە دەبوونە هۆی شەڕکردنەکانیان، زیاتر ئەوە بوو کە بۆ نـموونە ئەمڕۆ نۆرەی کێیە کارەکانی ماڵەوە راپەڕێنێت! تێلما کە تەمەنی نزیکەی ٢٠ ساڵ دەبوو، سیمای خانـمە لەخۆباییەکانی بەخۆوە دەگرت و ئامادە نەبوو تاقە کارێکی بچووکیش بکات. ئەو تەمەڵە هەمیشە دەیوت کە نۆرەی فێردریکا یان فۆبە. چەنەبازییەکانیان وردە وردە دەگۆڕان بە دەم هەراشی و جنێو بە یەکدان و تەنانەت گرێ لەبیرکراوەکانیشیان دەخستەوە روو و شتە نهێنییەکانی یەکتریشیان ئاشکرا دەکرد. بۆ نـموونە خاتوو فیلڵدز دەیوت: تێلما لەو رۆژەوەی کە ئەو پارێزەرە لاوە«لیڤەرپۆلیی»ی ناسیوە و هاتوچۆی ماڵی دەکات، خۆی کردووە بە خانـم و پێی وایە ماڵداریکردن، لە شان و شکۆی کەم دەکاتەوە! . پاشان دوای چەنەبازییەکەشی بەو دەرەنـجامە دەگەییشت کە:«باشە ئەگەر تۆ بوویتە بە خانـم، بچۆرەوە بۆ لای پارێزەرە لیڤەپۆلییەکەت و لەگەڵیدا

بژی...ئەوەشت لەبیر بێت کە ئەویش نەتساوێ بە فلانە شوێنیدا». بۆ ئەوەش کە زیاتر لایەنی ناشیرینی قسەکانی نیشان بدات، پیاڵەیەکی چاخواردنەوەی لەسەر مێزەکەوە هەڵدەگرت و دەیدا بە تەختی زەویدا و دەبووە سەد پارچەوە. تێلماش کە لە پشت مێزێکدا دانیشتبوو، لە جێی خۆی نەدەجوولا و وەك خانمێکی بەفیز و لەخۆبایی، مێشێکیش نەدەبووە میوانی! پاشان ئەویش بە ئارامی و لەسەر خۆ پیاڵەیەکی چاخواردنەوەی هەڵدەگرت و بەری دەدایەوە و دەشکا و ئنجا دەیوت:«لەوانەیە چەقۆ گەیشتبێتە سەر ئێسقانی منیش». دیسان پیاڵەیەکی تریشی هەڵدەگرت و ئەویشی دەشکاند و پاشان پیاڵەیەکی تر و دیسان یەکێکی تر و ...ئەوەندەی کە بەرەپێی ژوورەکە پڕ دەبوو لە چینیی و شووشەی شکاو. دایك و خۆشکە داماوەکانیش بە ناچار هەر چاویان لێ دەکرد. دایکە دەینالاند و دەیوت، چاوی لێکەن! لەو کارە قۆڕانەی! » و ئەوەندە تووڕە بوو کە قەندانەکەشی(شەکردان) دەدایە دەستی و دەیوت:«فەرموو، ئەگەر شتی تر شك نابەیت بۆ شکاندن، ها... ئەمە بشکێنە! » و تێلماش بەوپەڕی بێ حەیاییەوە قەندانەکەشی وەردەگرت و خەمساردانە دەیویست دایبخات و بیشکێنێت.

لەو جۆرە کاتانەدا فۆب ڕۆڵی داوەری دەگێڕا. ئەو کچێکی دادپەروەر و بە ویژدان بوو و ڕێز و حورمەتی گەورەکانی ماڵەوەی رادەگرت. زۆربەی جار پێشنیاری دەکرد کە خۆی کارەکانی ماڵەوە بکات و بەوجۆرە دەیویست کۆتایی بە شەڕەکە بێنێت بەڵام تێلما قبووڵی نەدەکرد.

نزیکەی سێ مانگ دەبوو بێکار بووم و سیدنی خەرجیی دەکێشام، واتە بڕی ١٤ شلینگی بە خانمی فیلدز دەدا بۆ خانووەکەی. ئەو لە گروپی فرێد کارنۆدا بۆ خۆی بووبوو بە هونەرمەندێکی بەناوبانگ و بایەخیان پێ دەدا و چەندین جاریش لەگەڵ ئاغای کارنۆدا باسی برا بچووك و بەهرەدارەکەی واتە منی کردبوو، بەڵام ئاغای کارنۆ گوێی بەو قسانە نەدەدا، چونکە پێی وابوو ئەمن هێشتا زۆر منداڵ و کرچ و کاڵم.

لەو سەردەمەدا ئەکتەرە جوولەکەکان لە لەندەندا زۆر بەناوبانگ بوون و منیش بیرم لەوە کردەوە کە بە دانانی ردێنی«فائۆریی»خۆم بگۆڕم. سیدنی دوو کتێبی پێ دام و خۆشم هەندێك بنەمای مۆسیقای پێوەندیدار بە گۆرانی و هەندێکیش دیالۆگی کۆمێدییم لێ زیاد کردن کە لە کتێبێکی گاڵتە و نوکتە ئامریکاییەکاندا بەناوی«بووجەی مادیزۆن» هەڵم گرتبوونەوە. چەند حەفتەیەك



لەبەردەم بنەماڵەی فیلدزدا تەمرینم کرد. ئەوان زۆر حەزیان لێ دەکرد بەڵام تەنیا تەشویقیان دەکردم و هیچی تر.

لە «مووزیك هۆڵ»ی فۆرستردا کە شانۆیێکی بچووك بوو لە تەنیشتی«مایل ئەندرۆد» ، لە گەڕەکی کەلیمییەکاندا بۆ ماوەی حەفتەیەك بە بێ حەقدەست و بۆ تاقیکردنەوە دامەزرام. پێشتریش هەر لە هەمان شوێندا و لەگەڵ سێرکی کەیسیدا کارم کردبوو و بەڕێوەبەری «مووزیك هۆڵ» لەو باوەڕەدا بوو کە چونکە منداڵێکی بەهرەمەندم دەبێ دەرفەتم پێ بدرێت تا تواناکانم دەربخەم. هەموو ئومێد و خەونەکانی داهاتووم بەند بوون بەو حەفتە تاقیکارییەوە. پاش نمایشکردن لە شانۆی فۆرستردا رەنگە لە هەموو نمایشە گەڕۆك و گرینگەکانی بەریتانیادا نمایشم بکردایە و کێ چووزانێت رەنگە ساڵێك دواتر لە ڕێکلامەکاندا ناوی من لە سەرووی هەموو ناوەکانەوە بێت. بەڵێنم بە بنەماڵەی فیلدز دابوو کە ئەگەر نمایشەکەم سەرکەوتوو بێت، بۆ هەموویان بلیت دەکڕم.

فۆب گوتی:

_ من پێم وایە تۆ ئەگەر لە نمایشەکەدا سەربکەویت ئیتر لەگەڵ ئێمەدا ناژیت.

منیش بە نەرمییەکی تایبەتەوە وتم:

_ نا نا حەتمەن لێرە دەمێنمەوە.

نیوەڕۆی ڕۆژێکی دووشەمە بوو و کاتی تەمرین کردن بوو لەگەڵ ئۆرکێستر بۆ گۆرانی و دیالۆگە کۆمێدییەکان و منیش وەك ئەکتەرێکی پرۆفیشناڵ تەمرینەکانم بە سەرکەوتوویی تەواو کردبوو، بەڵام بیرم لە گریم و ئارایشتەکەم نەکردبووەوە و نەمدەزانی چۆن خۆم ڕێك بخەم. چەندین کاتژمێر بەر لە نمایشی شەو، لەناو ژوورە بچووکەکەمدا مامەوە و خەریکی خۆم بووم، بەڵام بەو هەموو رەنگ و رۆنەوە کە مەسرەفم کرد، دیسان نەمتوانی کەم تەمەنیی خۆم بشارمەوە. زۆر هەوڵم دا ڕۆڵێکی گرینگم نەبێت بەڵام نمایشەکەی من تا رادەیەك دژە جوولەکە بوو و گاڵتەکانیشم وەکوو قسەکردنەکەم نەك تەنیا کۆن و دێمۆدە بوون، بەڵکوو زۆریش بێتام بوون. جیا لەوەش خۆشم پێکینیناویی نەبووم.

پاش دوو سێ گاڵتە کردن، جەماوەر دەستی کرد بە هاوێشتنی سکە و توێکڵە پرتەقال و پێ لە زەوی دان و هوو کردن و ...سەرەتا نەمدەزانی بارودۆخەکە چۆنە و پاش بڕێك ترس دایگرتم. منیش خێراتر بووم و ریتمی قسەکردنم خێراتر کرد بەڵام هووتاف کێشان و قرم و قاڵ و جەنجاڵ و جنێودان و

فرێدانی سکە و توێکڵە پرتەقاڵ هەر بەردەوام بوو. کە لەسەر شانۆکە هاتمە خوارەوە، چاوەڕێی را و بۆچوونی ئاغای بەڕێوەبەرم نەکرد و یەکسەر چووم بۆ ژوورەکەی خۆم و گریمەکەم پاك کردەوە و شانۆکەم بەجێ هێشت و ئیتر هەرگیز نەگەڕامەوە بۆ ئەو شوێنە، تەنانەت بۆ وەرگرتنەوەی نووسینەکانیشم.

کاتێك گەیشتمە شەقامی کنینگتۆن، شەو درەنگانێك بوو و بنەماڵەی فیلدز خەویان لێ کەوتبوو و من لەو روەوە زۆر خۆشحاڵ بووم. بەیانیی لەسەر سفرەی سۆحانە، خانمی فیلدز پرسیاری کرد کە نمایشی شەوی رابردوو چۆن بوو؟ منیش خۆم گێل کرد و وتم:«ئەی... باش بوو! تەنیا دەبێ هەندێك گۆڕانکاریی لە گریمەکەمدا بکەم».

خانم پێی گوتم کە فۆب شەوی رابردوو هاتووە بۆ بینینی من بەڵام لەبەر ئەوەی کە زۆر شەکەت بوو و خەوی دەهات، هیچ قسەیەکی بۆ نەکردین. کاتێك چاوم بە فۆب کەوت هیچی نەگوت‌و منیش دەنگم نەکرد. جیا لەوەش نە خانمی فیلدز لەو بارەوە قسەی کرد و نە هیچکام لە ئەندامانی بنەماڵە و کەسیشیان سەری لەوە سووڕ نەما کە بۆچی من لەوە بە دواوە درێژەم بە کارە شانۆییەکانی خۆم نەدا.

شوکر بۆ خوا سیدنی هێشتا لە گەشتدا بوو و لەوەش رزگارم بوو کە دانیشم و کارەساتی ئەو شکستەمی بۆ بگێڕمەوە. بەڵام پێدەچوو خۆی زانیبێتی یان یەکێك لە ئەندامانی بنەماڵەی فیلدز بۆیان گێڕابێتەوە، چونکە هەرگیز لەو بارەوە هیچی لێ نەپرسیم. زۆر هەوڵم دا بیرەوەریی ئەو شەوە ترسناکە لە مێشکدا بسڕمەوە، بەڵام ئەو شکستە کاریگەرییەکی خراپی لەسەر باوەڕ بەخۆبوونم دانا. ئەو ئەزموونە تاڵە فێری ئەوەی کردم بە چاوێکی واقیعبینانەترەوە لەخۆم بڕوانم. زانیم کە ئەکتەری کابارە نیم، توانای ئەوەم نییە کە لە نێوان خۆم و کۆمەڵە خەڵکێکدا کەش و هەوایەکی خۆش و دۆستانە بخوڵقێنم و بەو قسەیەش دڵی خۆم خۆش دەکرد کە من تەنیا ئەکتەرێکی ئاساییم و هیچی تر. بە هەر حاڵ پێش ئەوەی کە __ بە قەولی شارەزایان__ تۆزێك بێمەوە سەرخۆ، چارەنووسم وا بوو کە یەك دوو جاری تریش تووشی شکست ببم.

لە ١٧ ساڵیدا دەوری پیاوی یەکەمم بینی لە درامایەکدا بەناوی«فەرماندەی خۆشحاڵ» کە زۆر سووك و پلەخوار بوو و زیاتر لە حەفتەیەکیش درێژەی نەکێشا،. ئەستێرەی دراماکە کە دەوری ژنی منی دەبینی، ژنێکی ٥٠ ساڵە بوو. هەموو شەوێك بە لەتر لێدانەوە دەهاتە سەر شانۆ و دەمی



بۆگەنی ئارەقی لێوە دەهات و منیش کە مێردێکی تژی لە سۆز و خۆشەویستی بووم، دەبوایە لە باوەشی بگرم و ماچی بکەم. ئەو رووداوە وای لێ کردم هەرگیز بیر لە دەوری پیاوی یەکەم بوون نەکەمەوە.

دوای ئەوە هەوڵم دا خۆم شانۆنامە بنووسم. شانۆنامەیەکی کۆمێدیی بوو بە ناوی«دوانزە پیاوی دادپەروەر» کە درامایەکی پێکەنیناوی و رەشۆکییانە بوو و ناوەڕۆکەکەشی بریتی بوو لە لیژنەیەکی دادوەریی کە دەربارەی پووچەڵ کردنەوەی بۆنەیەکی زەماوەند گفتوگۆیان دەکرد. یەکێك لە ئەندامانی لیژنەی داوەریی کەڕ و لاڵ بوو و ئەویتریان مەست بوو و ئەوی تریشیان پزیشکێکی فێڵباز و تەڵەکەباز بوو. من بیرۆکەی ئەو شانۆنامەیەم فرۆشت بە پیاوێك بە ناوی«چارکوت» کە شاگردەکەی کە بە هیپنۆتیزم دەیکردە خەوەوە و بە چاوی بەسراوەوە لە ناو کالسکەیەکی دوو میچەوە بەناو شاردا دەیسووڕاندەوە و خۆشی لە کاتێکدا کە لەدواوەی کالسکەکەدا دانیشتبوو، بە جووڵەی دەستی هیپنۆتیزمی دەکرد. ئەو پیاوە لەبری دەقی شانۆنامەکە سێ لیرەی پێ دام بەڵام داوای لێ کردم خۆم کاری دەرهێنانەکەی بگرمە ئەستۆ. ئێمەش چەند ئەکتەرێکمان دامەزراند و لە هۆڵی یانەیەکی لە نهۆمی سەرەوەی مەیخانەی«شاخەکان » لە شەقامی کنینگتۆندا دەستمان بە تەمرین کرد. یەکێك لە ئەکتەرە بەتەمەنەکان کە پیرێکی بۆڵەبۆڵ کەر بوو گوتی ئەم شانۆنامەیە هەم خراپ نووسراوە و هەمیش زۆر سەرسەریی و گەمژانەیە.

ڕۆژی سێهەم، لە ناوەڕاستی مەشقکردندا بووین کە نامەیەکم لە لایەن چارکوتە بۆ هات کە تیایدا نووسیبووی بڕیاری داوە شانۆگەرییەکەم نمایش نەکات. چونکە ئینسانێکی ئازا و نەترس نەبووم، نامەکەم تەپاندە ناو گیرفانمەوە و درێژەم بە تەمرینەکەم دا. ئازایەتیی ئەوەم نەبوو لەگەڵ ئەکتەرەکاندا باسی بکەم. بەڵام لە جیاتی ئەوە، کاتی نانی نیوەڕۆ پێم گوتن براکەم دەیهەوێت قسەتان لەگەڵدا بکات. سیدنیم کێشایە سووچێکی ژوورەکەوە و نامەکەی چارکوتم پێ نیشان دا. ئەویش لەدوای خوێندنەوەی نامەکە گوتی:

__ مەگەر تۆ ئەوەت لەگەڵ باس نەکردوون؟

بە چرپەوە وتم:

__ نا نەمگوتووە.

__ کەواتە پێیان بڵێ

وتم:

_ ناتوانم. تازە ئەویش لە دوای سێ ڕۆژ تەمرین کردن هەرگیز ناتوانم پێیان بڵێم.

سیدنی بە دەنگی بەرز گوتی:

_ بەڵام ئەمە تاوانی تۆی تیا نییە. دەسا پێیان بڵێ!

من نەمتوانی خۆم ڕابگرم و کەوتمە گریان و بە دەم گریانەوە وتم:

_ چییان پێ بڵێم؟

_ باشە ئیتر کەر مەبە!

خۆی هەستا و چوە ژوورەکەی تر و نامەکەی چارکوتی نیشانی ئەوان دا و بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕانەوە. پاشان هەموومانی برد بۆ مەیخانەکەی ئەوبەری شەقام تا ساندویچێك بخۆین و مەشرووبێکیش بخۆینەوە.

ئەکتەرانی شانۆ کەسانێکن هیچ شتکیان پێشبینی ناکرێ. ئەو ئەکتەرە پیرە کە هەر بۆڵەی دەکرد و ناڕەزایی دەردەبڕی، لەو کاتەدا لە هەموویان زیاتر خۆی وەك کەسێکی فیلسووف و نتم و بەئەدەب نیشان دا و لەو کاتەوەش کە سیدنی بۆی گێڕایەوە کە من چ حاڵێکم هەیە، دای لە قاقای پێکەنین و دەستێکی خستە سەر شانم و گوتی:

_ تۆ بۆچی وەڕەز دەبی کوڕم؟ تۆ خۆ تاوانێکت نییە، تاوانەکە هی ئەو چارکوتە هیچ و پووچەیە.

* * *

پاش شکست خواردن لە مەسەلەکەی فۆرستردا هەموو هەوڵ و تەقەلاکانم بەرەوڕووی شکست دەبوونەوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا گەنجێتی هەمیشە خۆی لە خۆیدا هۆکارێکی بەهێزە بۆ هیوا و ئومێد و گەشبینی، چونکە بە پێی غەریزە پێی وایە کە سەرنەکەوتن شتێکی کاتییە و بەردەوامبوونی ڕێگای چەرمەسەریی و سەرنەکەوتن هەر ئەوەندەی ڕێگای شانس و بەختیاریی دەخایەنێت ﴿بە واتایەکی تر ئینسان چەند سەرکەوتن و بەختیاریی بە دەست بهێنێت هەر ئەوەندەش تووشی شکست و ناسەرکەوتن دەبێت﴾. هەر چۆنێك بێت لە هەر دوو حاڵەکەتەدا ڕێگە چارەیەك پەیدا دەبێت.

و بە ڕاستییش ئەو شتە سەبارەت بە من بە تەواوەتی ڕووی دا. ڕۆژێکیان سیدنی پێی ڕاگەیاندم کە ئاغای کارنۆ گەرەکیەتی بمبینێت. سیدنی پێی گوتم کە ئاغای کارنۆ لە یەکێك لە ئەکتەرەکانی خۆی ناڕازییە. ئەو ئەکتەرە کە ناوی «هاری ڤۆڵدن» بوو، لە شانۆنامەی«پێشبڕکێی تۆپێن»دا کە



خودی ئاغای کارنۆ نووسیبووی و سەرکەوتنی باشی بە دەست هێنابوو، نێوانی لەگەڵ کارنۆدا تێك چووبوو. ڤۆڵدن لەو ئەکتەرانە بوو کە خەڵك زۆر خۆشیان دەویست و تا دوایین کاتی مردنیشی_ کە لە ساڵەکانی ٣٠دا بوو_ خەڵك خۆشیان دەویست.

ئاغای کارنۆ پیاوێکی کورتە باڵا، چوارشانە و ڕەشتاڵە بوو کە چاوانێکی سەرنجڕاکێش و تێژبینی هەبوون کە هەمیشە لە مرۆڤەکان ورد دەبووەوە. کاری خۆی بە ئاکرۆبات بازیی لەسەر بارفیکسەوە دەست پێ کردبوو و پاشان سێ ئەکتەری قەشمەجاڕی لە دەوری خۆی کۆ کردبووەوە. ئەو چوار کەسە بناغەی سەرەکیی چەند بەرنامەیەکی کۆمێدییان پێك هێنا. خۆشی ئەکتەرێکی باش بوو و چەندین ڕۆڵی جۆراوجۆری خولقاند. تەنانەت لەو کاتانەشدا کە پێنج گرووپەکەی تری گەشتیان دەکرد، خۆشی بەردەوام کاری نمایشی دەکرد.

یەکێك لە دامەزرێنەرانی ئەو گرووپە بەمجۆرە دەگێڕێتەوە کە کارنۆ لە چ بارودۆخێکدا خانەنشین بوو:شەوێکیان لە «مەنچێستر»دا لە دوای نواندنی دراماییەك، ئەو گرووپەی کە ئەو لەگەڵیاندا دەوری بینیبوو، دەستیان کردبوو بە گلەیی و گازندە کە کارنۆ لە کاتی پێویستدا وەڵامەکان ناداتەوە و لایەنی کۆمیکی دراماکەی تێك داوە. کارنۆ کە تا ئەو کاتە بە هۆی پێنج گرووپە شانۆییەکەی خۆیەوە پەنجا هەزار لیرەی ئسترلینگی کۆ کردبووەوە وتبووی:

_ باشە کوڕینە! ئێستا کە ئێوە وا دەڵێن من ئیتر واز لە نواندن دەهێنم! .

پاشان باڕۆکەکەی لە سەر هەڵگرتبوو و لە سەر مێزێکی بچووکی دانابوو و دەم بە بزەوە وتبووی:

_ ئێوەش دەتوانن ئەم کارەی من بە دەس لەکار کێشانەوە لە قەڵەم بدەن.

ماڵی ئاغای کارنۆ لە کۆڵانی«کۆڵد هار بێرلین» لە شەقامی«کەمبرۆڵ»دا بوو. ئەمبارێکیش بەسەر خانووەکەیەوە بوو کە دیکۆری ٢٠ دانە لە دراماکانی لەوێدا دادەنا. نووسینگەکەشی هەر لەوێ بوو. کاتێك چوومە لای بە گەرمی پێشوازیی لێ کردم و گوتی:

_ سیدنی بە منی وتووە تۆ زۆر بەتوانایت. ئاخۆ دەتوانیت لە درامای پێشبڕکێی تۆپێندا وەڵامی قسەکانی ئاغای هاری ڤۆڵدن بدەیتەوە؟.

هاری ڤۆڵدن لە هەڵومەرجێکی تایبەتدا و بە حەقدەستێکی ٣٤ لیرە لە مانگدا دامەزرابوو.

منیش بەوپەڕی دڵنیاییەوە وتم:

_ من تەنیا پێویستم بە کاتە تا خۆم دەربخەم.

بزەیەکی هاتێ و گوتی:

_١٧ ساڵ تەمەنێکی زۆر کەمە و تازە تۆ لە ١٧ ساڵیش ناچیت.

منیش خەمساردانە شانێکم هەڵتەکاند و وتم:

_ ئەوە کێشە نییە" بە گریم و ئارایشت چارەسەر دەکرێت.

کارنۆ دای لە قاقای پێکەنین. دواتر بەسیدنیی گوتبووی کە هەر ئەو شان هەڵخستنەم بوبووە هۆی دامەزراندنم.

پێی گوتم:

_ باشە با بزانم چی دەکەیت!

دامەزراندنەکەشم وەکوو تاقیکردنەوە بوو بۆ ماوەی دوو حەفتە بە حەقدەستی سێ لیرە و دە شلینگ لە حەفتەدا و ئەگەر کارەکەیان بە دڵ بوو، گرێبەستێکی یەك ساڵەیان لەگەڵ دەبەستم.

***

حەفتەیەك دەرفەتم هەبوو لە«کۆلیزیۆمی لەندەن»دا رۆڵەکەم بـخوێنمەوە. کارنۆ پێی گوتم سەردانی«ئەمپایر شفرێدز بوش»بکەم" واتە ئەو شوێنەی کە شانۆنامەی پێشبڕکێی تۆپێن تیایدا نـمایش دەکرا و چاوم بەو پیاوە بکەوێت کە دەبێ لە جیاتی ئەو نـمایش بکەم. دەبێ دان بەوەدا بنێم کە ئەو چەتیوە بە راستی ناشیرین و خوێنتاڵ و قێزەون بوو و من بە بێ هیچ خۆ بەکەم¬زانینێك دەمزانی لەو باشتر دەتوانم رۆڵەکە ببینم. ئەو رۆڵە پێویستی بەوە هەبوو کە تۆزێك پێکەنیناویی تر دەربکەویت و منیش بڕیارم دا ئاوا بکەم.

دوو جار زیاتر ئیجازەی تەمرینیان پێ نەدام، چونکە ئاغای ڤۆڵدن نەیدەتوانی لەوە زیاتر کاتم بداتێ. ئەوەی راستی بێت بۆ ئەو دوو جار تەمرینەش زۆر قەڵس بووبوو، چونکە ئەو کارە رێی لەوە دەگرت کە بچێت بۆ ئەو یارییەی حەزی لێ بوو، واتە یاریی گۆڵف.

لە تەمرینەکاندا زۆر نەدرەوشامەوە. چونکە قسەکانم بە هێواشی دەردەبڕی، پێم وابوو ئاغای ڤۆڵدن من بە کەسێکی شیاو نازانێت بۆ ئەو رۆڵە. ئەگەر ئەو رۆژە سیدنیم لە لا بوایە دەیتوانی یارمەتیم بدات، چونکە خۆی پێشتر ئەو رۆڵەی بینیبوو، بەڵام ئەو لە گەشتدا بوو و لە شانۆگەرییەکی تردا کاری دەکرد.



هەرچەند شانۆنامەی پێشبڕکێی تۆپێن شانۆنامەیەکی پێکەنیناویی بوو، بەڵام تا پێش هاتنی ڤۆڵدن بۆ سەر سەکۆی شانۆ کەس پێ نەدەکەنی. هەرکە دەهاتە ژوورەوە هەموو شتێکی لەگەڵ خۆی دەهێنا. وە چونکە ڤۆڵدن بە راستی ئەکتەرێکی باش بوو و هەرکە دەهاتە سەر شانۆ، بەردەوام خەڵکی دەهێنایە پێکەنین.

شەوی یەکەم لە کۆلیزیۆمی لەندەندا کە دەچوومە سەر شانۆ، ئەعسابم وەکوو فەنەری کاتژمێری لێ هاتبوو ﴿واتە هەر زۆر وەڕەز بووم﴾. ئەو شەوە دەبوایە ئەو باوەڕبەخۆبوونەی لە دەستم دابوو، بیگێڕمەوە و شوورەییەکەی فۆرستریش بسڕمەوە. بە راڕەوەکانی پشتەوەی ئەو شانۆ گەورەیەدا تێدەپەڕیم و دەپاڕامەوە و ترس و دڵەڕاوکێش پەیتاپەیتا دایاندەگرتم.

گرمەی مۆسیقا بەرز بووەوە! پەردەکە لا درا! هەندێك پیاو لەسەر شانۆ جوولەی ژیـمناستیکیان دەکرد. دواجار چوونە دەرەوە و شانۆیان چۆڵ کرد. کاتی ئەوە بوو من بچمە ژوورێ. لە کاتێکدا کە تووشی گەلێك نیگەرانی و دڵەڕاوکێ بووم، چوومە پێشەوە. مرۆڤ یان دەیسەلمێنێ کە بۆ خۆی کەسێکە و دەتوانێت بەرەوڕووی رووداوەکان ببێتەوە، یان دادەڕووخێت و لە ژێر پێدا دەپلیشێتەوە. لەو ساتەوە کە پێم نایە سەر شانۆ، هەستم بە بارسووکی و ئاسوودەیی کرد و هەموو شتێك لەبەر چاومدا رووناك بوو. لە کاتی چوونە سەر شانۆ بە ئەنقەست پشتم لە خەڵکەکە کردبوو و بە تایبەتییش بیرم لە کاری وا کردبووەوە. لە پشتەوە حاڵەتێکی هەژارانە و کزۆڵانەم هەبوو، بە چاکەت و کڵاوێکی بەرز و گۆچان و پووزەوانەوە، رێك وەکوو لاساییکەرەکانی سەردەمی«ئێدوارد». پاشان رووم لە جەماوەر کرد و لووتە سوورەکەم نیشان دا. خەڵك دایان لە قاقای پێکەنین. هەر ئەوەش بوو بە هۆی ئەوە کە کۆنترۆڵی جەماوەرەکە بگرمە دەست. بە جووڵەیەکی هەژاناوییەوە شانەکانم هەڵتەکاندن، پاشان تەقەم لە پەنـجەکانم هەستاند و لە کاتێکدا کە لەسەر قاچەکانم دەسووڕامەوە و نسکۆم دەبرد، پانایی شانۆکەم بڕی. لەناکاو پێم دای لە هاڵتێرێك و گۆچانەکەشم دای لە توورەکەیەك لـمی هەڵواسراو" لەوانە کە بۆکسێرەکان تەمرینیان پێ دەکەن" توورەکە لـمەکە کەوتە جووڵە و یەکڕاست دای لە ناوەڕاستی ناوچەوانم. هاوسنگیی خۆمم لە دەست دا و بە عەرز کەوتم و گۆچانەکەشم دای لە تەوێڵم. خەڵکەکە لەبەر پێکەنین خەریك بوو دەبوورانەوە.

لەوە بەدوا لەو حاڵەتە سارد و سڕییە هاتـمە دەرێ و یەکسەر کەوتـمە جووڵە و جرت و فرت. دەمتوانی تا پێنج خولەك هەر بەو شێوەیە شانۆکە بگرمە ژێر کۆنترۆڵی خۆم و بە بێ ئەوەی کە یەك

وشە بدرکێنم، خەڵکەکە پێ بکەنێنم. لەو سەروبەندەدا بوو پانتۆڵەکەم لە پێم دەر هات. قۆپچەیەکی داکەوتبوو. دەستم کرد بە جرت و فرت و گەڕان بە دوای قۆپچە ونبووەکەدا. هەر لە خۆوە شتێکم لەسەر زەوییەکە هەڵدەگرت و کە دەمزانی قۆپچەکە نییە بە تووڕەییەوە فڕێم دەدا و دەموت:« ئەی کەروێشکە نەفرەتییەکان...! »، جەماوەریش دەیدا لە قاقای پێکەنین.

سەری هاری ڤۆڵدن وەکوو مانگی شەوی چواردە لە ڕاڕەوەکانی پشتەوەی شانۆوە دەرکەوت. هەرگیز هیچ کەس بەر لە هاتنی ئەو بۆ سەر شانۆ، پێ نەکەنیبوو.

هەرکە ڤۆڵدن هاتە ناوەوە من بە جووڵەیەکی سەرنـجڕاکێش مەچەکی دەستیم گرت و لە ژێر لێوەوە وتم:«دەی خێرا کە دەرزییەکم بەرێ! پانتۆڵەکەم خەریکە دادەکەوێت! ». هەمووی ئەو جووڵانە لە دەرەوەی پرۆگرامەکەدا بوو. من خەڵکەکەم بە تەواوەتی بۆ «هاری» ئامادە کردبوو و ئەو شەوە سەرکەوتنێکی گەورەی بە دەست هێنا و پێکەوە هەندێك پرسیار و وەڵامیشمان لە جووڵەکانـمان زیاد کرد کە جەماوەری خستە پێکەنینەوە. کاتێك پەردەکە دادرایەوە زانیم تاقیکردنەوەکەم سەرکەوتووانە بووە. زۆربەی ئەندامانی گرووپەکە هاتن و دەست و موشتاقیان لەگەڵدا کردم و پیرۆزباییان لێ کردم. ڤۆڵدن لە کاتێکدا خەریك بوو دەچوە ژوورەکەیەوە ئاوڕێکی لێ دامەوە و بە دەنگێکی وشکەوە گوتی:« زۆر باش بوو.... زۆر باش! ». ئەو شەوە بە پێیان چوومەوە بۆ ماڵ بۆ ئەوەی کە تۆزێك مێشکم حەساندبێتەوە. لە سەر پردی وێست مینستر ڕاوەستام و لە قەراخی پردەکەوە بەرەو خوار شۆڕ بوومەوە تا سەیری خوڕە و جووڵە تاریك و مەخمەڵییەکانی ئاوەکە بکەم. لە خۆشیانا حەزم دەکرد بگریم بەڵام نەمدەتوانی. فشارم بۆ خۆم دێنا و ناوچاوم گرژ دەکرد بەڵام فرمێسك لە چاوم نەدەهات. لە سەر پردی وێست مێنسترەوە چووم بۆ«ئەلیفنت ئەند کاسێل» تا پیاڵەیەك چایی بـخۆمەوە. حەزم دەکرد لەگەڵ یەکێکدا قسە بکەم بەڵام سیدنی لە گەشتدا بوو. خۆزگە لەوێ بوایە باسی ئەو شەوە پڕ لە سەرکەوتنەم بۆ بکردایە و ئەوەشی پێ بڵێم کە لە دوای شکستەکەی فۆرستر ئەم سەرکەوتنە بۆ من چ واتایەکی هەیە.

خەویشم نەدەهات. دیسان هاتـمە دەرەوە و چووم بەرەو«کنینگتۆن گەیت»تا پیاڵەیەکی تر چایی بـخـۆمەوە. بە دەم ڕێگاوە لەگەڵ خۆمدا قسەم دەکرد و پێ دەکەنیم. کاتێك هیلاك و ماندوو چوومە ناو نوێنەکەمەوە، کاتژمێر پێنجی بەیانی بوو.



شەوی یەکەم خودی ئاغای کارنۆ لەوێ نەبوو بەڵام شەوی سێهەم هات و کاتێکیش من هاتـمە سەر شانۆ، خەڵکەکە هەمووی چەپڵەیان بۆ لێ دام. پاشان ئاغای کارنۆ هات بۆ بینینی من. دەم بە بزە بوو و پێی وتم سبەینێ بۆ واژۆ کردنی گرێبەست بچم بۆ نووسینگەکەی.

بەسەرهاتی سەرکەوتنەکەی شەوی یەکەمم بۆ سیدنی نەنووسیبوو بەڵام کاتێك گرێبەستەکە واژۆ کرا، ئەم تەلگرافە کورتەم بۆ نارد:«گرێبەستی یەك ساڵە بە چوار لیرە لە حەفتەدا. واژۆ. بە قوربانت بم. چارلی». شانۆگەریی پێشبڕکێی تۆپێن، ١٤ حەفتە لە لەندەندا نـمایش کرا و پاشانیش نێردرا بۆ شارەکانی تر.

ئەو کەسایەتییەی وا ڤۆڵدن دەورەکەی دەبینی، ئینسانێکی گەمژە و نەفامی خەڵکی گوندی لانکشایر بوو کە بەخاو و خلیچکی قسەی دەکرد. لە باکووری بەریتانیادا پێشوازییەکی باشمان لێ کرا بەڵام لە باشووردا ئاوها نەبوو. شارەکانی بریستۆل، کاردیف، پلیمۆت و ساوتێمپتۆن ئەو شوێنانە بوون کە تیایاندا پێشوازییەکی گەرم لە ڤۆڵدن نەکرا. ئەوە لە شانۆگەرییەکەدا هەبوو کە ئەو شەپەزیلەیەك لە من بدات و بە شێوەیەکی درۆیین لێم بدات. واتە وای نیشان بدات کە شەپەزیلەم لێ دەدا، بەڵام لە ڕاستیدا کەسێکی تر لە پشتی پەردەوە توند دەستەکانی لە یەکتر دەدا تا جۆرە ڕاستییەك بە نـمایشەکە ببەخشێت. هەندێ جار ڤۆڵدن بە ڕاستی شەپەزیلەی ڕاستەقینەی لێدەدام و ئەوەندەش پتەو لێی دەدام کە هیچ پێویستی نەدەکرد بەوجۆرە لێم بدات و پێم وایە ئەو کارەی بۆ ورووژاندنی حەسادەتی من دەکرد.

لە«بولفاست»دا بارودۆخەکە گەییشتە خراپترین ڕادە. ئەو ڕەخنانەی کە لە ڤۆڵدن گیرا، ڕۆحی ئازار دەدان بەڵام منیان هەر وا هان دەدا و تاریفیان دەکردم. ڤۆڵدن ئیتر تاقەتی نەهێنا و ئەو شەوە لەسەر شانۆدا شەپەزیلەیەکی وا توندی لێ دام کە لەو حاڵەتی گاڵتەجاڕییە هاتـمە دەرەوە و خوێن لە لووتم فیشقەی هات. دوای ئەو کردەوە ناحەزە پێم گوت ئەگەر جارێکی تر ئەو کارە دووبارە بکاتەوە یەکێك لەو هاڵتێرانەی سەر شانۆکە دەکوتم بە تەوقی سەریدا و ئەوەشم پێ گوت ئەگەر لە بەغیلی خەریکە دەتەقێ، پێویست ناکات تۆڵەکەی لە من بکاتەوە.

لەو کاتەدا کە دەچووینەوە بۆ ژوورەکانـمان، بەدەم پرتەو بۆڵەوە پێی گوتم:

_ ئێرەیی بە تۆ بەرم؟ دیارە خەوت بینیوە! من تەنیا لە قنگمدا زیاتر لە هەموو ئەندامانی لەشی تۆ بەهرەم هەیە.

له وەڵامدا گوتم:

_ بەڵێ، بەهرەی تۆ تەنیا لە قنگت دایە!

ئیدی دەرگای ژوورەکەم توند دا بە یەکدا.

❊❊❊

کاتێك سیدنی هاتەوە بۆ لەندەن بڕیارمان دا ئاپارتـمانێك لە شەقامی«برێکستۆن»دا کرێ بکەین و ٤٠ لیرەش بۆ کڕینی مۆبڵ(مۆبلیات) تەرخان بکەین. چووین بۆ دووکانێك لە«نوینگتۆن باتس» کە مۆبڵ و کەلوپەلی کۆن و نیوداش(دەسەدوو)ی دەفرۆشت و پێمان وت ئاخۆ کەلوپەل و پێداویستییەکانی چواردانە ژوور، چەندی تێ دەچێت؟.

خاوەن دووکانەکە حەزی دەکرد کێشەکەمان چارەسەر بکات هەر بۆیە چەند کاتژمێری تەرخان کرد بۆ دۆزینەوەی کەلوپەلی نیوداش(دەسەدوو)ی بۆ ماڵەکەمان. لە هۆڵی میواندا رایەخێکمان راخست و لە ژوورەکانی تردا«لینۆلئۆم»مان راخست و کورسییەکی گەورە و دوو کورسیی راحەتیی پشت بەرزیشمان کڕی. لە سووچێکی هۆڵەکەدا ریزێك حەسیری کون کونـمان دانا کە لە پشتەوە بە گلۆپێکی زەرد رووناك دەبووەوە و لە سووچی بەرانبەریشیدا لەسەر سێپەکێکی زەرد، وێنەکەمان دانا کە ئەویش لەناو قابێکی تەلاّیی بوو. وێنەی پیاوێکی رووت بوو کە لەسەر سەکۆیەك راوەستابوو و بە لاچاوێکەوە لە ئەکتەرێکی شانۆی دەڕوانیی کە دەیهەوێت مێشێك راو بکات کە لەسەر لاقنگی نیشتبووەوە. بە رای من ئەو وێنە هونەرییە و ئەو ریزە حەسیرە، دوو شتی سەرنـجڕاکێش بوون کە بە تەواوەتی رەونەق و جیلوەیان بە هۆڵەکە بەخشیبوو. سەرجەمی ئەو شتومەکانە لە ئەنتیکەکانی بازاڕی «مەراکێش» دەچوون، بەڵام ئێمە پێیان رازیی و خۆشحاڵ بووین. تەنانەت پیانۆیەکیشمان کڕی و هەرچەند ناچار بووین ١٥ لیرە زیاتر لەو پارەیەی کە بۆ خەرجیمان دیاریـمان کردبوو خەرج بکەین بەڵام بەهەر حاڵ هەندێ شتی باشمان هەبوو. ئاپارتـمانی کۆلاّنی«گۆڵنشا و مەنسێنـز» ژمارە ١٥ لە شەقامی بریکستۆن، بۆ ئێمە بوو بە خانوویەکی خۆشەویست و بە راستی لە دوای ئەو هەموو وێڵی و سەرگەردانییە زۆر بەو ماڵەوە شاد بووبووینەوە. ئیتر وەك پێویست توانای ئەوەشمان هەبوو کە حەفتەیەك ١٠ شلینگ یارمەتیی باوەگەورەشمان بدەین. تەنانەت توانیمان خزمەتکارێکیش دابـمەزرێنین کە حەفتەیەك دوو جار بێت و ماڵەکەمان بۆ پاك و خاوێن بکاتەوە" هەرچەند پێویستی بەو کارەش نەدەکرد چونکە ئێمە دەسمان لە هیچ نەدەدا و ژوورەکانـمان پیس و پۆخل نەدەکرد. لەوێدا



بەجۆرێك دەژیاین کە وەك بڵێی لە کەنیسەیەکدا دەژین. من و سیدنی لەسەر کورسییە راحەتییە پشت بەرزەکاندا پاڵمان دەدایەوە و دەچووینە عالەمێکی خۆشەوە. ئامێرێکی ئاگرکوژاندنەوە و کورسییەکی چێکراو لە چەرمی سووریشمان کڕیبوو و من لە کورسییە دەسەدارەکەوە دەچوومە سەر کورسیی چەرمییەکەوە بۆ ئەوەی بزانم کامیان راحەتترە.

لە تەمەنی ١٦ ساڵیدا بە هۆی رێکلامی شانۆیێکەوە هەست و سۆزی خۆشەویستی کەوتە ناخمەوە، ئەویش وێنەی کچێکی جوان و دەلال بوو کە لەسەر گاشەبەردێکی گەورەدا دانیشتبوو و «با» لە بسکی ئالاّ بوو و یاریی پێ دەکرد. من کە زۆر رقم لە یاریی گۆڵفە، بەڵام نازانم بۆچی هەمیشە لە خەیاڵمدا یاریی گۆڵفم لەگەڵ دەکرد و لەو گردە لـمییانەی کە بە هۆی شەونـمەوە تەڕ بووبوون رامدەکرد و جلەوی هەموو شتێکم دابووە دەست ترپەکانی هەست و تەندروستیی و سرووشتەوە. دیارە ئەوە ئیحساسێك لە خۆشەویستییەکی ئەفلاتوونیی بوو بەڵام خۆشەویستیی سەردەمی گەنـجێتی شتێکی ترە. بە نیگایەك، بە چەند وشەیەکی سەرەتای دەسپێکردن(کە زۆربەشیان ئەحمەقانەن) لە ماوەی چەند خولەکدا هەموو ژیان گۆڕانی بەسەردا دێت. لە پڕێکدا سرووشت لەگەڵماندا سۆز و میهرەبانی دەنوێنێت و هەموو شادیی و خۆشییەکانی دەردەخات و وەها شتێك بە تەواوەتی بۆ من رووی داوە.

تەمەنم گەیشتبووە ١٩ ساڵ و ئەکتەرێك بووم کە لە گرووپی کارنۆدا سەرکەوتنێکی تا رادەیەك باشم بەدەست هێنابوو، بەڵام تەنیا یەك شتم کەم بوو. بەهار هات و رۆیی و هاوینیش خەریك بوو منی لەگەڵ بۆشاییەکدا بە جێ دەهێشت. کاری رۆتین و رۆژانە، شەوق و خۆشییەکی ئەوتۆی بۆ من نەبوو و شوێنی ژیانیشم وەڕەز و بێتاقەتی دەکردم.

داهاتووی خۆمم بە شێوەی رابواردنێکی هیچ و پووچ لەناو خەڵکانێکی هیچ و پووچدا بەدی دەکرد. ئەوەی کە مرۆڤ تەنیا کاری ئەوە بێت و بەردەوام بەدوای دابینکردنی بژێویی ژیاندا را بکات و زەحمەت بکێشێت، منی قایل نەدەکرد. ژیانی وەها ژیانی کۆیلایەتییە و هیچ کەیف و خۆشییەکی تێدا نییە. خەم و خەفەت دایدەگرتم و رۆژانی یەکشەمە بە تاق و تەنیا پیاسەیەکم لە باخە گشتییەکاندا دەکرد و گوێم لە مۆسیقا دەگرت. ئیتر نە هاوڕێیەتی خۆم لەگەڵ خۆمم بۆ تەحەمول دەکرا، نە هاوڕێیەتی لەگەڵ کەسانی تر. دیارە ئەو شتە کە دەبوایە رووی بدایە، رووی دا: واتە، کەوتـمە داوی خۆشەویستییەوە.

ئێمە لە کافتریا-کابارەی«ئەمپایر ئەستریتام»دا نـمایشمان دەکرد(لەو سەردەمەدا هەموو شەوێك لە دوو یان سێ کابارەدا نـمایشمان دەکرد بە ئوتۆمبێلی کرێ لەمیانەوە دەچووین بۆ ئەوی تر و...). بەر لەهەموویان دەچووین بۆ ئەمپایر ئەستریتام تا دواتر بچین بۆ کابارەی«کانتر بۆری» و دواتریش بۆ«تیوویلی». هەوا هێشتا رووناك بوو کە دەستمان پێ دەکرد. هەوا گەرمەکەی زۆر بێ تاقەتی دەکردین و کافتریای ئەمپایر ئەستریتامیش هێشتا نیوەی لە خەڵك پڕ نەبووبوو. ئەوەش بڵێم کە ئەو وەزعە هیچی لە خەم و خەفەتی من کەم نەدەکردەوە.

لە هەر سێکانسێکدا بەر لە ئێمە گرووپێکی گۆرانیبێژ و سەماکەر بەناوی«کچەکانی دنیای مۆدێرن » نـمایشی خۆیان دەکرد و من زۆربەی جار نەمدەتوانی چاوم پێیان بکەوێت. شەوی دووهەم لە کاتێکدا لەناو ڕاڕەوەکانی پشتەوەی شانۆ چاوەڕێم دەکرد و زۆریش بێ تاقەت و خەمۆك و وەڕەز بووم، یەکێك لە کچەکانی سەر شانۆ لە کاتی سەمادا قاچی خلیسکا و خەڵکەکە دایان لە قاقای پێکەنین. یەکێك لە کچەکان چاوێکی لێ کردم بزانێت ئاخۆ منیش بەو رووداوە پێ دەکەنم یان نا. لە پڕێکدا دیم کەوتوومەتە داوی دوو چاوی رەشی درشتەوە کە ناز و عیشوەیان لێ دەبارێ و خاوەن چاوەکەش، ئاسکێکی ناسکۆڵەیە بە دەموچاوێکی ساف و لووس و خرتەوە، دەم و لێوێکی گۆشتن و هەستبزوێن و ددانی سپیی و رێك و پێك. کاریگەریی ئەو نیگایەی وەها بوو وەك بڵێی بەرق(کارەبا) لێی دابم. کاتێك لە شانۆکەوە هاتە دەرەوە داوای لێ کردم ئاوێنەکەی بۆ رابگرم تا بسکە ئاڵۆزەکانی دابهێنێت. ئەو پێشهاتە دەرفەتی ئەوەی بۆ رەخساندم لە نزیکەوە بیبینم. ئەوە دەسپێکی چیرۆکەکە بوو. رۆژی چوارشەمە داوام لێ کرد ئەگەر بۆی دەکرێت با یەکشەممە چاومان بە یەکتریی بکەوێت. ئەویش دای لە قاقای پێکەنین و گوتی:

_ من کە نازانم لە ژێر ئەو گریم و لووتە سوورەدا چ دەموچاوێکت هەیە! (من لە شانۆگەریی«باڵندە نەغمەچڕەکان»دا دەوری مەستێکم دەبینی بە جل و بۆینباخی سپییەوە).

گوتم:

_ هیوادارم لوتی خۆم ئەوەندە سوور نەبێت و خۆشم ئەوەندە پیر نەبم کە بەم گریمەوە دیارم. سبەی شەو وێنەیەك لە وێنەکانی خۆمت بۆ دێنم تا بیسەلمێنم راست دەکەم.

شەوی دواتر وێنەیەکی خۆم کە بە لای خۆمەوە باش بوو بۆم هێنا کە ئەویش وێنەی لاوێکی خەمۆك بوو بە بۆینباخێکی رەشەوە.



تەماشایەکی کرد و گوتی:

ئاە.... . تۆ زۆر گەنـجیت! من پێم وابوو تۆ زۆر لەوە پیرتریت.

_ پێت وایە تەمەنم چەندە؟

_ بە لانیکەمەوە ٣٠ساڵ.

دەم بە بزەوە وتم:

_ تازە خەریکە دەبـمە ١٩ ساڵ.

چونکە هەموو رۆژێك تەمرینمان هەبوو، نەدەکرا لە درێژەی حەفتەدا قەوڵ و قەراری لەگەڵدا رێك بـخەم. لەگەڵ ئەوەشدا بەڵێنی پێ دام کە رۆژی یەکشەمە کاتژمێر چواری پاش نیوەڕۆ لە «کنینگتۆن گەیت»دا یەکتر ببینین.

یەکشەممەی یەکێك لە رۆژە جوان و خۆشەکانی هاوین بوو و هەتاویش چرکەیەك لە درەوشانەوە نەدەوستا. من دەستێك جلی تۆخم لەبەر کرد کە کەمەرەکەی تەنگ و تەسك بوو و بۆینباخێکی رەشم بەست و دارەدەست(گۆچانێك)ی ئاوەنووسم بە دەستەوە گرتبوو. ١٠ خولەکی مابوو بۆ دیدار، کە بە جوانیی و رێکوپێکیی لە ژوانگەدا وەستابووم و تەماشای هەموو ئەو مسافرانەم دەکرد کە لە شەمەندەفەروە دادەبەزین.

لەو کاتەدا کە ماتڵ بووم بیرم لەوە کردەوە کە من ئەوم بە بێ گریم و ئارایشت نەدیوە و چووبوومە ئەو خەیاڵەوە کە داخۆ دەموچاوی راستەقینەی خۆی چۆن بێت. زۆرم هەوڵ دا شێوەی دەموچاوی بێنمەوە بەر چاوی خۆم بەڵام نەمدەتوانی. تۆزێك ترس دایگرتم. نەکا جوانییەکەی دسکرد و خەیاڵی بێت! هەر کچێکی گەنج کە دادەبەزی و جوان نەبوو ، بیرکردنەوە لەوەی کە ئەو بێت، تووشی دڵتەنگی و بێهیوایی دەکردم. نەکات کڵاوم بچێتە سەر و فت ببم! نەکات فریوی ئەو دڵە خەیاڵپەروەرە و ئەو گریـمە دەسکردەم خواردبێت؟

سێ دەقەی مابوو بۆ کاتژمێر چوار کە کەسێك لە شەمەندەفەر دابەزی و یەکڕاست بەرەو لای من هات. بە بینینی ئەو دڵم داخورپی و تەواو وەڕەز بووم. بیرکردنەوە لەوەی کە دەبێ هەموو ئەو پاش نیوەڕۆیەم لەگەڵ وەها دەموچاوێکدا رابوێرم و خۆشم بە کەسێکی خۆشحاڵ و تاسەبار نیشان بدەم، کزەی لە جەرگم دێنا. هەرچۆنێك بێت کڵاوەکەم لەسەر هەڵگرت و بزەیەکی بەناچار خۆشحاڵانەم تەسلیم کرد. ئەویش مۆڕەیەکی لێ کردم و بە رێگەی خۆیدا چوو. شوکر بۆ خوا ئەو نەبوو! .

پاشان رێك سەری كاتژمێر چوار كچێكی گەنج لە شەمەندەفەر دابەزین و بەرەو لای من هات و لە بەرانبەرمدا راوەستا. ئارایشتی نەبوو و زۆر جوانتر لە جارانیش بوو. شەپقەیەكی ساكاری لەسەر بوو و جاكەتێكی شینی مەلەوانیی لەبەردا بوو كە رەنگی قۆپچەكانی زێڕین بوون و دەستیشی لە گیرفانیدا بوو.

هەركە گەییشتیێ گوتی:

_ فەرموو، نەمگوت دێم... ئەوە هاتم!

هەركە چاوم پێی كەوت ئەوەندە حەپەسام كە بە زەحمەت توانیم قسە بكەم. تەواو قەڵس بووبووم“ نە هیچ قسەیەكم بە مێشكدا هات و نەدەشمزانی چی بكەم. دواجار بە دەنگێكی گڕ و گیراوەوە گوتم:

_ وەرە با كالسكەیەك بگرین...

پاشان تەماشایەكی سەرتا پای شەقامەكەم كرد و رووم لە ئەو كرد و گوتم:

_ حەز دەكەیت بە كام لادا بڕۆین؟

شانێكی هەڵخست و گوتی:

_ هەر كوێیەك تۆ حەز بكەیت.

_ كەواتە با بڕۆین بۆ رێستورانی«وێس ئەند» شێوێك بــخۆین.

بە دەنگێكی نەرم و ناسكەوە گوتی:

_ من شێوم خواردووە.

پێدەچوو ئەو هەژانە زۆرەی من بوبووە هۆی سەرسووڕمانی، چونكە لەو هەموو رێگایەیدا كە پێكەوە دەمانبڕی، دوابەدوای یەك دەمگوت:«دەزانم رۆژێك پەشیمان دەبــمەوە...تۆ زۆر جوانیت...! » و هەر لەخۆوە هەوڵم دەدا قسەی خۆش و جوان بكەم و كاریگەریی لەسەر دابنێم. سێ لیرەم لە بانك وەرگرتبوو و بە تەما بووم بیبەم بۆ «ترۆ كادرۆ» تا لەوێدا لە شوێنێكی تەژی لە نەغمەی مۆسیقا و خۆشی و جوانییدا بتوانێت لە جوانترین و لەبارترین حاڵەتدا بــمبینێت. دەمویست هەر لە یەكەم قۆناغدا دڵی بە دەست بێنم. بەڵام نیگای ئەو هەروا ئارام و بێ جووڵە بوو و لەوە دەچوو قسەكانی من تۆزێك وەڕەزیان كردبێت، بە تایبەت ئەو قسەیە كە پێم وتبوو:«تۆ نەمسیسی منی» و ئەو وشەی«نەمسیس»ە تازە فێری بووبووم.



ئەو ئەوەندە دەركی بەوە نەدەكرد كە ئەو قسانە لە لای خۆمدا چ مانایەكیان هەیە. هێشتا شەهوەت نەهاتبووە ناو ئیحساساتــمەوە و ئەو شتەی كە زۆر بە لامەوە گرینگ بوو، دەمەتەقێ و پێكەوە قسەكردن بوو. لەو بارودۆخەدا كە منی تیا بووم، رووبەڕووبوونەوە و دیدار لەگەڵ جوانی و دڵگرییدا بەدەگمەن رووی دەدا.

ئەو شەوە لە ترۆكاردۆدا زۆرم هەوڵ دا قەناعەتی پێ بێنم پێكەوە شێو بــخۆین بەڵام تەقەلایەكی بێ فایدە بوو. گوتی تەنیا لەبەر ئەوەی كە من بە تەنیا نەبم ساندویچێكم لەگەڵ دەخوات و چونكە لە رێستورانێكی زۆر جواندا مێزێكمان داگیر كردبوو، من پێم وابوو ناچارین خواردنێكی تەواو بــخۆین، هەرچەند﴿لەو كاتەدا﴾ئەوەندەش حەزم لە خواردن نەبوو. بە راستی نانــخواردن عەزابێكی گەورە بوو چونكە نەمدەزانی چۆن چۆنی لە كەوچك و چنگاڵ و شتەكانی تری سەر مێزەكە كەڵك وەربگرم. هاوكات لەگەڵ خواردندا خۆم دەنواند و ئەدا و ئەتواری شاهانەم دەردێنا و تەنانەت دەمویست كەڵك لەو كاسەیەش وەربگرم كە لە دوای نانــخواردن بۆ دەس شۆردن دەیانهێنا. بەڵام لەوە دەچوو هەردووكمان حەزمان دەكرد هەرچی زووترە رێستورانەكە بە جێ بێڵین و بچینە دەرەوە هەوایەك هەڵمژین و تۆزێك بێینەوە سەر خۆ.

پاش هاتنە دەرەوە لە ترۆكاردۆ، ئەو بڕیاری دا بگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە. پێشنیارم كرد كالسكەیەك بگرین بەڵام ئەو حەزی دەكرد بە پێ بڕوات و چونكە ماڵیان لە شەقامی «كەمبرۆل»دا بوو خواخوام بوو كە بە پێ بڕۆین. واتای ئەو كارەش ئەوە بوو كە من دەرفەتی زیاترم هەیە كە لەگەڵیدا بم.

كە تۆزێك لە هەژانەكەم دامركابووەوە، ئەویش ریلاكستر و خۆمانییتر دەهاتە بەرچاو. ئەو شەوە قەراخی رووباری «تایــمز»مان گرتبووە بەر و پیاسەمان دەكرد. «هەتی»(ناوی كچەكە هەتی بوو)باسی قسە و گاڵتەكانی كچە هاوڕێكانی بۆ دەكردم و هەندێ قسەی هەلەق و مەلەقی دەكرد، بەڵام من زۆر گوێم بە قسەكانی نەدەدا. تەنیا ئەوەم دەزانی كە ئەو شەوە بۆ من شەوی هەژان و خەلسە و لەخۆبوونە. خەریكی سەیر كردنی ئاسمانەكانم و نوقمی كەیف و چێژ و خۆشییەكی دڵخوازم.

پاش ئەوەی كە لە یەكدیی جیا بووینەوە، من گەڕامەوە بۆ قەراخی رووبار و بە راستی كەیف خۆش بووم! سەرتاپام بوبووە چاكە و خێرخوازی، بە رادەیەك كە باقیی ئەو سێ لیرەیەی كە بۆم

مابووەوە، بەسەر ئەو بێ پەنا و وێڵگەڕانەی کە لە گوشە و کەناری رووباری تایـمزدا نووستبوون دابەشم کرد.

بەڵێنمان بە یەکتر دا بەیانیی رۆژی دواتر کاتژمێر حەوت یەکدی ببینینەوە، چونکە ئەو کاتژمێر هەشت لە شوێنێکدا لەشەقامی«شیفتس بۆری»تەمرینی هەبوو. لە ماڵەکەی ئەوەوە تا وێستگەی مێترۆی «وێست مینستێر بریج رود» ٢/٥ کیلۆمتر رێگا بوو و" هەرچەند من شەوانە تا درەنگانێك كارم دەکرد و هەرگیز پێش کاتژمێر دوو نەدەنووستم، بەڵام بەیانییان زوو هەڵدەستام. کازێوە بوو و من بۆ دیداری ئەو لە خەو هەستام. ئیتر شەقامی کەمبرۆل بۆ من دیـمەنێکی جوان و سێحراویی هەبوو، چونکە «هەتی کلی» تیا نیشتەجێ بوو. پیاسەکانی سەرلە بەیانیی و دەست لەناو دەست تا وێستگەی مێترۆ، بۆ من بەختەوەرییەك بوو تێکەڵ بە ئارەزوو و هەوەسی تەمومژاویی و تێکەڵ پێکەڵ. شەقامی کەمبرۆل کە شەقامێکی تەسك و تەنگ و ناشیرین بوو و زۆربەی جار هەوڵم دەدا بەوێدا تێ نەپەڕم، لەوە بەدوا جیلوە و شکۆیەکی مەلەکووتیی هەبوو. بە تایبەت کاتێك کە لەناو تەمی بەرەبەیاندا دەگەیشتمە ئەوێ و خەیاڵی بینینی تارماییەك کە لە دوورەوە بەرەو رووی من دەهات، لەخۆشیاندا هەڵدەلەرزیم. من ئێستا هیچم لەو قسانە نایەتەوە بیر کە لەو پیاسەکردنانەدا بۆی دەکردم. من دەچوومە ناو بێ هۆشیی و خەلسەیەکی تەواوەوە و دڵنیا بووم لەوەی کە هێزێکی نادیار ئێمەی لە یەکدیی نزیك کردۆتەوە و بە یەك گەییشتنیشمان ئاکامی کایەیەکی جوانی چارەنووسە.

سێ رۆژ لە یەکتر ناسینمان تێ پەڕیبوو" سێ رۆژی کورت کە جگە لەو ساتانەی سەر لە بەیانی، باقیی کاتەکانی رۆژ بۆ من گرینگ نەبوون و وەك بڵێی هەر نەشبوون. بەڵام بەیانیی رۆژی چوارەم رەفتاری ئەو گۆڕا. زۆر بە سارد و سڕیی پێشوازیی لێ کردم و تەنانەت ئامادە نەبوو دەستی بـخاتە ناو دەستمەوە. من لۆمەم کرد و بە گاڵتەوە بەوە تاوانبارم کرد کە منی خۆش ناوێت و حەزی لێم نییە.

گوتی:

_ چاوەڕوانیت زۆر زۆرە. من تەمەنم پانـزە ساڵە و تۆ چوار ساڵ لە من گەورەتری.



نەمویست لە مانای توانـجەکەی تێ بگەم، بەڵام نەمدەتوانی خۆم لەوە گێل بکەم کە ئەو لەپڕێکدا گەرەکیەتی لەمن دوورەپەرێز بێت. رێك تەماشای بەردەمی خۆی دەکرد. وەکوو کچە قوتابییەك هەنگاوی رێکوپێکی دەنا و دەستەکانی لە گیرفانی جاکەتەکەیدا بوون.

گوتم:

_ ئیتر بڵێ منت خۆش ناوێت و تەواو و بڕایەوە.

لە وەڵامدا گوتی:

_ ئەگەر راستیت دەوێ نازانم.

_ ئەگەر نازانیت، کەواتە منت خۆش ناوێت.

ئەو لە جیاتی وەڵامدانەوە هەروا ملی رێگەی گرتبوو.

من دیسان وتم:

_ ئێستە زانیت من چ پێشگۆیەکم! پێم وتبووی رۆژێك لەم ئاشنابییە لەگەڵ تۆدا پەشیمان دەبـمەوە.

زۆرم هەوڵ دا بزانم بە راستی دەربارەی من چۆن بیر دەکاتەوە و هەست و سۆزی بەرانبەر من چۆنە، بەڵام ئەو لە وەڵامی هەمموو پرسیارەکانـمدا تەنیا دەیگوت:

_ نازانم.

کتوپڕ پێشنیارێکم بە مێشکدا هات و گوتم:

_ ئاخۆ حازریت ژیانی هاوبەشم لەگەڵ پێك بێنیت؟

_ من هێشتا زۆر منداڵم. .

باشە ئەگەر ناچار بوویتایە مێردت بکردایە، ئاخۆ مێردت بە من دەکرد یان بە کەسێکی تر؟

بەڵام ئەو نەیدەویست هیچ بەڵێنێك بدات و پەیتا پەیتا دەیوت:

_ نازانم.... دیارە تۆم خۆش دەوێت...بەڵام....

لە کاتێکدا دڵم ئۆقرەی لێ بڕابوو گوتم:

_ بەڵام تۆ منت خۆش ناوێت.

ئەو بێدەنگ مایەوە. بەیانییەکی تەماویی بوو و هەواش زۆر گیرابوو و کۆڵانەکانیش حاڵەتێکی خەماویی و خۆڵەمێشاوییان هەبوو.

به دەنگێکی کپەوە گوتم:

ـ گرفتەکە لەوەدایە کە من لەم کارەدا زێدەڕۆییم کرد. بە باوەڕی من وا باشترە لێك جیا ببینەوە و ئیتر هەرگیز یەکتری نەبینینەوە. (لەو کاتەدا گەیبیشبووینە بەردەمی دەرگای چوونەژوورەوەی مێترۆ).

چاوەڕێی ئەوەم دەکرد بزانم ئەو قسانەم چ کاریگەرییەکی لەسەر دادەنێن و ئەو چ هەڵوێستێکی دەبێت!.

ئەو زۆر هێمن و لەسەرخۆ بوو.

دەستیم گرتە ناو دەست و بە سۆزەوە گوشیم و گوتم:

ـ خواحافیز! ئاوا باشترە. چاوەڕوانیی تۆ لە من زیاتر بوو لەوەی کە بووم.

لە وەڵامدا گوتی:

ـ خواحافیز. بەداخەوەم.

ئەو خواحافیزی و داوای لێبوردنە وەکوو چەکوشێك بوو دای بە تەوقی سەرمدا. کاتێکیش لەناو قەرەباڵغیی وێستگەدا لێم ون بوو، بە جارێك هەستم بە بۆشایی و تەنیاییەکی لە تاقەتبڕ کرد.

مەگەر من چیم کردبوو؟ ئاخۆ توند و تیژیی لەڕادەبەدەرم نواندبوو؟ من نەدەبوایە توند قسەم لەگەڵدا بکردایە. وەکوو گەمژە و نەفامێکی پڕ ئیدیعا ڕەفتارم لەگەڵدا کردبوو و وەزعێکم هێنابووە ئاراوە کە دەبوایە لە کاتی بینینی «هەتی»دا حەتمەن بە شێوەیەکی پێکەنیناویی خۆم دەربخەم و ئەویش بەو حاڵەتەم پێ بکەنێت. دەبوایە چیم بکردایە؟ هیچ چارەیەکم نەبوو بێجگە لەوەی کە بەو دەردەی خۆمەوە بتلێم و بسازێم. خۆزگە دەمتوانی تا ئەو ڕۆژەی کە بۆ جارێکی تر دەیبینمەوە ئەو خەم و خەفەتەم لەناو خەو﴿ێکی قورس﴾دا نوقم بکەم. بەهەرحاڵ دەبوایە خۆم بپارێزم لەوەی کە جارێکی تر ببینمەوە مەگەر خۆی حەزی لێ بێت بمبینێت. بیرم لەوە کردەوە ئەگەر جارێکی تر چاوم پێ کەوت، لەگەڵیدا خۆمانیتر و گران و سەنگینتر دەبم. بەڵام ئاخۆ ئەو حەزی دەکرد جارێکی تر بمبینێتەوە؟ بەڵام ئەویش مافی ئەوەی نەبوو بەو ئاسانییە دەسخەڕۆم بکات.

بەیانیی ڕۆژی دواتر تەحەمولم نەکرد و چووم بۆ شەقامی کەمبرۆل. ئەوم نەبینی بەڵام چاوم بە دایکی کەوت.

پێی گوتم:

ـ چ بەڵایەکت بەسەر هەتی هێناوە؟ دوێنێ شەو بە گریانەوە هاتەوە بۆ ماڵ و گوتی تۆ حەز ناکەیت هەرگیز چاوت پێ بکەوێتەوە.



بە بزەیەکی توانج ئاساوە شانم هەڵخست و گوتم:

ـ بۆچی ناڵێی ئەو چ بەڵایەکی بەسەری من هێناوە؟

پاشان بە تۆزێك دڵەڕاکێوە پرسیم ئاخۆ دەتوانم جارێکی تر ببینمەوە؟ دایکی وەك لە رووی بێ متمانەییەوە، سەرێکی لەقاندەوە و گوتی:

ـ نا. پێم وایە پێویست نییە.

داوەتم کرد گلاسێك مەشرووب پێکەوە بخۆینەوە. هەردووکمان چووین بۆ مەیخانەی گۆشەی شەقام و لەوێدا زۆر تکام لێ کرد ئیجازەم بداتێ جارێکی تر هەتی ببینمەوە و دواجار قایلم کرد.

کاتێك گەیبیشتینەوە ماڵ و دەرگامان لێ دا، هەتی خۆی دەرگاکەی کردەوە. سەری سوور ما و ناوچاوی دا بە یەکدا. تازە دەموچاوی شتبوو و بۆنی سابوونی دەدا. لەو حاڵەتەدا کە لەبەر دەرگاکە بە بێ جووڵە ڕاوەستابوو، بە چاوە درشتەکانی و بە نیگایەکی سارد و بێڕۆحەوە تەماشای دەکردم. زانیم ئیتر جێی هیچ هیوایەك نییە. هەوڵم دا تۆزێك شیرین زمانیی بکەم و گوتم:

ـ هاتووم جارێکی تر خواحافیزیت لێ بکەم ! .

هیچ وەڵامی نەدامەوە و زانیم کە پەلەیەتی و حەز دەکات هەرچی زووتر گێچەڵی منی لە کۆڵ بێتەوە.

دەستێکم بۆ درێژ کرد و دەم بە بزەوە گوتم:

ـ باشە، خواحافیز!

بە ساردیی وەڵامی داوە:

ـ خواحافیز.

وەرسووڕامەوە و ڕۆشتم و ئاگام لە دەرگاکە بوو کە بە ئارامی لە پشت سەرمەوە داخرا.

پێنج جار زیاتر "هەتی"م نەدیبوو و هەرکام لە دیدارەکانیشمان زیاتر لە ٢٠ خولەکیان نەخایاندبوو. بەڵام هەر ئەو چاوپێکەوتنە کورتانە، ماوەیەکی زۆر کاریگەرییان لەسەرمدا مابووەوە.

## ٧

# پەڕینەوە لە ئۆقیانووسی ئەتلەس

ساڵی ١٩٠٩ چووم بۆ پاریس. ئاغای«بۆرنێل»بەڕێوەبەری تەماشاخانەی «فوولی بێرژر» گرووپی کارنۆی بۆ ماوەی مانگێك بە کرێ گرتبوو کاری بۆ بکەن. بیرکردنەوە لە ڕۆشتن بۆ وڵاتێکی بێگانە، وەڕەزی دەکردم. حەفتەیەك پێش ئەوەی کە سواری کەشتی ببین، لە شاری«ڤۆڵۆیچ»دا نـمایشمان کرد. شارێکی خەمهێنەر بوو و حەفتەیەکی خەماویی و زۆر ناخۆشمان تیایدا تێ پەڕاند و خوا خوام بوو هەرچی زووترە بچین بۆ شوێنێکی تر. ڕۆژێکی یەکشەمە بوو کە دەبوایە بەیانیی زوو بکەوینە ڕێ. نزیك بوو لە قەتارەکە جێ بـمێنم و ماوەیەکی زۆر بەدوای قەتارەکەدا ڕام کرد تا دواجار توانیم پێی بگەم و سوار بووم و بە هەمان شەمەندەفەر تا بەندەری«دوور»چووم. لەو سەردەمەدا یەکێك لە تایبەتـمەندییەکانی من ئەوە بوو کە هەمیشە لە شەمەندەفەرەکان بە جێ دەمام.

باران وەك گۆزەی سەروژێر بەسەر دەریای«مانش»دا دەباری، بەڵام کاتێك بۆ یەکەم جار وڵاتی فەڕەنسام لەناو تەم و باراندا بینی، تووشی هەژانێك بووم کە هەرگیز لە بیرم نەچووەوە. وا بزانم هەرکە خاکی فەڕەنسام بینی، چەند جار لە ناو دڵمدا گوتم:«ئەمە ئیتر بەریتانیا نییە، ئەمە کیشوەری ئەوروپایە! فەڕەنسایە! ».

فەڕەنسا وڵاتێك بوو کە هەمیشە هێزی خەیاڵی منی بزواندبوو. باوکم ڕەگێکی(ڕەچەڵەکێکی) فەڕەنسی هەبوو و لە ڕاستیدا بنەماڵەی چاپڵین، یان بە وتەی فەڕەنسیەکان«شاپلین» لە بنەڕەتدا فەڕەنسی بوون. ئەو بنەماڵەیە لە سەردەمی«هۆگنۆکان »دا هاتبوون بۆ بەریتانیا و لەوێ نیشتەجێ بووبوون. مامی باوکم بە شانازییەکی تەواوە دەیوت کە لقە ئینگلیزییەکەی بنەماڵەی چاپڵین ڕەچەڵەکیان دەچێتەوە سەر ژەنراڵێکی فەڕەنسی.

دوارۆژەکانی پاییز بوو و سەفەر لە بەندەری«کالە»وە بۆ پاریس لە هەوایەکی ئێجگار خراپدا دەستی پێ کرد. لەگەڵ ئەوەشدا وردە وردە کە لە پاریس نزیك دەبووینەوە، تاسە و هەژانی من هەر



دەهات و زیادی دەکرد. لە ناوچەیەکی زۆر ناخۆش و چۆڵ و هۆڵەوە تێ دەپەڕین، بەڵام لە ئاسمانێکدا کە کەم کەم تاریك دەبوو، ڕووناکییەکی پرشنگدارمان بینی کە هەردەم گەورەتر و گەورەتر دەبووەوە.

کابرایەکی فەڕەنسی کە لە کابینی ئێمەدا دانیشتبوو گوتی:

_ ئەمە ڕەنگدانەوەی تیشکی چراکانی پاریسە.

پاریس ڕێك بەوجۆرە بوو کە ئارەزووم دەکرد. شوێنی هاتوچۆکەمان لە وێستگەی شەمەندەفەری باکوور تا کۆڵانی«ژێیۆ فروا ماری»تەواو تووڕە و بێ تاقەتی کردبووم. لە هەموو شوێنێکیدا حەزم دەکرد دابەزم و درێژەی ڕێگاکە بە پێ ببڕم. چرا زێڕینەکانی ناو کافتریاکان، بە ڕووناکییەکی گەرم و پێشوازیکەرانەوە دەدرەوشانەوە و ئەو مێزانەش کە لەناو مانگەشەودا بە ریز دایاننابوون، خۆشیی ژیانیان لێ دەچۆڕی. بێجگە لە چەند تازەگەرییەك کە ئەویش بە هۆی دەرکەوتنی چەند ئتۆمبێلێکەوە رووی دەدا، پاریس هەمان ئەو پاریسەی شێوەکارە گەورەکان لەوانە«مۆنە» و «پیسارۆ» و «ڕێنوار» بوو. هەوا پڕ بوو لە تیشکی شادیی و ژیان. تەنانەت ژوورە بچووکەکەشم لە کۆڵانی «ژێیۆ فروا ماری»دا کە بەرەپێکەی بە خشت(ئاجۆڕ) فەرش کرابوو و من بە «حوجرەی زیندانی باستی»خۆم ناودێرم دەکرد، نەیتوانی لە تاسە و خرۆش و هەژانم کەم بکاتەوە“ چونکە ئێمە زیاتر لە تارمەی کافتریاکاندا کاتـمان بەسەر دەبرد.

بە داخەوە گەشتی من لە پاریسدا زۆری نەخایاند و بە خەم و حەسرەتەوە ناچار بووم بگەڕێـمەوە بۆ بەریتانیا. بە ڕاستی چ جیاوازییەك لە نێوان فەڕەنسا و بەریتانیادا هەیە! چی باس بکەم لەو ئێوارە خەماوییانەی ڕۆژانی یەکشەمە لە شارە باکوورییەکانی بەریتانیا کە هەموو دووکان و کافتریاکان داخراون و دەنگەدەنگی خەفەتهێنەری گرمەی زەنگەکانی کلێسا ، هاوڕێیەتیی ئەو کوڕو کچە گەنـجە تاسەمەندانە دەکەن کە بزەی ناڕەزایەتیی و تووڕەییان لەسەر لێوانە و کۆڵان و شەقامە تاریکەکان دەپێون! . وە ئەوەش تاقە دڵخۆشیی و سەرگەرمیی ئەوانە.

شەش مانگ دەبوو گەڕابوومەوە بۆ بەریتانیا و کارە ئاساییەکانی خۆمم دەست پێ کردبووەوە کە لە ناکاودا هەواڵێکم لە نووسینگەی لەندەنەوە بۆ هات و بڕێك خرۆش و هەژانی خستە ناو ژیانـمەوە. ئاغای کارنۆ پێی ڕاگەیاندبووم کە لە دووهەمین گەشتی نـمایشی پێشبڕکێی تۆپێندا دەبێ جێی ئاغای هاری ڤۆڵدن بگرمەوە. ئیتر ئەو هەستەم لە لا دروست بوو کە ئەستێرەکەم خەریکی سەرکەوتنە. ئەوە بۆ من شانسێکی گەورە بوو. دیارە هەندێ سەرکەوتنم لە شانۆگەرییەکانی باڵندە

نەغمەچڕەکان و شانۆگەرییەکانی تری گرووپەکەدا بە دەست هێنابوو، بەڵام ئەوانە لەچاو رۆڵی یەکەمی شانۆگەریی پێشبڕکێی تۆپێندا هیچ نەبوون. جیا لەوەش بڕیار وابوو یەکەم نـمایش کردنیشمان لە ئاکسفۆرددا بێت کە گرینگترین کابارەی لەندەن بوو. بەرنامەکەی ئێمە دەبوایە گرینگترین بەرنامەی سەگەرمیی ئەو کابارەیە بێت و یەکەم جاریش بوو کە ناوی من بە پیتی گەورە لە راگەیاندنەکاندا چاپ دەکرا. ئەوە خۆی لە خۆیدا هەنگاوێکی گەورە بوو. ئەگەر لە ئاکسفۆرددا سەرکەوتنم بە دەست هێنابا، هێمای «بایراق»م وەردەگرت کە ئەو هەلەی بۆ دەڕەخساندم داوای حەقدەستی زیاتر بکەم و کەم کەم شانۆنامەکانی خۆشم بێنمە سەر شانۆ. لەڕاستیدا وەها سەرکەوتنێك ئەو دەرفەتەی پێ دەدام جۆرەها پلان و بەرنامەی باش و سەرنـجڕاکێش بـخەمە ڕوو. چونکە گرووپەکەمان هەر ئەوانە بوون کە بۆ نـمایشکردنی شانۆگەریی پێشبڕکێی تۆپێن دامەزرابوون، حەفتەیەك تەمرینمان بەس بوو. زۆر بیرم لەوە کردەوە کە ئەو رۆڵە تازەیە بە چ شێوەیەك بگێڕم. هاری ڤۆڵدن بە شێوەزاری لانکشایریی قسەی دەکرد و من بڕیارم دا قارەمانی شانۆ، بە شێوەزاری کوڕە شارییەکانی لەندەن قسە بکات.

بەداخەوە لە یەکەم خولی نـمایشەکەدا تووشی ژانە قوڕگێکی پیس هاتم. زۆرم هەوڵ دا بۆ پاراستنی دەنگی خۆم. هیچ قسەم نەدەکرد و هەر بە چرپە قسەم دەکرد. بـخوورم هەڵدەمژی و دەرمانم دەخوارد و دواجار وام لێ هات هەموو جۆرە زەوق و گاڵتەجاڕییەکی لێی سەندم کە بۆ دەورگێڕانەکەم پێویست بوو.

یەکەم شەوی نـمایش، هەموو دەمارەکانی ملم ئەوەندە هەویان کردبوو خەریك بوو دەپچڕان. دەنگم وەها کپ بوبووەوە کە نەمدەتوانی بە کەسی بگەیەنم. پاشان کارنۆ سەردانی کردم. هەڵسوکەوتی تێکەڵەیەك بوو لە ناڕەزایەتی و سووکایەتی پێکردن. بە دەنگێکی لۆمەئاساوە گوتی:

_ کەس دەنگی تۆی نەدەبیست.

دڵنیام کردەوە کە تا سبەی شەو دەنگم باشتر دەبێت، بەڵام باشتر نەبوو. لەڕاستییدا خراپتریش بووبوو، چونکە ئەوەندە فشارم بۆ دەنگم هێنابوو کە لەوانە بوو بۆ هەمیشە دەنگم لە دەست بدەم و ئەوەش زۆری دەترساندم. شەوی دواتر «بەدەڵ بێژ » جێی منی گرتەوە و وای لێ هات کە لە کۆتایی حەفتەی یەکەمدا نـمایشەکەیان داخست. هەموو ئومێد و هیواکانم بۆ دامەزران لە ئاکسفۆردا، بوونە بلقی سەر ئاو و بە هۆی بێهیواییەوە تووشی هەڵامەت و گرییێکی ناخۆش هاتم و لە جێ کەوتم.

***



زیاتر لە ساڵێك دەبوو کە چاوم بە «هەتی» نەکەوتبوو. لەو حاڵەتی سستیی و خەم و خەفەتەدا کە دوای نەخۆشیی گرییەکەم تووشی هاتبووم، دیسانەوە بیرم دەکرد و شەوێکیان پێم نا بە جەرگمدا و بەرەو ماڵیان لە شەقامی کەمبرۆلدا کەوتـمە رێ، بەڵام خانووەکە چۆڵ بوو و لەوحێکیان لەبەر دەرگاکەیان هەڵواسیبوو ئەمەی لەسەر نووسرابوو:« بۆ کرێ».

بە بێ هیچ ئامانج و مەبەستێك لە شەقامەکاندا پیاسەم دەکرد کە لە پڕێکدا تارماییەك لەناو تاریکیی شەودا لە بەرانبەرمدا دەرکەوت و گوتی:

_ ئاه... چارلی! تۆ لێرە چ دەکەیت؟

هەتی بوو. پاڵتۆیەك لە پێستی«فۆکی رەش»ی لەبەردا بوو و هەروەها کڵاوێکی بچووك و خرتیشی بە سەرەوە بوو کە ئەویش لە پێستی فۆك بوو.

بە گاڵتەجاڕییەوە گوتم:

_ هاتبووم چاوم پێت بکەوێت.

دەم بە بزەوە گوتی:

_ زۆر کز و لاواز بوویتە!

پێم گوت نەخۆشیی گریپم هەبوو، تازە هەستاومەتەوە. هەتی لەو کاتەدا تەمەنی ١٧ ساڵ بوو. زۆر جوان بوو و جلێکی جوان و شاهانەی لەبەر کردبوو.

پرسیم:

_ باشە ئەی تۆ لێرەدا چی دەکەیت؟

_ چووبوومە سەردانی یەکێك لە هاوڕێکانم و ئێستاش دەچم بۆ بینینی براکەم. حەز دەکەیت لەگەڵم بێیت؟

لەناو رێگەدا بۆی گێڕامەوە کە خۆشکەکەی مێردی بە ملیاردێرێکی ئامریکایی کردووە بەناوی«فرانك جی گۆڵد» و ئێستاش هەموویان نیشتەجێی«نیس»ن و خۆشی سبەینێ لەندەن بە جێ دەهێڵێت و دەچێت بۆ نیس بۆ لای خۆشك و زاواکەیان.

ئەو شەوە چاوم لێ بوو کە بە چ حاڵەتێکی بزوێنەرانەوە لەگەڵ براکەیدا سەمای دەکرد. لەگەڵ براکەیدا وەکوو پەرییەکی گەمژەی دەریایی رەفتاری دەکرد و منیش بە پێچەوانەی ویستی دەروونیم هەستم دەکرد کە خەریکە لەبەر چاوم دەکەوێت. ئاخۆ ئەویش وەکوو کچێکی خوێڕیی، ﴾لە رووی

ئاكارییەوە﴾ دارمابوو؟. ئەو جۆرە بیرکردنەوەیە خەمباری دەکردم و منیش هەوڵم دا بە دیدێکی واقعبینانەترەوە چاوی لێ بکەم.

لە روخساریەوە وا دیار بوو قەڵەوتر بووە. دەوری سینەیم بینی و پێم وابوو مەمکەکانی بچووك‌و نارێك و پێکن. ئاخۆ ئەگەر بۆم رەخسابایە، دەمـخواست؟ نا، من ئارەزووی هاوسەرگیرییم لەگەڵ هیچ ژنێك نەبوو.

لە گەڕانەوەمدا بۆ ماڵەوە، لەو شەوە سارد و رووناکەدا کە پێکەوە بووین، کاتێك باسی ژیانێکی ئابڕوومەند و تێکەڵ بە بەختەوەرییم بۆ کرد، خۆم وەك کەسێکی خەمبار و بێعار نیشان دا و پێی گوتم:

_ سیمایەکی ئەوەندە خەفەتبارت هەیە، خەریکە بۆت بگریم.

ئەو شەوە هەستم بە سەرکەوتنێکی گەورە دەکرد، چونکە توانیبووم بەو سیما خەمبارەی خۆمەوە، کاریگەریی لەسەر دابنێم و ناچاری بکەم دەرك بە کەسایەتیم بکات.

کارنۆ لە شانۆی باڵندە گۆرانی¬بێژەکاندا دیسان دەورێکی پێ دام و منیش بە هۆی گاڵتەی چارەنووسەوە لە ماوەیەکی کەمتر لە مانگێکدا دەنگەکەم چاك بوبووەوە. هەرچەند بێهیواییم لەو شکستەی نـمایشی پێشبڕکێی فوتباڵدا زۆر گەورە بوو، بەڵام هەوڵم دا خۆمی لێ گێل بکەم. بەڵام بیرکردنەوە لەوەش ئازاری دەدام کە من رەنگە شیاوی ئەوە نەبم جێی ڤۆڵدن بگرمەوە و جیا لە هەموو ئەوانەش، بیرەوەریی شکستەکەی فۆرستر، وەك تارماییەکی شووم و بەدفەڕ ئازاری دەدام. من لەبەر ئەوەی کە باوەڕبەخۆبوونەکەی جارانم نەمابوو، لە هەر نـمایشێکدا کە دەوری یەکەمیان پێ بدایەم، پرسەم دەگرت. دواجار رۆژێکی ترسناك هاتە پێشەوە کە پێویست بوو بە ئاغای کارنۆ بڵێم گرێبەستەکەم دوایی هاتووە و حەقدەستی زیاترم دەوێت.

کارنۆ لەگەڵ ئەو کەسانەدا کە خۆشی نەدەویستن، لەوانە بوو بێ بەزەیی بێت و توند و تیژیی بنوێنێت، بەڵام چونکە منی زۆر خۆش دەویست هەرگیز رەفتارێکی وەهای لەگەڵ نەکردم. دیارە ئیمکانی هەبوو شەڕ بفرۆشێت و لەگەڵ منیشدا ئەو کارە بکات. کاتێك درامایەکی کۆمێدیی ئەو لەسەر شانۆ بوایە و رقی لە ئەکتەرێك هەستایە، دەچوە لای پشتەوەی شانۆ و لوتی خۆی دەگرت و جرتێکی گەورەی بۆ لێ دەدا. جارێکیان کە ئەو کارەی بۆ ئەکتەرێکی زۆردار و شەلاّتی کرد، تووڕە بوو و شانۆکەی بەجێ هێشت و پەلاماری کارنۆی دا. هەر ئەوە وای لە کارنۆ کرد ئەو رەفتارەی بۆ



هەمیشە بـخاتە لاوە. ئینجا بیری لێ بکەنەوە من لەبەر دەمیدا قوت بوومەتەوە و باسی گرێبەستی تازە و زیادکردنی حەقدەستی لەگەڵ دەکەم ! ! ! .

بزەیەکی بێ شەرمانەی کرد کە دیار بوو گاڵتەی پێم دەهات و گوتی:

_ ئا...وا...! کە بەڕێزت داوای حەقدەستی زیاتر دەکەیت...؟! بەڵام کافتریا-کابارەکان دەیانهەوێت ئەو پارەیەی کە پێمانی دەدەن کەمتر بکەنەوە(شانێکیشی هەڵخست). لەو کاتەوەی کە نـمایشەکەمان لە ئاکسفۆردا تووشی ئەو شکستە بوو، هەموان تانە و تەشەرمان لێ دەدەن و قسە و قسەڵۆکمان وەدوو دەخەن. دەڵێن گرووپی ئێمە لە ئاستێکی باشدا نییە و هێشتا وەك پێویست باش نییە.

گوتم:

_ جا ئەوە بە من چی! خۆ من بەرپرسیار نیم لەو بارودۆخە!

_ جا با ئەوەت پێ بڵێم کە زیاترین رەخنەکان لە تۆ دەگیردرێن! .

پرسیم:

_ باشە چی دەڵێن؟

گەڕووی ساف کرد و چاوی بڕییە بەرەپێی ژوورەکە و گوتی:

_ دەڵێن تۆ ئەکتەرێکی باش نیت.

ئەو قسەیە وەك تیرێك لە دڵمی دا و لە هەمان کاتیشدا تووڕەی کردم بەڵام دانم بەخۆدا نا و بە ئارامیی وتم:

_ باشە، بەڵام کەسانێکی تریش هەن کە وا بیر ناکەنەوە و ئامادەن زیاتر لەو پارەیەم بدەنێ کە لێرە پێم دەدەن ( ئەو قسەیەشم راست نەبوو چونکە هیچ کەس پێشنیاری لەو جۆرەی پێ نەکردبووم).

_ دەڵێن دراماکە هەر زۆر هیچ و پووچە و ئەکتەری یەکەمیشی خراپە. دەڵێی وانییە! فەرموو! (تەلەفۆنەکە هەڵدەگرێت) ئێستا تەلەفۆنێك بۆ «بێرمۆندسی» دەکەین و رای خاتوو.... . وەردەگرین کە سوپەرستاری شانۆیە. تۆ خۆت قسەی لەگەڵ بکە با بزانیت من راست دەکەم... لە تەلەفۆنەکەدا گوتی:« بە رای ئێوە نـمایشی حەفتەی رابردوومان باش بوو؟»...

دەنگێك لەوبەری تەلەفۆنەکەوە هات و گوتی:

_ هەر زۆر خراپ بوو!

کارنۆ زەردەخەنەیەکی تاڵی کرد و نیگایەکی لە من کرد و دیسان لە تەلەفۆنەکەدا گوتی:

_ تکایە بۆمان روون بکەنەوە. مەبەستان لەو قسەیە چییە؟

_ هەر ئەوە وتم، زۆر خراپ بوو!

_ بیروڕات سەبارەت بە چاپڵین ئەکتەری یەکەمی دراماکە چییە؟ ئاخۆ ئەویش باش نەبوو؟

_ ئەویش هەر زۆر خراپ بوو.

کارنۆ بە حاڵەتێکی تێکەڵ بە گاڵتە پێکردن و سووکایەتی پێکردنەوە تەلەفۆنەکەی لێ نزیك کردمەوە گوتی:

_ فەرموو، خۆت گوێ بگرە!

منیش تەلەفۆنەکەم گرت و لە وەڵامدا گوتم:

_ رەنگە من خراپ بم بەڵام هێندەی نیوەی ئەو شانۆە چڵکنەی ئێوە خراپ نیم.

هەوڵ و تەقەلای ئاغای کارنۆ بۆ ئەوەی وازی لێ بێنم، فایدەی نەبوو. پێشم گوت ئەگەر تۆش وەك ئەو خانــمە رات لەسەر ئەوەیە کە من ئەکتەرێکی خراپم، پێویست بە گرێبەستی تازە ناکات. کارنۆ لە زۆر روەوە پیاوێکی زیرك و عاقڵ بوو بەڵام دەروونناسێکی لێهاتوو نەبوو. تەنانەت ئەگەریش من خراپ بوومایە، کارنۆ نەزانیی کرد و نەدەبوایە تەلەفۆنی بۆ کەس بکردایە کە وەها شتێکم پێ بڵێت. من پێنج لیرە لە حەفتەیەکدا حەقدەستم وەردەگرت و هەرچەند لە رووی رۆحییەوە تێك چووبووم، داوای شەش لیرەم کرد و بەوپەڕی سەرسووڕمانەوە داواکەی بۆ جێبەجێ کردم و من دیسان کەوتــمەوە بەر لوتف و میهرەبانیی ئەوەوە.

❊❊❊

«ئالف ریۆز» بەڕێوەبەرە ئامریکاییەکەی کارنۆ گەڕابووەوە بۆ بەریتانیا و دەنگۆی ئەوە لە ئارادا بوو کە هاتووە بۆ ئەوەی کە ئەکتەرێك بۆ دەوری یەکەمی دراماکانی بدۆزێتەوە و لەگەڵ خۆیدا بیبات بۆ ئامریکا.

هەر لەو کاتەوە کە تووشی ئەو شکستە گرانەی ئاکسفۆرد بووبووم، ئاواتم ئەوە بوو بچم بۆ ئامریکا“ نەك تەنیا بۆ مەیلێکی سەرچڵانە، بەڵکوو لەبەر ئەوە کە چوونم بۆ ئامریکا وەك زیندووکردنەوەی ئومێد و ئامانــجەکان و دەسپێکردنێکی تازە لە دنیایەکی تازەدا بوو.

بەختەوەرانە لە شانۆی«پاتینوار»ی شاری «بیر مەنگام»دا یەکێك لە دراما تازەکانی ئێمە لەسەر شانۆدا بوو کە منیش ئەکتەری یەکەمی بووم و لەوپەڕی سارد و سڕییدا بوو﴿و پێشوازیی لێ



نەدەکرا﴾ و کاتێك ئاغای ریۆز هات و گرووپەکەی ئێمەی لەوێدا بینی، من هەرچییەکم دەزانی و هەر ئەدا و ئەتوارێکم هەبوو لەوێ هەڵمڕشت و گەلێك شیرینکارییم کرد و وای لە ئاغای ریۆز کردبوو کە دەسبەجێ تەلگرافێکی بۆ کارنۆ نارد کە ئەکتەری دڵخوازی خۆی بۆ ئامریکا دۆزیوەتەوە. بەڵام کارنۆ سەبارەت بە من هەندێ پلانی تری لە مێشکدا بوو. ئەو خەبەرە ناخۆشە وەها مات و دڵتەنگ و دەستەوەستانی کردم کە چەندین حەفتە وەڕەز بووم، تا ئەوەی کە کارنۆ هاتە سەر ئەو رایە کە درامایەك بە ناوی«هووهووکان» لە ئامریکادا نــمایش بکات. هووهووکان درامایەکی گاڵتەجاڕیی بوو دەربارەی فێرکردنی ئەندامێك کە تازە لە ئەنــجومەنێکی نهێنییدا ئەندامەتییان پێ دابوو. من و ریۆز لەو باوەڕەدا بووین کە ئەم بەرنامە، شتێکی دەبەنگانەیە و هیچ بایەخێکی نییە. بەڵام کارنۆ حازر نەبوو لە رای خۆی پاشگەز ببێتەوە و دەیگوت چونکە ئامریکا پڕە لەو ئەنــجومەنە نهێنییانە، درامایەکی لەو جۆرە، پێشوازیی باشی لێ دەکرێت. بەڵام من هەر خۆشحاڵ بووم چونکە منیان بۆ بینینی دەوری سەرەکیی هووهووکان لە ئامریکادا دەسنیشان کردبوو.

ئەو دەرفەتە زێڕینەی بۆ من رەخسابوو کە بچم بۆ ئامریکا، رێك ئەو شتە بوو کە بە تەمای بووم و بۆ من زۆریش پێویست بوو. لەبارەی خۆمەوە وەها بیرم دەکردەوە کە لە بەریتانیادا گەیشتوومەتە ئەوپەڕی پێشکەوتن و جیا لەوەش ئیمکاناتی من لە بەریتانیادا، گەلێك کەم و سنووردار بوو. بەو فێرکارییە کەمەی کە فێریان کردبووم و بەو خوێندەوارییە زۆر کەمەی کە هەمبوو، ئەگەر لە پیشەی ئەکتەربوونی شانۆ یان کافتریا-کابارەدا سەرکەوتنم بە دەست نەهێنابایە، هیچ رێگایەکی ترم لەبەر دەمدا بۆ نەدەما بێجگە لەوەی کە نۆکەریی بکەم. بە پێچەوانەوە لە ئامریکادا هەندێك دیــمەنی پرشنگدارم لەبەردەمدا بوو.

شەوی پێش حەرەکەت کردنــمان، بۆ پیاسە کردن چووم بەرەو وێست ئەند و لە گۆڕەپانی«لایسستر» و شەقامی«کاونتری» و گۆڕەپانی«پیکادلی»دا وەستام و خەفەتم لەوە دەخوارد کە ئەوە دوایین جارە لەندەن دەبینم“ چونکە بڕیارم دابوو بۆ هەمیشە لە ئامریکادا بــمێنمەوە. تا کاتژمێر دووی بەیانیی پیاسەم کرد و لەناو حاڵەتی شاعیرانەی کۆڵانە چۆڵەکان و خەم و ماتەمە دەروونیەکانی خۆمدا نوقم بووبووم.

حەزم نەدەکرد خواحافیزی لە کەس بکەم. هەرچەند بەجێ هێشتنی کەسوکار و هاوڕێکان سەخت و ناخۆشە بەڵام هاتنی ئەوان بۆ وێستگەی شەمەندەفەر بە مەبەستی خواحافیزی کردن، خەم و

خەفەتەکان زیاتر دەکات. هەربۆیە تەنانەت سیدنیشم لە خەو هەڵنەستاند و تەنیا یاداشتێکم لەسەر مێزەکە بۆ دانا بەم ناوەڕۆکە:« من دەچم بۆ ئامریکا. دواتر هەمموو شتێکت بۆ باس دەکەم. ماچت دەکەم. چارلی».



**۸**

## گێرسانەوە لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکادا

لە ڕێگای «کوێبێك »دا ۱۲ ڕۆژی تەواو لەناو هەوایەکی ترسناکی گەردەلوولییدا بووین. سێ ڕۆژی تەواومان بە سوکانێکی شکاو و چارۆکەیەکی تا سەری سەر هەڵدراوەوە تێپەڕ کرد. بە هەموو ئەوانەشەوە من خۆشحاڵ بووم لەوەی کە پێ دەنێمە کیشوەرێکی ترەوە. سەفەرەکەمان لە ڕێگای کانادا و بە کەشتییەکی تایبەت بە بارکردنی ئاژەڵ ئەنجام درا. هەرچەند هیچ ئاژەڵێك لەناو کەشتییەکیدا نەبوو، بەڵام تا حەز بکەیت مشکی تێدا بوو" ئەویش چ جۆرە مشکێك! مشکی زل و زەبەلاح کە بەوپەڕی بێ شەرمییەوە لە ژێر قەرەوێڵەکەمدا هەڵدەستانە سەر هەردوو قاچ و منیش ناچار دەبووم لنگە پێڵاوێکیان بۆ فڕێ بدەم.

لە سەرەتای مانگی سیپتامبر و لە هەوایەکی تەمومژاویی و لە تەنیشت «نیشتمانی تازە »دا تێپەڕین و دواجار توانیمان بگەینە وشکانی. ڕۆژێك بوو کە بارانێکی بە غورەم و ورد دەباری و کەناراوەکانی «سن لۆران»یش چۆڵ و هۆڵ دەهاتنە بەرچاو. دیمەنی کوێبێك لەناو کەشتییەوە ئینسانی دەخستەوە یادی ئەو بورج و قەڵایانەی کە تارمایی «هەملێت » تیایاندا پیاسەی کردبوو و منیش کەم کەم هەندێ پرسیارم سەبارەت بە وڵاتە یەکگرتوەکانی ئامریکا لە لا دروست دەبوو.

بەڵام کە وردە وردە بەرەو«تۆرنتۆ» دەچووینە پێشێ، دەشت و دەرەکان هەرچی زیاتر بە ڕەنگە پاییزییەکانیانەوە جوانتر دەبوون و منیش ورە و ئومێدم زیاتر دەبوو. هەرکە گەییشتین، دابەزین و سواری قەتارێکی تر بووین و «ئیدارەی پەنابەرێتیی» ئامریکاشمان تێپەڕاند. دواجار ڕۆژێکی یەکشەمە کاتژمێر ۱۰ی بەیانیی گەییشتینە نیویۆرك. کاتێك لە «تایمز ئسکویر»دا لە تراوموا دابەزین، بڕێك خلیسکام. پارچە ڕۆژنامەی کۆنە و دڕاو لە کۆڵان و شۆستەکاندا ڕژابوون و با دەیهێنان و دەیبردن. «برادوەی » ئەوەندە جوان و دڵڕفێن نەبوو و زیاتر لە ژنێکی شپرزە دەچوو کە تازە لە خەو هەستابێتەوە.

تەقریبەن لە هەمووگۆشە و کەنارێکی شەقامەکاندا کورسیی بەرزی راحەتییان دانابوو کە قاڵبی کەوشیان لەسەردانابوون و هەندێ کەسیش بە کراسێکی ئاسایی لەبەردا و بە خۆشحاڵییەوە پاڵیان پێوە دابوون و پێڵاوەکانیان بۆیە(واکس) دەکرد. مرۆڤ کە چاوی لێ دەکردن پێی وابوو ئەمانە گەرەکیانە لە ناوەڕاستی شەقامدا خۆیان بڕازێننەوە. زۆربەیان غەریب دەهاتنە بەرچاو و وەك بڵێی لە شۆستەکاندا وێڵ و سەرگەردانن" لەوانەیە تازە لە وێستگەی شەمەندەفەر هاتبێتنە دەرەوە و چاوەڕێی گەییشتنی قەتاری دووهەمیان دەکرد.

لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا، ئەوێ نیویۆرك بوو، نیویۆرکێك کە مرۆڤی سەرسام دەکرد و تۆزێکیش ترسناك بوو. نیویۆرکێك کە بۆنی شتانی چاوەڕوان نەکراوی لێوە دەهات. بەڕای من پاریس ئێسك سووکتر و میهرەبانتر بوو. ئەگەرچی زمانی فەرەنسام نەدەزانی، بەڵام پاریس لە هەموو گۆشە و کەنارێکیدا، بە مەیـخانە و کافتریاکانیەوە پێشوازیی لێ کردبووم. دیارە نیویۆرك شارێکی بازرگانییە. پێدەچوو «باڵەخانەکان» ، بێشەرمییەکی بێڕەحمانەیان هەبێت و گاڵتە بە دابونەریتی ئینسانە بچووك و بێ هێزەکان دەکەن. تەنانەت لە بارەکانیشدا کورسییان بۆ دانیشتن دانەدەنا و تەنیا نەردەیەکی درێژی مسیان لێ بوو کە تەنیا دەتوانرا قاچێکی لەسەر دابنرێت. رێستوورانەکانیش ئەگەرچی پاك و خاوێن بوون و دیوارەکانیشیان لە مەرمەڕی سپیی بوون، بەڵام حەڵەتێکی سارد و سڕیان هەبوو و لە نووسینگەی پزیشك دەچوون.

من ژوورێکی حەوشەدارم لە یەکێك لە بیناکانی نزیك شەقامی ژمارە ٤٣ دا بە کرێ گرت، کە ئەمرۆ بینای «تایـمز»ی لێیە. ژوورێکی ئەوەندە پیس و پۆخڵ بوو کە حەسرەتی لەندەن و ئاپارتـمانە بچووکەکەیم لا زیندوو بووەوە. لە ژێرزەمینەکەیدا دووکانێکی رەنگرێژیی تێدا بوو و بە درێژایی حەفتە، بۆگەنی ئەو جلوبەرگانەی کە دەیانـخستنە ناو رەنگ و هەڵمی داخەوە، زیاتر وەڕەزی دەکردم.

یەکەم رۆژ هەستم بە غەریبی دەکرد. لەبەر ئەوە کە بە شێوەزاری ئینگلیزیی قسەم دەکرد و هێواشیش قسەم دەکرد، چوونەناوی رێستوورانەکان و بانگ کردنیان بۆ هێنانی خواردن، عەزابێکی گەورە بوو. لەوێ هەموو کەسێك زۆر بەرز و خێرا قسەی دەکرد و بیرکردنەوە لەوەی کە من بە مینگەمینگ قسە دەکەم و کاتیان دەکوژم، قەڵسی دەکردم.

بۆ من زۆر سەخت بوو خۆم لەگەڵ ئەو بارودۆخەدا بگونـجێنم. لە نیویۆرکدا تەنانەت خاوەنی بچووکترین دامەزراوەیەکی بازرگانیی، سەرتاپا پڕە لە هەژان و جووڵانەوە. ئەو کەسەی کە پێڵاو بۆیە



دەکات، بە هەژان و جموجۆڵ و قرموقاڵەوە بۆیە دەکات، ئەو کەسەی کە لە باڕدا مەشرووبت پێ دەفرۆشێت، گلاسەکە بە تاسە و هەژانەوە بۆت تێ دەکات و لەسەر مێزە ساف و لووسەکەدا بە خلیسکان بەرەوڕووی تۆ دەیهاوێت. مەعجوون فرۆشێك کە پەرداخێك شیری ماڵت و هێلکەت بۆ دروست دەکات، وەها جووڵە و تەڕدەستییەك دەکات کە دەڵێی جادووگەریی دەکات" لە پڕتاوێك لەناو ئەو هەموو شتومەکەدا پەرداخێك هەڵدەگرێت و پاشان پەلاماری ئەو شتانە دەدات کە دەبێ تێیان بکات:واتە وانیل، خامەی بەستراو، دوو کەوچك ماڵت، هێلکەیەك کە بە لێدانێکی خێرا دەیشکێنێت و دەیکاتە پەرداخەکەوە و پاشان شیری تێ دەکات و هەموویان دەکاتە ناو ئامێرێکی تێکەڵکەرەوە و خولەکێك نابات دەیدا بە دەستەوە.

ئەو رۆژە لە شەقامدا وام هەست دەکرد کە زۆربەی خەڵك بەو دەردەی منەوە گرفتارن" وەکوو من هەست بە تەنیایی و غەریبی دەکەن و وەك مرۆڤی ونبوو وان. هەندێکیش پتەو و بە باوەڕبەخۆبوونەوە هەنگاویان دەنا، وەك بڵێی ئەو شەقامەیان بە موڵکی خۆیان دەزانی. زۆربەیان کەسانێکی بێڕۆح و عەسەبیی بوون و جووڵەکانیان لە پەیکەری بێ گیان دەچوو. وەك بڵێی ئەدەب و میهرەبانیی و خاکەڕاییان، بە سستی و لاوازیی لەقەڵەم دەدا. بەڵام کە شەوانە لەگەڵ خەڵکدا بە جلی هاوینەوە لە شەقامی«برادوەی»دا پیاسەم دەکرد، ورەم تێ دەکەوت. ئێمە بەریتانیامان لە ناوەڕاستی سەرما و سۆڵەی مانگی سێپتامبردا بەجێ هێشت و لەو کاتەدا لە نیویۆرك چلەی هاوین بوو و پلەی گەرما لە سەرووی ٢٧ بوو. کاتێك کە لە شەقامی برادوەیدا پیاسەم دەکرد لە پڕێکدا شەقامەکە بە هەزاران چرای رەنگاوڕەنگ، رووناك بووەوە و وەك زێڕ دەدرەوشایەوە. لەو هەوا خۆشەی شەودا بارودۆخم گۆڕا و وردەوردە هەستم کرد خەریکە لە مانای ئامریکا تێ دەگەم: باڵەخانەکان، چرا رووناك و گەشاوەکان و ئەو هەموو تابلۆ سەیر و سەمەرە کارەبایییە، بە جارێك رۆحیان پڕ لە ئومێد و خۆشەویستیی کردم و گیانێکی تازەیان پێ بەخشیم. بە خۆمم وت:«فەرموو! ئێرە جێی تۆیە! ».

لە برادوەیدا وەك بڵێی هەموان لەسەر سەکۆی شانۆدا بن، وابوو. لەشەقامەکاندا، لە رێستوورانەکاندا، لە هۆتێل و دووکانەکان و بە کورتیی لە هەموو شوێنێکدا ئەکتەر و هونەرمەندانی تەماشاخانە و سێرك و کابارە، حزووریان هەبوو و دەربارەی پیشەی شانۆ قسەیان دەکرد. ناوی هەندێ شانۆی وەك «لی شۆبرت»، «مارتین بەك»، «ڤیلیام مۆریس»، «پرێسی ڤیلیامز»، «کلاو ئەند ئەرلانـجر»، «فرۆمەن»، «سۆلیڤان ئەند کانسیدایـن» و «پانتاجس» بەر گوێ دەکەوت. لەوێدا ژنی

مالْدار، ئاسانسۆرچیی، خزمەتکاری ڕێستووران، شۆفێری شەمەندەفەر، مەشرووب فرۆشی بار، شیر فرۆش یان نانەوا، هەموویان بە شێوەیەك قسەیان دەکرد کە دەتوت سالآنێکی زۆر ئەکتەر بوونە. لە شەقامەکاندا بە لت و پتی گوێت لە هەندێ قسە دەبوو و ژنە بەسالآچوە مالْدارەکان کە لە ژنە گوندییەکان دەچوون، وەهایان دەوت:«لەگەڵ گرووپی شانۆی پانتاجسدا گەشتێکی لە ڕۆژئاوادا کردووە ڕۆژێك سێ نـمایش. ئەو کوڕە بەو نـمایشەی کە کردی، حەتـمەن لە شانۆێکی گەورەتریشدا سەردەکەوێت». دەرگەوانێکیش دەیپرسی:«تۆ نواندنی «جێلسن»ت لە«وینترگاردێن»دا بینیوە؟ دەتوانین بلێین کە ئەو دراماکەی بۆ «جەك» ڕزگار کرد».

ڕۆژنامەکان هەموو ڕۆژێك لاپەڕەیەکی تەواویان بۆ شانۆ تەرخان دەکرد و دیزاینی لاپەڕەکانیشیان بە شێوەیەك بوو کە وەك بلێی بۆ پێشبڕکێکانی ئەسپ سوارییان ڕێك خستبێت. لەو لاپەڕەیەدا ناوی ئەو درامایانەیان دەنووسی کە خەریك بوون نـمایش دەکران و بە پێی جۆری پێشوازیکردنی خەڵك و ئەو چەپلآنەی کە بۆیان لێ دەدان بە پلەی یەکەم و دووهەم و سێهەم ڕیزبەندییان دەکردن. ڕێك وەك ناساندنی ئەسپە براوەکان لە پێشبڕکێی ئەسپ سوارییدا. ئێمە هێشتا پێمان نەنابووە گۆڕەپانی پێشبڕکێوە و من پەلەم بوو هەرچی زووتر بزانم لەسەر ئەو تابلۆیانەدا دەکەوینە کوێی ڕیزبەندییەکەوە. بڕیار وابوو تەنیا لەگەڵ شانۆی پرێسی ڤیلیامزدا گەشتێکی شەش حەفتەیی بکەین و دوای ئەوەش هیچ بەڵێنێکمان بە کەس نەدابوو. کەواتە مانەوەی ئێمە لە ئامریکادا بەندبوو بەوەوە کە دەرەنـجامی ئەو گەشتەمان چۆن دەبێت؟ ئەگەر سەرکەوتنمان بە دەست نەهێنایە دەبوایە بگەڕێینەوە بۆ بەریتانیا.

ستۆدیۆیەکمان بە کرێ گرت و بۆ ماوەی حەفتەیەك شانۆنامەی هووهووکانـمان تێدا تەمرین کرد. لەناو گرووپەکەماندا پیرەمێردێك هەبوو بەناوی«ویـمسیکلْ ڤۆکر» کە بەناوبانگترین قەشمەری«درۆری لین» بوو.

ئەو پیاوە کە تەمەنی زیاتر لە ٧٠ ساڵ دەبوو، دەنگێکی بەرزی هەبوو بەلآم وەك لە تەمرینەکاندا بۆمان دەرکەوت، شێوەی دەربڕینی هیچ باش نەبوو و هەژانی نـمایشەکەی بە کەسایەتیی نیشان دەدا نەك بە زمانی. هەرگیز نەیتوانی ئەم ڕستەیە بلێتەوە:«ڕابواردنیشیان وەکوو شێتەکان وایە». شەوی یەکەم لە جیاتی«شێتەکان» بە مینگە مینگ گوتی:«وەکوو سێتەکان». دواتر گوتی«شلتەکان» و لە ئاخریشدا هەر نەیتوانی ئەو ڕستەیە بە ڕێکوپێکی بلێتەوە.



کارنۆ لە ئامریکادا ناو و ناوبانگێکی زۆری هەبوو. کەواتە بەرنامەیەکمان هەبوو کە ئەستێرەیەکی پڕبەهای وەك کارنۆمان لەگەڵدا بوو و هەرچەند من حەزم لەو درامایە نەبوو بەلآم ئەوپەڕی هەوڵم دەدا کە زیاترین سوودی لێ وەربگرم. خواخوام بوو ئەم درامایە ئەوەی لێ دەرچێت کە کارنۆ دەیگوت:«ئەمە هەمان ئەو شتەیە کە ئامریکاییەکان دەیانەوێت».

نامەوێ باسی ئەو شڵەژان و حەپەسانەی یەکەم شەوی چوونە سەر شانۆم بکەم و بە تایبەت نیگەرانیم لەوەی کە ئەکتەرە ئامریکاییەکان لە ڕاڕەوی پشت شانۆکەوە تەماشایان دەکردین. لە بەریتانیادا بە یەکەم گاڵتەکردنم خەڵك دەهاتە پێکەنین و هەر ئەوەش وای لێ دەکردی بتوانیت مەزەندەی پێشوازیی خەڵك لە درێژەی نـمایشکەدا بکەیت. بەلآم لە ئامریکادا شانۆ وەکوو خێوەتگایەك وایە. من لە کاتێکدا پیاڵەیەك چاییم بە دەستەوە بوو لە ڕەشماڵێکەوە دەهاتـمە دەرەوە.

ئارچی( کە خۆم بووم):سلآو هوودسێن! تکایە دەکرێ بڕێك ئاوم بدەیتێ؟

هوودسێن:بەڵێ. ئاوت بۆ چییە؟

ئارچی:بۆ حەمامم دەوێ.

(پێکەنینێکی زۆر ئارام و پاشان بێدەنگ بوونی جەماوەرەکە).

هوودسێن:ئارچی...! شەو چۆن نووستی؟.

ئارچی:ئاه. . ! زۆر خراپ. خەوم بینی کرمێکی دار، سەری لە دوو ناوم.

***

دیسان هەمان بێدەنگییە سامناکەکە. ئێمە بە هەمان شێوە درێژەمان بە مینگەمینگەکەمان دا و دەمبینی کە دەموچاوی ئەو ئامریکاییانەی لە پشت ڕاڕەوەکەدا ڕاوەستابوون، درێژ دەبووەوە. بەلآم ئەوان ماوەیەکی زۆر بەر لە تەواوبوونی نـمایشەکە ون بووبوون و هۆڵەکەیان جێ هێشتبوو.

درامایەکی بێتام و ناخۆش بوو و من بە کارنۆم وتبوو کە بەم درامایە دەست پێ نەکات. ئێمە زۆر نـمایشی لەوە خۆشتر و شیرینترمان لە بەرنامەکەماندا هەبوو" بۆ نـموونە:«خلیسکێ»، «دزە دەندیەکان»، «لە ئیدارەی پۆستدا» و «ئاغای پرکینسی نوێنەر» کە بۆ ئامریکاییەکان پێکەنیناویی و سەرنـجڕاکێشتر بوو بەلآم کارنۆ کەللەشەق بوو و گوێی نەدامێ.

کەمترین شتێك کە دەتوانی بیڵێیت ئەوەیە کە سەرنەکەوتن لە هەندەراندا شتێکی دڵساردکەرە. نواندنی کۆمێدییەکی شادی ئینگلیزیی هەموو شەو و لەبەردەم جەماوەرێکی سارد و بێدەنگدا بە

راستی کارێکی سەخت و تاقەت پڕووکێنە. ڕێك وەك ئینسانە هەڵاتووەکان دەچووینە سەر شانۆ و لەوێشەوە دەهاتینە دەرەوە. ئێمە ئەو نەنگ و هیلاکییە شەش حەفتەییەمان تەحەمول کرد. ئەکتەرەکانی تر ئێمەیان لە قەرەنتینەدا دادەنا، وەك بڵێی نەخۆشیی تاعوونـمان هەبوو. کاتێك لە ڕاڕەوەکانی پشت شانۆدا کۆ دەبووینەوە تا شەکەت و شەرمەزار بچینە سەر شانۆ، ڕێك وەك ئەوە وابوو بۆ لە سێدارەدانـمان دەبەن.

هەرچەند خۆمم وەك کەسێکی تاك و تەنیا و نەناسراو دەبینییەوە، بەڵام شوکری خوام دەکرد کە تەنیام و لانیکەم ناچار نەبووم ئەو نەنگ و سووکایەتییە لەگەڵ ئەوانیتردا دابەش بکەم. ڕۆژان بە پیاسەکردن دەچووم بۆ هەندێ شوێنی دوور و شەقامگەلێکی بێ کۆتاییم دەبڕی کە پێدەچوو کۆتاییان نایەت. سەردانی باخی ئاژەڵان و باخە گشتییەکان و ئاکواریۆم و مۆزەخانەکانیشم دەکرد. لەو کاتەوە کە تووشی شکست بووبووم، نیویۆرکیش ترسناکتر و بیناکانیشی بەرزتر و مەیدانی ڕکەبەرایەتیش زۆر کوشندەتر دەهاتە بەرچاو. خانووە پڕ شکۆکانی شەقامی پێنجەم، خانوو نەبوون بەڵکوو بیناگەلێکی گەورەبوون کە نیشانەی مەزنی و سەرکەوتن بوون. پێدەچوو خانووە گەورە و ئاسوودەکان و دووکانە جوان و پڕ لە شتومەکەکان لەبەر ئەوە لەبەردەممدا قوت دەبوونەوە کە ئەوەم بهێننەوە یاد کە من لە ئاستیاندا چەند بچووك و نادیارم.

لەناو شاردا پیاسەی زۆرم کرد و زۆربەی جاران ڕێم دەکەوتە گۆڕەپانی «مادیزۆن» کە لەوێدا پیرەژنە پەککەوتەکان، بێدەنگ و هیوابڕاو، لەسەر کورسییەکان دانیشتبوون و چاویان دەبڕیە قاچی خۆیان. دەچوومە ناو شەقامی سێهەم و پاشان شەقامی دووهەم. لەو گەڕەکەدا هەژاری و دەسکورتی، بە هەموو تاڵی و ناخۆشییەوە هاواری دەکرد. هەژارییەك کە داوێنی ئاوەڵا کردبوو و حزووری خۆی لەناو پێکەنین و گریانەکاندا رادەگەیاند، هەژارییەك کە لە دەوروبەری ماڵاندا و لەسەر پلەکانەکاندا کەڵەکە دەبوو و پاشان لە کۆڵانەکاندا بەرەڵا دەبوو. هەموو ئەو دیـمەنانە زۆر دڵتەزێن بوون و وایان لێ دەکردم هەرچی زووتر بگەڕێـمەوە بۆ برادوەی.

ئامریکاییەکان بە گشتی خەڵکێکی گەشبینن و هەمیشە بیر لەوە دەکەنەوە بە هەر شێوەیەك بووە بەرەی خۆیان لە ئاوێ دەرکێشن و هەرگیزیش لە کار و تەقەلا ماندوو نەدەبوون. هەمیشە بیر لەوە دەکەنەوە کە «تیرێك بهاوێن» و بگەن بەو ئامانـجەی کە مەبەستیانە و پاشان قاچیان کۆ بکەنەو ئەو پارەیەی کە کۆیان کردۆتەوە هەڵگرن و بۆی دەربچن و ئنجا برۆن بە دوای پلان دانان بۆ فێڵ و



تەڵەکەیەکی تر. ئەو میتۆدە هەرچەند زۆر زێدەڕەوانە بوو، بەڵام وەردە وردە کاریگەریی لەسەر دانام و ورەی خستە گیانـمەوە. پارادۆکسێکی سەیر روویدا، ئەویش ئەوە بوو کە هەرچەند لەو نـمایشەدا شکستمان خوارد بەڵام هەستم بە بارسووکی و سەربەستی دەکرد. لە ئامریکادا هەزار ڕێگەچارە و دەرفەتی تر هەبوو . بۆچی دەبێ من هەر خۆم بە دراماوە گرێ بدەم؟ من خۆ نەزرم نەکردبوو ژیانم تەنیا بۆ هونەر تەرخان بکەم. ئەوەندەم بەس بوو ڕێگایەکی تر بدۆزمەوە. کەم کەم ئەو باوەڕبەخۆبوونەی کە لە دەستم دابوو، کەوتەوە ناو گیانـمەوە. بڕیارم دا هەرچۆنێك بێت و هەرچییەك رووی دا لە ئامریکادا بـمێنمەوە.

بۆ ئەوەی کە شکستی نـمایشەکەمان فەرامۆش بکەم، بڕیارم دا بیر و هۆشم پەروەردە بکەم و خوێندەواریم فرەتر بکەم. هەر بۆیە دەستم کرد بە هاتوچۆی کتێبخانەکان و کتێب فرۆشییەکان. چەندین کتێبی وانەی خوێندنگەم کڕی ، لەوانە کتێبی مانا و لێکدانەوەی «کلووك» و هەروەها کتێبێکی ڕێزمانی ئینگلیزیی و کتێبێکی فەرهەنگی  لاتین بە ئینگلیزیی و بڕیارم دا شێلگیرانە بیانـخوێنمەوە. بەڵام هەموو ئەو بڕیارە چاکانەم بوون بوونە تۆزی بانان. چەند ڕۆژێك چاوم لێکردن و پاشان هەموویم خستنە بنی چەمەدانێکەوە و فەرامۆشم کردن و ئیتر تا دووهەمین سەفەرم بۆ ئامریکا لام لێ نەکردنەوە.

هەرچەند نـمایشەکەمان سەرکەوتنی بەدەست نەهێنابوو بەڵام من بەش بە حاڵی خۆم سەرنـجی رەخنەگرانم راکێشابوو و هەندێ قسەی باشیان دەربارەی من کردبوو. «سایم سیلۆرمەن» کە خۆی ئەکتەر و رەخنەگری«واریتە»بوو دەربارەی من وتبووی:«لەناو ئەو گرووپەدا لانیکەم بریتانییەکی پێکەنیناویی هەبوو کە بۆ ئامریکا خراپ نەبوو».

لەوە بەدوا خۆمان ئامادەکردبوو بار و بنەمان تێك بنێین و تا شەش حەفتەی تر بگەڕێینەوە بۆ بەریتانیا، بەڵام لە حەفتەی سێهەمدا ئەوەمان بۆ هاتە پێشێ کە لە شانۆی شەقامی پێنجەمدا لەبەردەم کۆمەڵە خەڵکێك کە زیاتر لە ئۆتێلداران و خزمەتکارانی بەریتانیایی پێك هاتبوون، نـمایشێك ئەنـجام بدەین. بەوپەڕی سەرسووڕمانەوە ڕۆژی دووشەمە کە یەکەم ڕۆژی نـمایش بوو، سەکەوتنی باشمان بە دەست هێنا. هەر گاڵتەیەکم دەکرد خەڵکەکە دەیدا لە قاقای پێکەنین. هەموو ئەندامانی گرووپ، لەوانە خۆشم سەرمان سووڕمابوو" چونکە من چاوەڕێی ئەوەم دەکرد کە وەکوو

جاران بە سارد وسڕیی پێشوازیـمان لێ بکەن. لەبەر ئەوە کە زۆر ئاسایی نـمایشم دەکرد و ئەوەندە جیددیم نەگرتبوو، بێگومان زۆر باش بووم و نواندنەکەشم سەرنـجی خەڵکی راکێشابوو.

هەر لەو حەفتەدا نوێنەرێك هاتە لامان و بۆ ٢٥ حەفتە نواندن لە رۆژئاوای ئامریکادا لەگەڵ گەشتەکانی سۆلیڤان و «کەنسیداین»دا دایـمەزراندین. ئەم نـمایشانە لە تەماشاخانە بچووکەکاندا ئەنـجام دەدرا و دەبوایە رۆژێك سێ نـمایش بکەین.

هەرچی زیاتر بەرەو رۆژئاوا دەڕۆشتین زیاتر خۆشحاڵ دەبووم. تەماشاکردنی دیـمەنی قەتارەکانو ئەو سەوزەزارە بەرفراوانانەی کە چۆڵ بوون و هیچ دانیشتوویەکیان تیا نەبوو و هەرچەند خەمهێنەر و دڵتەنگکەر بوون بەڵام دڵی منیان پڕ لە هیوا دەکرد. شوێنی پان و بەرین بۆ کرانەوەی رۆح زۆر باشە و منیش هەستم دەکرد گیانم خەریکە هەوا هەڵدەمژێت. کۆمەڵە شارێکی وەك «کلۆلەند»، «سن لوویی»، «میناپۆلیس»، «سن پۆل»، «کانساس سیتی»، «دنۆر»، «بووت»، «بیلینگس» هەر لەو کاتەوە بەرەو گەورەبوون و فراوانبوون دەچوون و هەر ئەوەش کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر من هەبوو.

دواجار گەییشتینە کالیفۆڕنیا. بەهەشتێك بە هەتاوێکی رووناك و پڕ لە باخی نارنـج و پرتەقاڵو خورما کە بە درێژایی ١٥٠٠ کیلۆمتر لە قەراخی ئۆقیانووسی ئارامدا هەڵکەوتووە. سانفرانسیسکۆ، دەروازەی رۆژهەڵات، شارێك بوو کە لەوێ خواردن زۆر باش و نرخەکانیش هەرزان بوون. لەوێدا بوو کە بە خواردنی رانی بۆق بە شێوە لێنانی تایبەتی خۆیان و هەروەها نان شیرینی بە شلیك دروستکراو ئاشنا بووم و هەروەها چەند پارێزەری(مەحامی) بەناوبانگیشم ناسی. ئێمە ساڵی ١٩١٠ گەییشینە سانفرانسیسکۆ، ساڵێك کە بە هۆی زەوی لەرزەکەی ساڵی ١٩٠٦ەوە یان بە وتەی خۆیان «ئاگرکەوتنەوە»، تازە ئاوەدان کرابووەوە. دیارە هێشتا یەك دوو درز لە کۆڵانە ناهەموارەکاندا مابوونەوە بەڵام وێرانییەکان بە گشتیی سڕابوونەوە. هەموو شتێك پاك و خاوێن و تەڕ و تازە بوو، تەنانەت ئەو هۆتێلە بچووکەش کە ئێمە تیایدا نیشتەجێ بووین.

لە هۆڵی شانۆی «ئێمپرێس»دا کە هی«سیدگراوەمەن» و باوکی بوو، نـمایشمان کرد و هەردووکیشیان کەسانێکی زۆر خوێن شیرین و لەبەردڵان بوون. یەکەم جاربوو کە ناوی من بە بێ ناوی کارنۆ لە راگەیاندنەکاندا چاپ دەبوو و خەڵکیش تاسە و هەژانێکی زۆریان هەبوو! هەرچەند شانۆگەریی هووهووکان بێتام و ناخۆش بوو بەڵام هەموو جارێك هۆڵەکە پڕ دەبوو لە خەڵك و



تەماشاکەرانیش ئەوەندە پێ دەکەنین خەریك بوو دەبوورانەوە. گراوەمەن کە زۆر خۆشحاڵ بووبوو رۆژێکیان پێی وتم:«هەر کاتێك نەتویست لەگەڵ کارنۆدا کار بکەیت، وەرەوە بۆ ئێرە تا پێکەوە هەندێ نـمایش بـخەینە رێ». ئەو شەوق و تاسەیە بۆ من شتێکی تازە بوو. لە سانفرانسیسکۆدا هەست بە رۆحێکی پڕ لە گەشبینیی و هاریکاریی دەکرا.

بە پێچەوانەوە لۆس ئانـجلێس وەك شارێکی گەرم و خەفەکەر و ترسناك هاتە بەرچاوم و خەڵکەکانی رەنگی پێستیان جۆرە زەردییەك بوو کە گوزارشتی لە کەمـخوێنیی دەکرد. ئاو و هەواشی زۆر گەرم بوو و ئەو جوانیی و تەرش و تازەییەی سانفرانسیسکۆی نەبوو. سرووشت، باکووری کالیفۆڕنیای پڕ کردووەلە سەروەت و سامانێکی سروشتی  کە تا ئەو رۆژەی «هالیوود» لەناو چاڵە قیرە دیرێنەکانی شەقامی «ویلشایر»دا نوقم بێت و تیا بچێت، دەمێنێتەوە و هەروا گەشە دەکات.

ئێمە یەکەمین گەشتی خۆمان لە شاری «ساڵت لیك سیتی»، یان شاری «مۆرمۆنەکان»دا تەواو کرد و ئەوەش منی خستەوە یادی حەزرەتی مووسا کاتێك منداڵانی بەنی ئیسرائیلی رزگار کرد. ساڵت لیك سیتی، شارێکی گەورە و بەرفراوانە کە وەك تراویلکە لەناو گەرمای هەتاودا دەلەرێتەوە و چەندین شەقامی پان و بەرینی هەیە و تەنیا کەسێك دەتوانێت لێی تێ بگات کە بە دەشتە پان و بەرینەکاندا تێپەڕیبێت. شارەکە وەك خودی مۆرمۆنەکان حاڵەتێکی غروور و کیبری هەبوو و بە داخەوە خەڵکەکەشی ئاوها بوون.

پاش نـمایشکردنی هووهووکان لە گەشتی سۆلیڤان و کنسیداینیدا بەو مەبەستە کە یەکسەر بگەڕێینەوە بۆ بەریتانیا، گەڕاینەوە بۆ نیویۆرك“  بەڵام ئاغای مۆریس کە لەگەڵ تراستە گەورە شانۆییەکانی تردا کێبڕکێی دەکرد، پێشنیاری پێ کردین کە بۆ ماوەی شەش حەفتە بەرنامەکانـمان ببەین بۆ شانۆکەی ئەو کە لە شەقامی ٤٢ ی نیویۆرکدا هەڵکەوتبوو. لە بەرنامەی شەوی یەکەمدا درامایەکمان هەبوو بە ناوی:«شەوێك لە هۆڵە شانۆیەکی ئینگلیزییدا» کە سەرکەوتنێکی بێ وێنەی بە دەست هێنا.

شەوێکیان درەنگانێك لاوێك لەگەڵ یەکێك لە هاوڕێکانیدا لەگەڵ دوو کچدا قەراری یەکتر بینینیان دەبێت ﴿واتە ژوانیان دەبێت﴾. لەبەر ئەوەی کە کاتی زۆری بۆ وادەی دیاریکراو مابوو، ئەو دوو گەنـجە بۆ رابواردنی کات چوون بۆ تەماشاخانەی ویلیام مۆریس و نـمایشەکەی ئێمەیان بینی. یەکێك لەو دوو لاوە سەبارەت بە من گوتبووی:«ئەگەر هاتو رۆژێك بووم بە کەسێك﴿ی

گەورە﴾حەتـمەن وەها کەسێك بۆ نـمایشەکانی خۆم دادەمەزرێنم». ئەویش لەبەر ئەوە بوو کە دەوری ئەو مەستەی زۆر پێ خۆش بووبوو کە من لە درامای «شەوێك لە تەماشاخانەیەکی ئینگلیزیی»دا بینیبووم. ئەو لەو کاتەدا بۆ «د. و. گریف» لە کۆمپانیای «بیۆگراف»دا وەك ئەکتەری پلە دوو کاری دەکرد و رۆژانە پێنج دۆلاری وەردەگرت. ناوی«مەك سێنت»بوو کە دواتر کۆمپانیای فیلمی«کیستۆن»ی دامەزراند.

پاش ئەو شەش حەفتەیەی کە لە هۆڵەکەی ویلیام مۆریس لە نیویۆرکدا سەرکەوتنی باشمان بە دەست هێنا، لە لایەن سۆلیڤان و کنسیداینەوە بۆ گەشتێکی ٢٠ حەفتەیی دیکەش دامەزراین.

کاتێك دووهەمین گەشتمان خەریك بوو کۆتایی دەهات، خەم و خەفەت دایگرتم. دیسان سێ حەفتە لە سانفرانسیسکۆ و «سان دیەگۆ» و «سالت لیك سیتی»دا نـمایشمان هەبوو و لە دوای ئەوانەش دەبوو بگەڕێینەوە بۆ بەریتانیا.

ڕۆژێك بەر لە جێ هێشتنی سانفرانسیسکۆ پیاسەیەکم لە شەقامی«مارکێت»دا کرد. لە ناکاو لە پشت جامـخانەی دووکانێکی بچووکەوە کە پەردەیەکی پێوە هەڵواسرابوو، نووسینێکم بینی کە لە سەری نووسرابوو:«بە دۆلارێك لەپی دەستان دەخوێنینەوە و بە وەرەقی کۆنکان داهاتووتان پێشبینیی دەکەین». بە تۆزێك دوودڵییەوە چوومە ژوورەوە و رووبەڕووی بوونەوەرێکی بچووك و خرت و خۆڵ بوومە کە تەمەنی نزیکەی ٤٠ ساڵ دەبوو. لێم هاتە پێشەوە و دەمی هێشتا دەجوولا، چونکە کاتی نانی نیوەڕۆ بوو کە چووبوومە دووکانەکەیەوە. بەوپەڕی خەمساردییەوە و بە بێ ئەوەی قسەیەك بکات، مێزێکی بچووکی نیشان دام کە لە بەرانبەر دەرگای چوونە ژوورەوەکەدا و پاڵ بە دیوار دانرابوو بێ ئەوەش چاوم لێ بکات گوتی:«تکایە دانیشە! ». خۆشی لە بەرانبەرمدا دانیشت. جوولەکانی هەر زۆر توند و خێرا بوون. دیسان گوتی:« فەرموو ئەم وەرەقانە بڕ لێ بدە و ٣ جاریش کوویان بکە. پاشان دەست بـخە سەر مێزەکە بە شێوەیەك کە لەپی دەستت بەرەو لای من بێت». ئینجا دەستی هەڵگەڕاندمەوە و دوای ماوەیەك گوتی:سەفەرێکی دوور و درێژت لە پێشدایە، واتە دەتهەوێ ئامریکا بەجێ بێڵیت بەڵام بەم زوانە دەگەڕێیتەوە و چالاکییەکی تازە دەست پێ دەکەیت کە لەگەڵ ئەو چالاکییانەی ئێستاتدا برێك جیاوازیی هەیە...». لێرەدا خۆشی تووشی دوودڵیی هات و برێك شلەژاو هاتە بەرچاو. دیسان گوتی:«بەڵێ، هەمان کارە بەڵام برێك جیاوازە. من پێشکەوتنێکی زۆر لەو کارە تازەتدا بەدی دەکەم. رێگایەکی زۆر باش لەبەر دەمتدا ئاوەڵایە و کارێکی یەکجار باش چاوەڕێت



دەکات بەڵام ناتوانم بڵێم ئەو کارە چییە». بۆ یەکەم جار چاوی لێ کردم، پاشان دەستی گرتم ﴿و گوتی:﴾« لە چارەتدا ٣ جار هاوسەرگیریی دەبینم کە دووانیان سەرکەوتوو نین بەڵام سێهەمیان سەرکەوتووە و لەگەڵ سێهەم ژنتدا بە بەختەوەریی و کامەرانیی ژیان دەبەیتە سەر. لە چارەتدا ٣ منداڵیش هەیە»(دیارە لەمەیاندا هەڵەی کرد! ). دیسان لە دەستم ورد بووەوە و گوتی:«بەڵێ، تۆ سەروەت و سامانێکی زۆر پێکەوە دەنێیت و لە تەمەنی ٨٢ ساڵیدا بە هۆی نەخۆشیی سیلەوە دەمریت. تکایە یەك دۆلارەکە بدە. ئیتر پرسیارێکت نییە؟».

بە پێکەنینەوە وتم:

_ نەخێر. وابزانم هەر ئەوەندە بەس بێت.

لە سالت لیك سیتیدا رۆژنامەکان بێجگە لە هەواڵی دزیی چەکدارانە و بڕینی بانکەکان هیچ هەواڵێکی تریان تیا نەبوو. جەردە دەمامکدارەکان، مشتەریی کافتریا و کابارەکانیان لە بنی دیوارەکان ریز دەکرد و گیرفانیان خاڵیی دەکردن. لە شەوێکدا سێ پەلاماری لەو جۆرە رووی دابوو و جەردەکان ترسیان خستبووە دڵی هەموو دانیشتوانی شارەکەوە.

دوای ئەوەی لە نـمایش دەبووینەوە، زۆربەی جار دەچووین بۆ کافتریایەکی تەنیشت هۆڵەکانی و گلاسێك مەشرووبـمان دەخواردەوە و وای لێ دەهات هەندێ جار لەگەڵ مشتەرییەکاندا دەبووین بە دۆست و ناسیاو. شەوێکیان پیاوێکی زل و زەبەلاح و رووگەش کە دەموچاوێکی خرتی هەبوو، لەگەڵ دوو کەسی تر کە دیارە هاوڕێی بوون، هاتە ناوەوە. پیاوە قەڵەوەکە کە بە تەمەنتر لە دوانەکەی تر بوو، لە مێزەکەی ئێمە نزیك بووەوە و پرسی:

_ ئەوە ئێوەن کە کۆمێدیی ئینگلیزیی لە شانۆی ئەمپریسدا نـمایش دەکەن؟

ئێمەش دەم بە بزەوە وتـمان بەڵێ!

_ ها... وتم دەتانناسم! ئەی کوڕینە! وەرنە ئێرە!

بانگی دوو هاوڕێکەی کرد کە بێن بۆ لامان. لە دوای ئەوەی کە ئەو دوو کەسەی پێ ناساندین، داوەتی گلاسێك مەشرووبی کردین.

پیاوە قەڵەوەکە بەریتانی بوو، هەرچەند قسەکردنەکەی بە هیچ شێوەیەك لە ئینگلیزیی نەدەچوو ﴿و دیارە گۆڕابوو﴾. پیاوێکی ٥٠ بۆ ٦٠ ساڵە و دەم بە پێکەنین و قسەخۆش بوو کە دەموچاوێکی پان و گەش و چاوانێکی بچووك و وریشەداری هەبوو.

دوای ماوەیەك ئەو پیاوە زلە کە هاوڕێکانی بە «فەت» بانگیان دەکرد لە لای من مایەوە و هاوڕێکانیشی لەگەڵ ژمارەیەك لە ئەندامانی گرووپەکەی ئێمە چوون بۆ«بار». فەت خۆمانیانە دەستی کرد بە قسەکردن و گوتی:

_ من سێ ساڵ لەمەوبەر چوومەوە بۆ ئەوروپا، بەڵام ئەوروپا ئیتر ئەو ئەوروپایەی جاران نییە... مرۆڤ دەبێ لێرە بژیت. ٣٠ ساڵی رەبەق کەر بووم و لە کانزا مسەکانی«مۆنتانا»دا کارم کرد و توامەوە...پاشان بە خۆمم وت:ئەوە کارێکی دەبەنگانەیە من دەیکەم. ئێستا چەند منداڵم هەیە کارم بۆ دەکەن. (دەفتەرێك پارەی لە گیرفانی دەرهێنا و لەبەرچاوی مندا سووڕاندیەوە) پێکێکی تر بــخۆینەوە؟!

بە گاڵتەوە گوتم:

_ ئاگات لە خۆت بێت! لەوانەیە پەلامارت بدەن و رووتت بکەنەوە!

بە بزەیەکی زیرەکانەوە لێی روانیم و چاوێکی لێ داگرتم و گوتی:

_ کەس کاری بە منەوە نییە!

دوای ئەو چاوداگرتنە جۆرە ترسێك دایگرتم. ئەو چاوداگرتنە مانای زۆری لەخۆ دەگرت. هاوڕێکەم بەردەوام پێ دەکەنی و چاوی لێم هەڵنەدەگرت. پرسیاری کرد:

_ تۆ دەترسێی؟

هێواشێك گوتم ئەرێ! .

پاشان بە تۆزێك ئەدەبی زیاترەوە دەمی لە گوێم نزیك کردەوە و لە کاتێکدا کە ئاماژەی بە هاوڕێکانی دەکرد بە چرپەوە گوتی:

_ ئەو دووانە دەبینی؟ گرووپەکەی من بریتییە لەو جووتە خوێرییە. مێشکیان نییە بەڵام تا حەز بکەیت ئازا و بە جەرگن.

پەنــجەم خستە سەر لێوەکانم کە تێی بگەینم رەنگە قسەکانــمان ببیستن.

گوتی:

گوێی مەدەرێ هاوڕێ گیان! ئەمشەو بە کەشتی لێرە دەڕۆین...

دوای برێك بێدەنگی دیسان گوتی:



_ من و تۆ هەردووکمان بەریتانیایین، وانییە؟...هەردووکمان هاونیشتمانین. من چەندین جار تۆم لە شانۆی:«ئەمپایر ئەسلینگتۆن»دا بینیوە(ناوچاوی دابەیەکدا). ئەرێ دەزانیت ئەم کارەش کارێکی پڕ دەردیسەرە؟.

من دامە قاقای پێکەنین.

تا دەهات قسەکانی خۆشتر و خۆمانییتر دەبوو و وابزانم دەیویست منیش بـخاتە ریزی هاوڕێ نزیکەکانی خۆیەوە و حەزیش دەکات بزانێت لە کوێی نیویۆرکدا دەژیم. دیسان گوتی:

_ چەند وشەیەکت بۆ دەنووسم بۆ ئەوەی وەکوو یادگاریی لە لات بـمێنێتەوە و بیرم بکەیت.

بەختەوەرانە لەوە بەدوا هەرگیز ناویشم نەبیستەوە.

٩

## سەفەری دووهەم بۆ ولاَتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا

بیرکردنەوە لەوەی کە ولاَتە یەکگرتووەکان بە جێ دێلْم، ئەوەندە بێتاقەتی نەدەکردم، چونکە بڕیارم دابوو هەر بگەڕێمەوە بۆ ئەوێ، بەلاَم چۆن و کەی؟! نەمدەزانی. لەگەلْ ئەوەشدا خۆشحالْ بووم کە جارێکی تر لەندەنی خۆشەویست و ئاپارتمانە خۆشەکەی خۆم دەبینمەوە. لەو کاتەوە کە لە ئامریکادا گەڕابووم، ئاپارتمانەکەی لەندەن لە لام وەکوو مێحراب یان کەنێسەیەکی لێ هاتبوو کە خوا پاسەوانەکانی من، پارێزگارییان لێ دەکرد.

ماوەیەکی زۆر بوو هیچ هەوالێکم لە سیدنی نەبوو. لە دوا نامەیدا نووسیبووی کە باوەگەورەم لەناو ئەو ئاپارتمانەدا نیشتەجێ بووە. بەلاَم کاتێك گەییشتمەوە لەندەن و سیدنی لە وێستگەی شەمەندەفەردا هات بۆ پێشوازیم، پێی گوتم باوەگەورە مالْەکەی چۆلْ کردووە و ژنی هێناوە و لەگەلْ ژنەکەیدا لە شەقامی بریکستۆندا مالێکی مۆبلەی تری بەکرێ گرتووە. ئەم هەوالْە بۆ من زۆر ناخۆش بوو و تەواو تێکی دام چونکە ئەو مالْە جوان و دلْڕفێنەی کە هیوا و ئومێدی لە دلْمدا چاندبوو و منیش شانازیم پێوە دەکرد، ئیتر نەمابوو... و بێ خانوو مابوومەوە. بە ناچار لە شەقامی بریکستۆندا ژوورێکی بچووکم بە کرێ گرت. ئەو ژوورە ئەوەندە بچووك و بەدفەڕ بوو کە بڕیارم دا لە یەکەم هەلێکدا کە بۆم بڕەخسێت بگەڕێمەوە بۆ ئامریکا. هەر لە هەمان شەوی یەکەمدا لەوە تێگەییشم وەك چۆن مەکینەیەکی وردەپارەخۆر، هیچ هەستێکی بەرانبەر ئەو وردەپارەیە نییە کە تێی دەخەن، لەندەنیش بە هەمان شێوە هیچ هەستێکی بەرانبەر بە گەڕانەوەی من نییە.

سیدنی چونکە ژنی هێنابوو و شەوانەش کاری دەکرد، هەر نەمدەبینی“ بەلاَم یەکشەمانە پێکەوە دەچووین سەردانێکی "دایکم"مان دەکرد. ئەو ڕۆژەش ڕۆژێکی زۆر ناخۆش و دلْتەزێن بوو چونکە دایکمان هیچ وەزعی تەواو نەبوو. دایکی داماوم تازە پێی نابوو قۆناغێکی سەخت و دژواری شێتییەوە و دوابەدوای یەك گۆرانی دەوتەوە و بەرپرسانی شێتخانەی ناچار کردبوو لە خانەیەکی



تاکەکەسییدا رای بگرن. پەرستارەکەی ئەو خەبەرەی پێ داین. سیدنی چوە ژوورەوە و دایکمانی بینی، بەلاَم من جەرگی ئەوەم نەبوو و لە دەرەوە چاوەڕێم کرد. سیدنی زۆر خەمبار و بێتاقەت گەڕایەوە و پێی گوتم سەبارەت بە دایکم بە ئاوی سارد هەندێ تیماریان بۆ دەست پێکردووە و دەموچاوی شین هەلْگەڕاوە. ئەوەش وای لێکردین لەوێوە بیبەینە دەرەوە و بیگوێزینەوە بۆ شوێنێکی تایبەتیی حەوانەوە، چونکە لەو کاتەدا ئەوەمان لەدەست دەهات. کەواتە گواستمانەوە بۆ دامەزراوەیەك کە ئەکتەری بەناوبانگی بریتانی. خوالێخۆشبوو«دان لێنۆ»ش لەوێ بوو.

من رۆژ لە دوای رۆژ هەستم بەوە دەکرد کە لە ناوەوە رووخاوم و وەکوو دارێکم لێ هاتووە کە لە ریشە هەلْکەندرابێت. بێگومان ئەگەر ئەو ئاپارتمانە بچووکەی خۆمانم لە دەست نەدابایە، رەنگە وام لێ نەهاتبایە و جۆرێکی تر دەبووم. سەرەڕای هەموو ئەوانە ژیانی من بێجگە لە خەم و خەفەت زیاتر هیچی تر نەبوو. لە دوای ولاَتە یەگرتووەکانی ئامریکا، حەزم دەکرد لەگەلْ بەریتانیادا ئاشت ببمەوە. هاوینێکی خۆش و دلْخوازم لە بەریتانیادا رابوارد کە خۆشی و چێژێکی بێوێنەی هەبوو و لە هیچ کوێیەکی تری ئەم دنیایەدا نموونەیم نەدیبوو.

گرووپەکەمان پاش گەڕانەوەی لە ئامریکا، سەرلەنوێ دەستی بە کار کردەوە و ئێمە ١٤ مانگ لە شانۆ و کابارەکانی دەوروبەری لەندەندا نمایشمان کرد. خەلْك پێشوازییەکی گەرمی لەو درامایانە دەکرد کە نمایشمان دەکردن و بە راستیی حەزیان لە نواندنی ئێمە دەکرد، لەگەلْ ئەوەشدا دایم بیرم لەوە دەکردەوە داخۆ جارێکی تر دەچینەوە بۆ ئامریکا؟. من بەریتانیام دەپەرست، بەلاَم ژیان تیایدا بۆ من سەخت بووبوو و بە هۆی ئەو چارەنووسەی کە هاتبووە سەر رێی باوباپیرانم، هەمیشە ئەو هەستە ئازاردەرەم هەبوو کە رەنگە لە بەریتانیادا تووشی گەندەلْیو دارڕمانێکی کوشندە ببم. هەربۆیە کاتێك پێیان راگەیاندین کە بۆ گەشتێکی تازە بەرەو ئامریکا دامەزراوین، لە خۆشییان خەریك بوو بالْ بگرمەوە.

ڕۆژێکی یەکشەمە من و سیدنی چووین بۆ سەردانی دایکمان و دیار بوو حالْی گەلێك باشترە و بەر لەوەی سیدنی بۆ گەشتێکی شارەکان بەڕێ بکەوێت، پێکەوە شێوێکمان خوارد. لە دوایین شەوێکدا کە لە لەندەن بووم، حەزم کرد لە دەوروبەری «وێس ئەند»دا پیاسەیەك بکەم و بە خۆمم گوت:«ئەمە دواجارە کە ئەم کۆلاَنانە دەبینم».

***

ئەمـجارەیان بە پاپۆڕی ئۆڵەمپیك و لە بەشی پلەدوودا چووین بۆ نیویۆرك. لە تەپەتەپی مۆتۆری کەشتییەکەوە کە نزمتر دەبووەوە زانیم نزیك بووینەتەوە. لەو ساتەوە هەستم بەوە دەکرد لە ماڵی خۆمدام“ لە وڵاتە یەکگرتوەکانی ئامریکا:غەریبێك لەناو غەریباندا.

هەرچەند نیویۆرکم خۆش دەویست بەڵام بێ سەبرانە چاوەڕێم دەکرد بەرەو رۆژئاوا بڕۆین تا چاوم بە کەسانێك بکەوێت کە بە هاوڕێی راستەقینەی خۆمم دەزانین، بۆ نـموونە:«بارمەن» ئیرلەندییەکەی مەیـخانەی «بووت» لە مۆنتانا“ ئەو فرۆشیاری خانووبەرە«میناپۆلیسیی»یە کە ملیاردێر بوو و لەگەڵ ئەوەشدا پیاوێکی میهرەبان و رۆحسووك و بەشەرەف بوو“ ئەو کچە جوانە«سەن پۆلیی»یەی کە حەفتەیەکی زۆر خۆشم لەگەڵ رابواردبوو و ناوی«مەك ئێبی»بوو“ ئەو کانزادارە ئسکاتلەندییە لە ساڵت لیك سیتیدا“ ئەو دانسازەی«تاکوما» کە زۆر خوێن شیرین بوو و هەروەها برایانی«گراومان» لە سانفرانسیسکۆ.

پێش حەرەکەت کردن بەرەو کەنارەکانی ئۆقیانووسی ئارام دەستمان بە کارێك کرد کە پێمان دەوت گەشتی بچووك“ واتە لە کافتریا-کابارە بچووکەکانی گوندەکانی دەوروبەری شیگاگۆ و فیلاڎلفیا و شارە پیشەسازییەکانی تری وەك«فال ریۆ» و «دێلۆس» و ...دا نـمایشمان دەکرد.

من وەکوو جاران بە تەنیا دەژیام و ئەوەش تایبەتـمەندیی خۆی هەبوو“ چونکە ئەو وەزعە دەرفەتی ئەوەی دەدامێ فێرکاریی و راهێنانی خۆم تەواوتر بکەم. ئەوە بڕیارێك بوو کە چەند مانگ لەوە پێش دابووم و هەرگیز نەمـخستبووە بواری جێبەجێ کردنەوە.

لە نێوان ئەو کەسانەدا کە لە قووڵایی دڵەوە حەز دەکەن شتێك فێر بن، هەمیشە جۆرە برادەرییەکی راستەقینە دێتە ئاراوە و من یەکێك لەو کەسانە بووم. بەڵام من هەندێ مەبەستی تایبەتییم لە خۆڕاهێنان و فێرکردن هەبوو. من دەمویست شت فێر بم نەك لەبەر خاتری خودی زانستو مەعریفە، بەڵکوو بە مەبەستی داکۆکیکردن لە خۆم بوو لە بەرانبەر ئەو سووکایەتییەی کە دەرحەق گێل و گەمژە و نەخوێندەوارەکاندا دەیکەن. هەربۆیە هەر کاتێك دەرفەتم هەبوایە دەچووم لە گەڕەکی کتێب فرۆشەکاندا پیاسەم دەکرد.

ڕەنگە لە ماوەی گەشتی دووهەمماندا رەنگە ئەوەندە فێری زانست و زانیاریی کلاسیك نەبووم کە ئارەزووم دەکرد، بەڵام لە جیاتیدا تا حەز بکەی لەناو چینە پلەخوارەکانی کاری شانۆدا تووشی بێتاقەتیی و وەڕەزیی دەبووم.



گەشتەکانی ناو کافتریا-کابارە بچووك و پلەخوارەکان، ئینسانی هیلاك و خەمبار دەکرد و وای لێ دەکرم کە ئەو ئومێد و ئاواتانەی کە بۆ داهاتووی خۆم لە ئامریکادا چاوەڕوانم دەکرد، بە هۆی سێ چوار جار نـمایشکردن لە رۆژێکدا ئەویش لە هەموو رۆژانی حەفتەدا دەتوانەوە. کافتریا-کابارەکانی بەریتانیا لەچاو ئەوانەی ئامریکا وەك بەهەشت وابوون. هیچ نەبێ لە حەفتەیەکدا شەش رۆژ کارمان دەکرد ئەویش شەوێك دوو نـمایش. تەنیا دڵخۆشیمان لە ئامریکادا ئەوە بوو کە دەمانتوانی پارەی زیاتر پاشەکەوت بکەین.

پێنج مانگ دەبوو کە بەردەوام لە کوڵانگەلێکی بچووك و تەنگدا نـمایشمان دەکرد تا وای لێ هات تووشی بێزاریی بووم و کاتێك لە فیلاڎلفیادا حەفتەیەك پشوویان پێ داین، بەوپەڕی خۆشحاڵییەوە پێشوازییم لەو بێکارییە کرد. ئارەزووم دەکرد گۆڕانێك لە بارودۆخمدا بێتە ئاراوە و بکەومە کەش و هەوایەکی ترەوە. بۆ ئەو مەبەستەش دەبوایە خۆم ون بکەم و ببمە کەسێکی تر. ئیتر لە بەرنامە یەکڕەوتەکانی کافتریا-کابارەکان حاڵم تێك دەچوو و بڕیارم دابوو ئەو حەفتە بێکارییەم بەوپەڕی خۆشییەوە رابوێرم. پارەیەکی باشم پاشەکەوت کردبوو و بەو حاڵەتە بێزارییەی کە تووشی بووبووم، بڕیارم دا چەند رۆژێکیش وەکوو ئاغاکان بژیم. بۆچی وا نەژیم؟ ماوەیەکی زۆر بە قەناعەتەوە ژیابووم بۆ ئەوەی بتوانم پارەیەك پاشەکەوت بکەم و کاتێك گرێبەستەکەم دوای دەهات، دیسان دەچوومەوە سەر ژیانە بژی و مەمرەکەی خۆم“ کەواتە بۆچی ئێستا بڕێك لەو پارەیە خەرج نەکەم؟

چارەکێك «مەشرووبی دوشامبر»و چەمەدانێکی بچووکی جوانم بۆ خۆم کڕی کە کردیانە ٧٥ دۆلار. فرۆشیارەکە بە خاکەڕایی و میهرەبانییەکی زۆرەوە قسەی لەگەڵ کردم و پرسیاری کرد:«گەورەم! بۆتان بـخەمە پاکەتەوە؟». هەر ئەو چەند وشەیە بەس بوو بۆ ئەوەی کە لە خۆم بایی ببم و وابزانم کەسێکی زۆر گەورەم. من بڕیاری خۆم دابوو: دەمویست بڕۆم بۆ نیویۆرك تا چەند رۆژێك ئەو کافتریا-کابارە بچووکانە و ئەو ژیانە خەفەتهێنەرە فەرامۆش بکەم.

لە هۆتێلی«ئاستۆر»دا کە لەو سەردەمەدا یەکێك لە هۆتێلە بەناوبانگ و گەورەکانی نیویۆرك بوو، ژوورێکم بە کرێ گرت. جاکەتە جوانەکەم لەبەر کرد و شەپقەیەکیشم کردە سەر و گۆچان و چەمەدانە بچوکەکەشم گرتە دەستەوە. کاتێك فۆرمی تایبەت بە نیشتەجێ بوونم لە هۆتێلەکەدا پڕ دەکردەوە، شکۆ و گەورەیی و مەزنیی هۆتێلەکە و هەروەها باوەڕبەخۆبوونی ئەو کەسانەش کە لەوێدا هاتوچۆیان دەکرد، تەزوویان بە لەشمدا هێنا.

کرێی ژوورەکەم چوار دۆلار و نیو بوو لە رۆژێکدا. بە شەرمێکی تایبەتەوە پرسیارم کرد ئاخۆ پێویست دەکات پێشتر کرێکەم بدەم؟. خزمەتکارەکە بەوپەڕی ئەدەب و رێز و میهرەبانییەوە گوتی:

_ نەخێر، نا...گەورەم! پێویست ناکات کرێکە پێشتر بدەن.

کاتێك لەو بەرهەیوانە جوان و بریقەدارەدا تێدەپەڕیم، هەژانێکی وا دایگرتبووم هەرکە گەییشتمە ژوورەکەم حەزم دەکرد دانیشم و تێرتێر بگریم. کاتژمێرێکی تەواو تەماشای حەمام و بەلۆعە و بۆڕییەکانم کرد و بەلۆعەکانی ئاوی سارد و گەرمم تاقی دەکردەوە. بە راستی خۆشگوزەرانی چەند خۆش و هیوابەخشە! .

حەمامم کرد، قژم داهێنا و حەولە تازەکەم کردە بەر و دەمویست لە هەموو ئیمکاناتی ئەو خۆشگوزەرانییە کە ٤/٥ دۆلارەکە بۆی رەخساندبووم، کەلك وەربگرم.... خۆزگە شتێکیشم بۆ خوێندنەوە لەبەر دەستا هەبوایە" بۆ نموونە رۆژنامەیەك...بەڵام نەمدەوێرا تەلەفۆن بکەم و داوای رۆژنامەیەك بکەم! . بە ناچار لەسەر مۆبلێك لە ناوەڕاستی ژوورەکەدا پاڵم دایەوە و بە خۆشییەکی خەمبارانەوە چاوم بڕییە شتومەکەکان.

برێك دواتر جلەکانم لەبەر کرد و لە پلەکانەکانەوە هاتمە خوارەوە. پرسیارم لە خزمەتکارێك کرد کە شوێنی نانخواردن لە کوێیە؟. هێشتا بۆ نانخواردن زوو بوو و جگە لە یەك دوو مشتەریی، کەسی تر لە هوڵەکەدا نەبوو. بەڕێوەبەری هۆتێل تا بەردەم مێزێك کە لە نزیك پەنجەرەیەکدا بوو رێنمایی کردم و پرسیاری کرد:

_ بەڕێز حەز دەکەیت لێرە دانیشیت؟

بەو شێوەزارە ئینگلیزییە هەرە تۆخەی خۆمەوە وتم:

_ بەڵێ، هەر ئێرە باشە.

لە ناکاو چەند خزمەتکارێکی بەپەلە و خۆشخزمەت لە دەورم کۆ بوونەوە و ئاوی سارد و مێنۆی چێشت و نان و کەرەیان بۆ هێنام. وا هەژابووم هەستم بە برسیەتی نەدەکرد. بەڵام بەو حاڵەشەوە وام نیشان دا کە زۆرم برسییە و داوای سووپی گۆشت و مریشکی برژاو و ئایسکریمی ڤانیلیم کرد. بەرپرسی مەشرووبە ئەلکۆلییەکان مێنۆیەکی دوور و درێژی دایە دەستم و منیش پاش وردبوونەوەیەکی زۆر، داوای نیو بوتڵ شامپانیم کرد. ئەوەندە لەناو رۆڵی پیاوە دەوڵەمەندەکاندا نوقم بووبووم کە هەر نەمدەزانی کامە خواردن و شەراب چاکە و کامەیان خراپە. کاتێك نانەکەم خوارد،



دۆلارێك شاگردانەشم لەسەر مێزەکە دانا. دانی وەها پارەیەك لەو سەردەمەدا بە بەخششێکی گەورە لە قەڵەم دەدرا، بەڵام ئەو هەموو رێزەی کە لە کاتی چوونە دەرەوەمدا لێیان گرتم، ئەوەی دێنا ئەو پارەیە ببەخشم. خۆشم نازانم بۆچی گەڕامەوە بۆ ژوورەکەم و ١٠ خولەك لەوێدا مامەوە، پاشان دەموچاوم شت و هاتمە دەرەوە.

شەوێکی خۆشی هاوین بوو و ئەو هەوایەم زۆر پێ خۆش بوو. نەرمەنەرم بەرەو ئۆپێرای«مێترۆپۆلیتن» کە تیایدا شانۆگەریی«سەرێك و چەندین لەش»یان نمایش دەکرد کەوتمە رێ. تا ئەو کاتە هەرگیز ئۆپێرام نەدیبوو. تەنیا چەند پارچەیەکم لە تەماشاخانەکاندا بینیبوو و بە لامەوە پەسەند نەبوو. نازانم چۆن بوو ئەمجارەیان هەر لەخۆڕا حەزم کرد بچمە ژوورەوە. بلیتێکم کڕی و لە باڵکۆنی دووهەمدا دانیشتم. ئۆپێراکە بە زمانی ئاڵمانیی بوو و منیش لە تاقە وشەیەکی تێ نەدەگەییشتم، بە تایبەت لە چیرۆکی نمایشەکە هەر هیچم حاڵی نەبوو. بەڵام کاتێك زیارەتکەرەکان بەدەم گوتنەوەی ئاوازێکی غەمگینەوە تەرمی شاژنیان هێنایە سەر شانۆ، منیش دام لە پرمەی گریان . ئەو شانۆگەرییە ئەو هەستەی لە لا دروست کردم کە هەموو خەم و ئازارەکانی ژیانی منی تێدا کۆ بووەتەوە. زۆر بە زەحمەت توانیم خۆم رابگرم. نازانم ئەو کەسانەی کە لە دەوروبەرمدا دانیشتبوون دەربارەی من چۆن بیریان دەکردەوە، بەڵام کاتێك لەوێوە هاتمە دەرەوە، قاچەکانم تەزیبوون و زۆر وەڕەز بووم.

بۆ پیاسە کردن چووم بۆ تاریکترین و چۆڵترین کۆڵانەکانی شار، چونکە نەمدەتوانی ئەو هەموو زەرق و بەرقە سەرنجڕاکێشانەی شەقامی برادوەی تەحەمول بکەم و کاتێکیش دەمتوانی بگەڕێمەوە بۆ ژوورە بێتامەکەی هۆتێلیش کە تۆزێك هێور ببوومایەتەوە. کاتێك تۆزێك هاتمەوە سەرخۆ، بە مەبەستی ئەوە کە بڕۆم بنووم، یەکڕاست گەڕامەوە بۆ هۆتێل. هەم بە جەستە و هەم بە رۆحیش زۆر شەکەت و ماندوو بووم.

کاتێك دەچوومە ناو هۆتێلەوە، تووشی«ئارتۆرکلی»برای«هەتی» هاتم کە بەڕێوەبەری گرووپێك ئەکتەر بوو و هەتیش لە هەمان گرووپدا کاری دەکرد. لەبەر ئەوەی کە ئارتۆر برای هەتی بوو، هەمیشە هەوڵم دابوو پێوەندیی دۆستانەی لەگەڵدا پێك بێنم بەڵام لەمێژساڵ بوو نەمبینیبوو. هەرکە چاوی پێم کەوت گوتی:

_ ئاه، چارلی! بۆ کوێ دەچی؟

به ئاماژەی سەر و وەك بڵێی هەر نایناسیم و بەلامەوە گرینگ نییە، ئاسانسۆرەکەم پێ نیشان دا و گوتم:

__ دەچووم بنووم.

وەڵامەکەی من کاریگەرییەکی زۆری لەسەر ئارتۆر دانا.

ئەو لەگەڵ دوو کەس لە هاوڕێکانی بوو. پاش ئەوەی کە منی پێ ناساندن، پێشنیاری کرد پێکەوە بچین بۆ ئاپارتمانەکەی لە شەقامی مادیزۆندا و پیاڵەیەك قاوە بخۆینەوە و هەندێ قسە بکەین.

ئاپارتمانێکی خۆش و راحەت بوو و ئێمەش کۆزیلکەمان بەست و باسی گەلێ شتمان کرد. ئارتۆر زۆر ئاگای لەوە بوو کە بە هیچ شێوەیەك باسی رابردوومان نەکات. سەرەڕای ئەوەش کاتێك ویستم بگەڕێمەوە بۆ هۆتێلی «ئەستۆر»، ئەو حەزی دەکرد هەندێ شت دەربارەی ژیانی من بزانێت. من هەندێ وەڵامی لەتوپەتم دایەوە و هەر ئەوەم گوت کە بۆ دوو سێ رۆژ رابواردن هاتووم بۆ نیویۆرك.

ئارتۆر لەچاو ئەو کاتەی کە لە کەمبرۆلدا بوو، لە هەموو روویەکەوە وەزعی باشتر بووبوو و لەو کاتەشدا خاوەنکارێکی بەناوبانگ بوو و بۆ برای مێردەکەی خۆی واتە«فرانك. جی. گۆلد»ملیۆنێری ئامریکایی کاری دەکرد. حەزم نەدەکرد گوێ لە قسە ساکار و هیچ و پووچەکانی بگرم و خەمم پێ دەخوارد، بۆ نموونە کاتێك دەربارەی یەکێك لە هاوڕێکانی قسەی دەکرد، لە مابەینی قسەکانیدا دەیوت:«ئینسانێکی لەبەردڵان و رۆحسووك و بەڕێزە و سەر بە بنەماڵەیەکی گەورە و ناودارە». من لەناو دڵمدا پێکەنینم دەهات بەو گرنگییەی کە بۆ تەبار و رەچەڵەك قایل دەبوو و تازە بەو ئاکامە گەیشتم کە ئێدی من و ئارتۆر هیچ خاڵێکی هاوبەشی فکریمان نییە.

تەنیا یەك رۆژ لە نیویۆرکدا مامەوە. بەیانیی رۆژی دواتر بڕیارم دا بگەڕێمەوە بۆ فلادلفیا. هەرچەند، پێویستم بە رۆژێك گۆڕان هەبوو و ئەو یەك رۆژەش بۆی جێبەجێ کردم، بەڵام وەك ٢٤ کاتژمێر هەژان و تەنیایی وابوو. بیرم لە هاوڕێ و هاودەمێك دەکردەوە. بێ سەبرانە چاوەڕێی شانۆگەریی رۆژی دووشەمەی خۆمانم دەکرد چونکە بە دیداری هاوڕێکانیم شاد دەبوومەوە. هەرچەند بەو هەموو نارەحەتییەوە کە بە هۆی گەڕانەوە بۆ ژیانە ناخۆش و تاڵەکەی جارانەوە تووشی دەبووین، بەڵام ئەو تاقە رۆژەی کە بەوپەڕی خۆشگوزەرانییەوە رامبوارد، بۆ حەوت پشتم بەس بوو.



هەرکە گەڕامەوە فیلادلفیا چووم بۆ شانۆ. ئاغای ریۆز تەلگرافێکی بۆ هاتبوو و رێك لەو کاتەدا کە پاکەتەکەی دەکردەوە من لەوێ بووم. پێی گوتم:

__ لەم تەلگرافەدا ناوی کەسێکیان هێناوە نازانم مەبەستیان لە تۆیە یان نا؟.

ناوەڕۆکی تەلگرافەکە ئەمە بوو:«ئاخۆ لەناو گرووپەکەی ئێوەدا کەسێك بە ناوی«چافین»یان ناوێکی لەوجۆرە هەیە یان نا؟. ئەگەر هەیە پێی بڵێن پێوەندیی بکات بە«کسلێ ئەندباومەن»ەوە لە شەقامی ژمارە ٢٤، بینای «لانگ ئاکر»، شەقامی برادوەی.

لە گرووپەکەماندا کەسێك بە ناوی چافین نەبوو بەڵام هەر وەك ئاغای ریۆز بۆی چووبوو، رەنگە مەبەستیان چاپلین بووبێت. من زۆر خۆشحاڵ بووبووم چونکە بەدوایدا چووم و زانیم کە بینای لانگ ئاگر لە ناوەڕاستی شەقامی برادوەی دایە کە ناوەندی پارێزەرە هەرە گەورەکانی دادگای نیویۆرکە. هەروەها ئەوەشم هاتەوە یاد کە لە شوێنێکی ئامریکادا پوورێکی دەوڵەمەندم هەبوو و ئەوەم بە مێشکدا هات نەکات پوورم بە رەحمەتی خوا چووبێت و وەسێتی کردبێت و سەروەت و سامانەکەی بە من بەخشیبێت. کەواتە دەسبەجێ تەلگرافێکم بۆ کسلێ ئەندباومەن نارد و نووسیم لە گرووپەکەماندا کەسێك بەناوی چاپلین هەیە و لەوانەیە ئەو کەسە بێت کە مەبەستی ئێوەیە و بێ سەبرانە چاوەڕێی وەڵامم کرد. وەڵامیشی هەمان رۆژ هاتەوە. دەستم دەلەرزی و پاکەتەکەم کردەوە و دەقی نامەکەم خوێندەوە:«تکایە بە ئاغای چاپلین بڵێن هەرچی زووتر پێوەندیی بە نووسینگەکەمانەوە بگرێت! ».

لە کاتێکدا کە زۆر هەژابووم و لەبەر بێ تەحەمولیی هەڵدەلەرزیم، بە یەکەم شەمەندەفەری بەیانی، بەرەو نیویۆرك بەڕێ کەوتم. لە فیلادلفیاوە بۆ نیویۆرك ٢/٥ کاتژمێر رێگا بوو. نەمدەزانی باس باسی چییە. لە خەیاڵمدا خۆم لەناو نووسینگەی پارێزەرێکدا دەبینییەوە کە خەریك بوو دەقی وەسێتنامەیەکی بۆ دەخوێندمەوە.

کاتێك گەییشتمە شوێنی مەبەست، تۆزێك قەڵس بووم چونکە کسلێ ئەند باومەن، پارێزەری دادگای لێ نەبوون بەڵکوو دەرهێنەرانی فیلمی سینەمایی بوون. بەهەرحاڵ ئەوەش خۆی شتێکی خۆش و سەرنجڕاکێش بوو.

ئاغای«چارلزکسلێ»یەکێك لە خاوەنەکانی کۆمپانیای«کیستۆن کۆمێدیی فیلم» بۆی روون کردمەوە کە ئاغای مەك سێنات لە یەکێك لە هۆڵە شانۆییە ئامریکاییەکانی شەقامی ٢٤دا منی بینیوەو دەیەوێت لە جیاتی ئاغای«فۆرد ئسترلینگ»دام بمەزرێنێت. من زۆر جار بیرم لەوە

کردبووەوە کە لە سینەمادا کار بکەم و تەنانەت ئەو پێشنیارەشم بە بەرێوەبەرەکەمان ئاغای ریۆز دابوو کە ببینە شەریك (برابەش) و ئیمتیازی هەموو شانۆگەرییەکانی کارنۆ بکڕین و بیانکەین بە فیلمی سینەمایی. بەڵام ئاغای ریۆز دوودڵ بوو و دیارە ناحەقیشی نەبوو، چونکە ئێمە هیچمان لە فیلمسازیی نەدەزانی.

ئاغای کسڵ لێی پرسیم ئاخۆ تا ئێستا لە فیلمە کۆمێدییەکانی کیستۆن هیچت بینیوە؟ دیارە چەندین فیلمم لێ بینیبوون بەڵام پێم نەگوت کە لایەنی کۆمێدیی فیلمەکانیان زۆر کزە. هەرچەند لەو فیلماندا هەندێ جار کچێکی زۆر جوانی چاو قاوەیی بە ناوی«مابێل نۆرماند» دەردەکەوت کە بە راستی جوان و شۆخ و شەنگ بوو و لایەنی کزبوونی فیلمەکانی دەشاردەوە. من هیچ حەزم لەو فیلمانەی شێوازی کیستۆن نەبوو، بەڵام لەوە تێ گەیبیشتم کە وەکوو ئامرازێك بۆ ناساندن زۆر بەنرخن و ئەگەر یەك ساڵ لەو بوارەدا کار بکەم و بناسرێم، دەتوانم وەك ئەستێرەیەکی نێودەوڵەتیی بگەرێـمەوە بۆ دنیای شانۆ. جیا لەوەش چوونەناو دنیای سینەما بۆ من، وەك چوونەناو ژیانێکی نوێتر بوو لە بوارێکی نوێتردا. کسڵ پێی گوتم بە پێی گرێبەستێك کە لەگەڵم دەیبەستێت دەبێ حەفتەی لە سێ فیلمدا یاری بکەم و ١٥٠ دۆلار وەربگرم. ئەو بڕە پارەیە دوو ئەوەندەی ئەوە بوو کە لە گرووپی کارنۆدا وەرم دەگرت. بەڵام بەو حاڵەشەوە چەك و چەناکەم لێ دا و وتم کەمتر لە ٢٠٠ دۆلارم ناوێ. ئاغای کسڵ گوتی ئەم شتە پێوەندیی بە ئاغای «سێنات»وە هەیە” مەسەلەکەی لە کالیفۆرنیادا لەگەڵدا باس دەکات و دواتر ئاکامەکەیم پێ رادەگەینێت.

ماوەیەك بە نیگەرانییەوە چاوەڕێی وەڵامی ئاغای کسڵم کرد. نەکات بەرزەفڕیم کردبێت؟ دواجار نامەیەکم بۆ هات بەم ناوەڕۆکە کە ئامادەن گرێبەستێکم لەگەڵ ببەستن بۆ ماوەی ساڵێك “ سێ مانگی ئەوەڵ حەفتەی ١٥٠ دۆلار و نۆ مانگەکەی تر حەفتەی ١٥٥ دۆلار” و ئەو پارەیە پارەیەك بوو لە ژیانـمدا کەس پێی نەدابووم. دەبوایە دوای کۆتایی هاتنی گەشتەکەی سۆلیڤان و کنسیداین، دەسبەجێ کارەکەم دەست پێ بکەم.

کاتێك لە شانۆی ئەمپرێس لە لۆس ئانـجلێسدا نـمایشمان دەکرد، شوکر بۆ خوا سەرکەوتنی باشمان بە دەست هێنا. شانۆگەرییەکەمان کۆمێدییەك بوو بەناوی«شەوێك لە بار»دا. من دەوری پیرەمێردێکی مەستی شەق و شڕ دەبینی و بەو گریـمەی کە کردبووم، لە پیاوێکی ٥٠ ساڵە دەچووم. ئاغای سێنات پاش تەواوبوونی شانۆگەرییەکە هات بۆ ڕاڕەوەکانی پشتەوەی شانۆ بۆ ئەوەی



دەسخۆشیم لێ بکات. هەر لەو دیدارە کورتەدا ئاغای سێناتم وەك پیاوێکی بەهێز هاتە بەرچاو بە برۆگەلی چڕوپڕ و هیلالی و بەرجستە و دەمێکی زل و لێوی قەڵەو و چەناکەی بەهێز و ئەمانە هەمووی کاریگەرییەکی زۆریان لەسەر من دانا. بەڵام لەناو دڵیشمدا بیرم لەوە دەکردەوە کە تۆ بڵێی ئەم هاورێییەتییەمان تا سەر بـمێنێتەوە! . لەماوەی قسکردنەکانـماندا بە تەواوەتی بیرم لای ئەوە بوو کە داخۆ ﴿ئاغای سێنات﴾ لێم رازییە یان نا؟.

کاتی ماڵاوایی پرسیاری لێ کردم کە کەی پەیوەست دەبم بە گرووپەکەی ئەوەوە؟ لە وەڵامدا گوتم دەتوانم لە یەکەم حەفتەی مانگی سپتامبرەوە کە گرێبەستەکەم لەگەڵ کارنۆدا تەواو دەبێت کاری خۆم لەگەڵ ئێوەدا دەست پێ دەکەم.

## ١٠

## کامڵبوونی کەسایەتیی چارلی

بەوپەڕی نائارامی و بێقەراری و دڵەڕاوکێوە گەییشتمە لۆس ئانـجلێس و لە هۆتێلێکی بچووك لە شەقامی «گرەیت نۆرزەن»دا ژوورێکم بە کرێ گرت. شەوی یەکەم بۆ خۆشی و کات رابواردن بە ئەنقەست چووم بۆ بینینی شانۆگەریی دووهەمی ئەمپرێس کە پێشتر گرووپی کارنۆ لەوێ کاری کردبوو. رێنماییکەری ناو شانۆکە منی ناسییەوە و برێك دواتر هات بۆ لام و پێی گوتم ئاغای سێنات‌و خانـمی مابێل نۆرماند، دوو ریز لە دواوەی منەوە دانیشتوون و داوایان لێ کردووم ئەگەر بۆم دەکرێت بچم لای ئەوان دانیشم. منیش ئەوەم زۆر پێ خۆش بوو و پاش بە یەکتر ناساندنێکی کورت کە زۆر ئارام و بە چرپەوە ئەنـجام درا، هەموومان پێکەوە سەیری شانۆگەرییەکەمان کرد. کاتێك شانۆگەرییەکە تەواو بوو، هەندێك بە پیاسە رۆیشتین. پاشان بۆ خواردنی شێوێکی سادە و گڵاسێك مەشرووب چووینە ناو رێستورانێك. ئاغای سێنات سەری لەوە دەسووڕما کە من زۆر کەم تەمەن و منداڵ دەهاتـمە بەرچاوی و دەیگوت چاوەڕێم دەکرد لەوە بەتەمەنتر بیت. بە هۆی جۆری قسەکردنەکەیەوە هەستم بە جۆرە نیگەرانییەك کرد کە وەڕەزی دەکردم. ئەوەم هاتەوە بیر کە هەموو ئەکتەرەکانی گرووپەکەی سێنات کەسانێکی بەتەمەن بوون. بۆ نـموونە«فۆرد ئسترلینگ» تەمەنی لە ٤٠ زیاتر بوو. لە وەڵامدا وتم ئێوە هەر تەمەنێکتان گەرەك بێت، من بە هۆی گریـمەوە دەتوانم خۆم وا لێ بکەم. بە پێچەوانەی ئاغای سێنات، خانـمی مابێل نۆرماند خۆڕاگرتر بوو و ئەگەریش وای دابنێین رەخنەیەکی لەسەرم هەبووبێت، بەڵام هیچی نەدرکاند. ئاغای سێنات پێی گوتم کە تۆ بەم زوانە کارەکەت دەست پێ ناکەیت، بەڵام دەبێ سەردانێکی ستۆدیۆی «ئەدناڵ» بکەیت تا بە شوێنەکە ئاشنا بیت. کاتێك لە رێستورانەکە هاتینە دەرەوە، سواری ئۆتۆمبێلە سپۆرتەکەی ئاغای سێنات بووین و منیشی گەیاندەوە بەردەم هۆتێلەکەم.



بەیانیی رۆژی دواتر بە مەبەستی رۆشتن بۆ ئەدناڵ کە شارەدێیەکی دەوروبەری لۆس ئانـجلێس بوو، سواری شەمەندەفەر بووم. شوێنێکی سەیر و سەمەرە بوو و خۆشی نەیدەزانی ئاخۆ دەبێتە گەڕەکێکی بچووك یان شوێنێکی پێشەسازی. ئەوێ هەم کارگەی مشاری گەورەی تێدا بوو، هەم ئەمباری ئاسن و تەنەکە و هەمیش چەند کێڵگەیەکی بچووکی بەڕواڵەت چۆڵ و هۆڵی تێدا بوو کە یەك دوو دووکانی بچووکی لە تەختە دروستکراویشی تێدا بوو. پاش پرسیارکردن لە چەندین رێبوار، دواجار گەییشتمە لای ستۆدیۆکەی کیستۆن. بینایەکی کۆن و شەق و شڕ بوو کە بە میلەیەکی سەوز دەوری گیرابوو و رووبەریشی لە ١٠٠ متری چوارگۆشە تێنەدەپەڕی. رێگای چوونەناوەوەشی لەناو شەقامێکی پڕ لە دار و درەختدا بوو و بەناو بینایەکی کۆندا تێدەپەڕی کە بە شێوازی هیندیی کرابووەوە و ئەمانە هەموویان وەك خودی ئەدناڵ سەیر و سەمەرە بوون. لەوبەری جادەکەوە ﴿ڕاوەستابووم و﴾ دڕدۆنگ بووم ئاخۆ بچمە ژوورەوە یان نا! .

کاتی نانی نیوەڕۆ بوو و منیش ژن و پیاوە ئەکتەرەکانم دەبینی کە هێشتا مکیاژیان بە دەموچاوەوە بوو و لە بینا یەك نهۆمە هیندییەکەوە دەهاتنە دەرێ و هەندێکیان پۆلیسە شەخسییەکانی کیستۆن بوون. هەموویان لە جادەکە دەپەڕینەوە بۆ ئەوەی بچنە ناو چێشخانەیەکەوە و لەوێشەوە ساندویچ، یان «هات داگ» لەدەست، دەهاتنە دەرەوە. هەمووشیان قرم و قاڵیان دەهات و بە دەنگی بەرز یەکتریان بانگ دەکرد. بۆ نـموونە دەیانوت: «هەی هانك! ...دەی وەرە خێرا کە! . یان «دەی بە ئسلیم بڵێ پەلە بکات! ».

کتوپڕ لە کاتێکدا کە ترس دایگرتبووم، خێرا دوور کەوتـمەوە و لە سووچێکی شەقامەکەدا وەستام تا بزانم ئاخۆ ئاغای سێنات یان خانـمی مابێل نۆرماند لەو بینا یەك نهۆمە هیندییەوە دێنە دەرێ یان نا. بەڵام دیار نەبوون. نیو کاتژمێر لەوێ بووم و پاشان بڕیارم دا بگەڕێـمەوە بۆ هۆتێل.

بیرکردنەوە لەوە کە بچمە ناو ستۆدیۆ و بەرەوڕووی ئەو هەموو مرۆڤە ببمەوە، بۆم تەحەمول نەدەکرا. دوو رۆژ دوابەدوای یەك تا بەردەم ستۆدیۆکە دەچووم بەڵام نەمدەوێرا بچمە ژوورەوە. رۆژی سێهەم ئاغای سێنات تەلەفۆنی کرد و پرسیی بۆچی نەچوومەتە ستۆدیۆ. منیش هەندێ بیانووی هیچ‌و پووچم هێنایەوە، بەڵام ئەو گوتی:

_ خێرا کە، هەر ئێستا وەرە. چاوەڕێتم! .

ئەمــجارەیان بە جورئەت و بوێرییەکی تەواوەوە چوومە ناو بینا یەك نهۆمە هیندییەکەوە و سۆراغی ئاغای سێناتم گرت.

ئەو بە بینینی من خۆشحاڵیی خۆی دەربڕی و بردمیە ناو ستۆدیۆکە. بە راستی سەرنــجی راکێشام. رووناکییەکی ئارام و نەرم، سەرجەم لۆکەیشنی وێنەگرتنەکەی داگرتبوو. ئەو رووناکییە لە چەند قایشێکی پانی سپییەوە بوو کە تیشکی هەتاویان پەرچ دەدایەوە و جۆرە فەنتازیایەکیان بە هەموو شتێك دەبەخشی و ئەوەش بۆ فۆتۆگرتن لە ژێر تیشکی هەتاودا شتێکی پێویست بوو.

کاتێك منیان بە چەند ئەکتەرێك ناساند، کەم کەم وام هەست دەکرد شتەکان بەلامەوە خۆشن. سێ لۆکەیشن لە تەنیشت یەکدا بوون و سێ گرووپیش لە یەك کاتدا لەناو ئەو سێ لۆکەیشنەدا کاریان دەکرد. شوێنەکە زیاتر لە پیشانگایەکی نێودەوڵەتیی دەچوو. لە شوێنێکدا مابێل نۆرماند سەرقاڵ بوو. دەرگایەکی لێ دەدا و هاواری دەکرد:«دەرگاکە بکەرەوە! » و پاشان کامێراکە دەوەستا. تا ئەو کاتە نەمدەزانی فیلمەکان پارچەپارچە دروست دەکەن.

لە لۆکەیشنی تردا فۆرد ئسترلینگی گەورە بوو کە دەبوو من شوێنەکەی بگرمەوە. ئاغای سێنات منی پێ ناساند. فۆرد، کیستۆنی بەجێ دەهێشت تا بۆ خۆی کۆمپانیایەکی وێنەگرتن لە «ئۆنیوێرساڵ»دا دابــمەزرێنێت. ئینسانێکی زۆر لەبەردڵان و خۆشەویست بوو و هەموو لە ستۆدیۆدا خۆشیان دەویست. هەموان لە دەوری ئەو سێکانسەی کە ئەو دەوری دەبینی، کۆ دەبوونەوە و لە ناخی دڵەوە پێ دەکەنین.

سێنات منی بردە پەنایەکەوە تا شێوازی کارکردنی ئەوم بۆ روون بکاتەوە.

ـ ئێمە سیناریۆمان نییە. لە بیرۆکەیەکەوە دەست پێ دەکەین و رەوتی لۆژیکیی رووداوەکان دەگرینەبەر تا بگەین بە بابەتێك کە بنەمای کۆمێدییەکەمان پێك دێنێت.

ئەوە رەوتێکی باش بوو، بەڵام من بەش بەحاڵی خۆم حەزم لەو جۆرە بابەت دۆزینەوانە نەبوو. ئەم کارە کەسایەتیی ئەکتەر تێك دەشکێنێت. راستە من شتێکی زۆرم دەربارەی سینەما نەدەزانی، بەڵام ئەوەم دەزانی هیچ شتێك جێی کەسایەتی ناگرێتەوە.

ئەو رۆژە من لە لۆکەشنێکەوە دەچووم بۆ لۆکەیشنێکی دیکە و تەماشای کارکردنی گرووپە جۆراوجۆرەکانم دەکرد. پێدەچوو هەموویان لاسایی فۆرد ئسترلینگ دەکەنەوە. ئەوە منی قەڵس دەکرد چونکە من حەزم لە شێوازی ئەو نەبوو و لەگەڵ مندا نەدەهاتەوە. ئەو دەوری هۆڵەندییەکی شەکەت و



ماندووی دەبینی کە هەندێ قسەی خۆش و پێکەنیناویی هۆڵەندیشی تێکەڵی قسەکانی دەکرد، بەڵام هیچ قازانــجێکی بۆ سینەمای بێدەنگ نەبوو. بیرم لەوە دەکردەوە کە داخۆ ئاغای سێنات چ چاوڕوانییەکی لە من هەیە. ئەو منی لەسەر شانۆ بینیبوو و دەبوایە ئەوە بزانێت کە من بۆ ئەو جۆرە کۆمێدییە دروست نەکراوم کە فۆرد پێشکەشی دەکرد. شێوازی من تەواو پێچەوانەی شێوازی فۆرد بوو. بەڵام هەرچۆنێك بێت هەر رووداوێك کە دەهاتە پێشێ و هەر بڕیارێك کە لە ستۆدیۆدا دەرا، بە ئەنقەست بێت یاخود نا، کاریگەریی ئسترلینگی لەسەر بوو. تەنانەت دەتوانم بڵێم کە «ڕۆسکۆ ئارباکل»یش لاسایی ئسترلینگی دەکردەوە.

بە روونی دیار بوو ئەو ستۆدیۆیە رۆژێك لە رۆژان کێڵگە بووە. ژوورە بچکۆلانەکەی مابێل نۆرماند لەناو خانوویەکی کۆندا بوو کە ئەکتەرەکان لەوێ خۆیان حازر دەکرد. بەرانبەرەکەشی شوێنێك بوو کە دیار بوو رۆژێك لە رۆژان ئەمبارێکی رووخاو بووە وکرابووە جلخانەی ئەکتەرە پلە دووەکان و هەروەها پاسەوانەکانی کۆمپانیای کیستۆن، کە زۆربەشیان قەشمەری دێرینی سێرك و بۆکسێر بوون. ئەو ژوورەش کە بە منیان دا، سەردەمێك هی ژنە ئەکتەرە پلە یەکەکان بووە. لەوێدا بینایەکی تریش هەبوو کە لە ئەمبار دەچوو و رەنگە زین و کورتان(کۆپان) و...ی ئەسپەکانی سێرکیان تیا دادەنا. کەش و هەوایەکی سەیر ستۆدیۆکەی داگرتبوو. بە واتایەکی تر، لەوێدا هەمیشە پەریزادەیەك هاوڕێی دێوێك بوو.

ڕۆژانێکی زۆر لە ستۆدیۆدا وێڵ و سەرگەردان دەسووڕامەوە و بیرم لەوە دەکردەوە کە کەی کارەکەی خۆم دەست پێ دەکەم؟. هەندێ جار سێناتم دەبینی کە بە لۆکەیشنی نواندندا تێپەڕ دەبوو و پێك دەگەییشتین، بەڵام ئەو بە بێ هیچ ئاوردانەوەیەك تێدەپەڕی. دیارە بیری لای کارەکەی بوو و سەرقاڵیش بوو و لەوە دەچوو هەر منی نەدیبێت. هێدی هێدی ئەم هەستەم لەلا دروست بوو کە رەنگە ئەو چەتیوە لە دامەزراندنی من پەشیمان بووبێتەوە و رەنگە وا بیر بکاتەوە کە تووشی هەڵە بووە و هەر ئەم بیرۆکەیەش زیاتر قەڵس و تووڕەی دەکردم.

ئارامیی رۆحییم بەند بوو بە ئاغای سێناتەوە. بۆ نــموونە ئەگەر بە هەڵکەوت تووشی بوومایەو بزەیەکی بە روومدا بکردایە، دڵخۆشتر دەبووم. پێدەچوو ئەندامانی تری کۆمپانیا، بیروڕای جۆراوجۆریان لەسەر من هەبوو. هەندێك دەیانوت:«دەبێ لە کاتی نواندندا ببینین بزانین چەندە پیاوە!

! ». هەندێکیشان هەر لە دەموچاویانەوە دەمزانی بە هەندیان وەرنەدەگرتم و پێیان وابوو جێگرێکی باش نیم بۆ ئاغای فۆرد ئسترلینگ.

ڕۆژی شەمە سێنات زۆر میهرەبانتر لە جاران هاتە بەرچاو و پێی گوتم: برۆ چەکی حەقدەستەکەت لە نووسینگەدا وەربگرە.

منیش پێم گوت حەز دەکەم هەرچی زووترە کارەکەم دەست پێ بکەم و هەروەها ویستم ئەوەشی پێ بڵێم کە بیروڕام سەبارەت بە لاسایی کردنەوەی فۆرد ئسترلینگ چییە، بەڵام ئەو خێرا دەستێکی هێنا بە سەرمدا و گوتی:

_ خەمت نەبێ، ڕۆژێك دادەنیشین قسە لەسەر ئەو شتانەش دەکەین.

٩ ڕۆژم بە بێکاری دایە سەر و ئەو وەزعە تەواو بێتاقەتی کردبووم. ئاغای فۆردیش بەش بەحاڵی خۆی هەوڵی دەدا دڵدانەوەم بدات و هەندێ جاریش بە ئۆتۆمبێلەکەی خۆی دەیگەیاندمە شار و هەردووکمان لە باڕی «ئەلکساندر»دا لامان دەدا تا پێکێك بـخۆینەوە و ئەویش لەوێدا بە دیداری هاوڕێکانی شاد دەبووەوە. یەکێك لە هاوڕێکانی بە ناوی «ئەلـمەرئەلسورس» کە هەر لە یەکەم نیگادا بە کەسێکی گێژ و نەفام و لەخۆبایی هاتە بەرچاوم، بە زمانێکی تەوساویی(گاڵتەئاسا)وە گوتی:

_ وا دیارە تۆ گەرەکتە جێی فۆرد بگریتەوە! . گوایە پێت وایە ئەوەندە پێکەنیناوییت﴿کە بتوانیت؟﴾.

زۆر قەڵس بووم و گوتم:

_ لەبەر ئەوەی کەسێکی خاکەڕام ناتوانم وەڵامت بدەمەوە.

_ ئەو جۆرە گاڵتەجاڕییە ئەویش لەبەردەم خودی فۆرددا شتێکی ناخۆش بوو، بەڵام ئەویش چاك گەییە فریام و گوتی:

_ تۆ نواندنی ئەوت لە شانۆی ئەمپرێسدا نەدیوە کە چۆن دەوری مەستێك دەگێڕێت؟ بە ڕاستی پێکەنیناوی بوو! .

هەر ئەو قسەشی لەو نیگەرانییە ڕزگاری کردم.

ئەلسورس گوتی:

_ باشە ئەوا من ئامادەم بزانم دەمهێنێتە پێکەنین یان نا! .



ئەلسورس پیاوێکی زل و زەبەلاحی ناشیرین و خوار و قێچ بوو کە پێدەچوو بەدەست چەندین نەخۆشیی (غودەیی)یەوە دەیناڵاند. ڕوخسارێکی مۆن و خەمباری هەبوو، هەروەها کۆسە بوو و چاوەکانیشی خەمگین بوون و دەمێکی شل و وڵ و زەردەخەنەیەکیشی هەبوو کە نیشانی دەدا دوو ددانی پێشەوەی نییە. فۆرد چرپاندی بە گوێـمدا کە ئەم ئاغایە لە بواری ئەدەبیات و ئابووریی و ژمێریاریی و سیاسەتدا زۆر شارەزایە و لەو کەسانەیە کە زانیاریی زۆری لەسەر بارودۆخی وڵات هەیە و لەگەڵ ئەوەشدا یەکجار زۆر حەزی لە گاڵتە و گەپ و پێکەنینە. بەڵام بێگومان من بە هەندی وەربگرم و هەربۆیە هەوڵم دەدا خۆمی لێ بەدوور بگرم. شەوێکیش لە باڕی ئەلکساندردا گوتی:

ئێ... ! ئەم بەڕێزە بەریتانیاییە هێشتا دەستی پێ نەکردووە! ؟.

بزەیەکی ناچارییم کرد و گوتم:

_ هێشتا نا! .

_ باشە کەواتە هەوڵ بدە بڕێك پێکەنیناوی بیت!

چونکە قسە و قسەڵۆکی زۆرم لەو پیاوە بیستبوو، بڕیارم دا منیش وەك ئەو، خۆم بڕێك هەرچیو پەرچی پیشان بدەم و تۆڵەی لێ بکەمەوە. گوتم:

_ من ئەگەر بتوانم تەنیا هێندەی نیوەی تۆ پێکەنیناویی بم، بەرگەی کۆکردنەوەی پارە ناگرم.

گوتی:

ئەی چەتیو. . ! چەنەبازیشی! قەیناکات ئەو وەڵامە ئەوە دەهێنێ بۆ گلاسێك مەشرووب فەرمووت بکەم.

دواجار نۆرەی منیش هات. سێنات و مابێل نۆرماند بەردەوام لە دەرەوەی ستۆدیۆدا بوون و گرووپی فۆرد ئسترلینگیش بە گشتیی وەزعێکی وەهایان هەبوو، بە شێوەیەك کە کەس لەناو ستۆدیۆدا نەدەمایەوە. قەرار بوو ئاغای«هێنری لۆرمەن» کە لەدوای سێنات، دیکۆراتۆری سەرەکیی کۆمپانیای کیستۆن بوو، فیلمێکی تازە دەربهێنێت کە من تیایدا دەوری هەواڵنێرێك بگێڕم. ئاغای لۆرمەن ئینسانێکی لەخۆبایی و کەللەڕەق بوو و زۆر شانازیی بە خۆیەوە دەکرد لەبەر ئەوەی کە توانیبووی چەند درامایەکی پێکەنیناویی بووکەشووشەیی بباتە سەر شانۆ. ئەو باوەڕی وابوو کە بۆ پێکەنیناویی کردنی دراما، پێویستییەکی ئەوتۆی بە ئەکتەر نییە و بە هۆی تەکنیکی مۆنتاژ و مکانیکیی کردنی دەورەکانەوە دەتوانێت پێکەنین بـخولقێنێت.

هیچ سیناریۆیەك لە ئارادا نەبوو. تەنیا پێویستی بە بابەتێکی دۆکیۆمێنتیی هەبوو دەربارەی چاپ و بڕێکیش تام و چێژی کۆمێدی پێ بدرێت. من جلێکی شۆڕ و درێژی سووکم لەبەر کردبوو و کڵاوێکی بەرزیشم لەسەر دانابوو و سمێڵێکیشم بۆ خۆم چێ کردبوو کە لە سوکانی دووچەرخە دەچوو. هەر لە سەرەتاوە زانیم کە ئاغای لۆرمەن بەدوای بیرۆکەدا دەگەڕێت. منیش کە تازەچووبوومە ناو کۆمپانیای کیستۆنەوە، تەنیا دەمویست خۆم دەربـخەم" هەر لەبەر ئەوەش بوو کە هەستی ئێرەیی بردنی ئاغای لۆرمەنم وروژاند. لە سێکانسێکدا کە لەگەڵ سەرنووسەری رۆژنامەیەکدا قسەم دەکرد، هەرچی جووڵەی خێرا و پێکەنیناوییم بە مێشکدا هات ئەنـجامم دا و تەنانەت بەوانی تریشم دەوت کە چی بکەن و چی نەکەن. هەرچەند وێنەگرتنەکە سێ رۆژ زیاتری نەخایاند، بەڵام کە بیرم لێ دەکردەوە، جووڵەی پێکەنیناوی و سەرنـجڕاکێشی زۆرمان لەناو فیلمەکەدا ئەنـجام دابوو. بەڵام کاتێك دوایی هات و فیلمەکەم بینی، دڵم تەواو داگیرا، چونکە مۆنتێری فیلمەکە ئەوەندە دەست و قاچی فیلمەکەی بڕیبوو، بە راستی لەو فیلمە نەدەچوو کە ئێمە دروستمان کردبوو و ئەو چەتیوە هەندێ لەو شوێنانەی کە بە راستی شیرینکاریم کردبوو، قرتاندبوو. زۆر سەرم دەسووڕما و گێژ بووبووم کە ئاخۆ بۆچی ئەو کارەیان کردووە. هێنری ساڵانێك دواتر دانی بەوەدا نا کە بە ئەنقەست ئەو کارەی کردبوو چونکە بە وتەی خۆی، من زۆری لێ دەزانم و لەوانەیە رۆژێك رسقی ئەو ببڕم.

بەیانیی ئەو رۆژە کە ئیتر کاری من لەگەڵ لۆرمەندا تەواو بووبوو، سێناتیش هاتەوە. فۆرد ئسترلینگ لە سێکانسێکدا بوو و «ئارباکێل»یش لە سێکانسێکی تردا. ستۆدیۆ لە لایەن هەر سێ گرووپەکەوە داگیر کرابوو. من جلێکی ئاساییم لەبەردا بوو و چونکە هیچ کارێکم نەبوو، لە سووچێکدا راوەستابووم کە سێنات بـمبینێت. ئەو لەگەڵ مابێلدا سەرگەرمی تەماشای سێکانسێك بوو کە بەرهەیوانی هۆتێلێکی نیشان دەدا و جگەرەیەکی گەڵاشی لە دەمدا بوو.

لەناکاودا رووی لە من کرد و گوتی:

_ لێرەدا پێویستمان بە جووڵەیەکی پێکەنیناوی هەیە. تۆ بڕۆ گریـمێکی گاڵتەجاڕیی بکە و وەرەوە بۆ ئێرە. خۆمان و بەختی خۆمان.

من هیچم لە گریم کردن نەدەزانی. حەزم لە جلە هەواڵنێرییەکەی خۆم نەبوو. کە بەرەو جلخانە دەچووم، بیرم لەوە کردەوە کە پانتۆڵێکی پان و پۆڕ لەبەر بکەم و پێڵاوی گەورە لە پێ بکەم و شەپقەیەکیش بکەمە سەر و گۆچانێکیش بە دەستەوە بگرم. دەمویست هەمووی ئەمانە بە هیچ



شێوەیەك لەگەڵ یەکدیدا نەیەنەوە:واتە پانتۆڵی زۆر پان و پۆڕ و جلی زۆر تەنگ، کڵاوی زۆر بچووك و کەوشی یەکجار گەورە. ئەوەم نەدەزانی کە ئاخۆ خۆم وەك کەسێکی پیر نیشان بدەم یان کەسێکی گەنج! بەڵام کە هاتەوە بیرم یەکەمـجار «سێنات» منی بە کەسێکی بەتەمەنتر وێنا کردبوو، سمێڵێکیشم بۆ خۆم دانا کە بێ ئەوەی حاڵەتی دەموچاوم بگۆڕێت، چەند ساڵێك بەتەمەنتر نیشانی دەدام.

هیچ ئاگام لەو کەسایەتییە نەبوو کە قەرار بوو دەورەکەی ببینم، بەڵام لەو کاتەوە کە ئەو جلانەم لەبەر کرد و بەو گریـمەی کە کردم، جۆرە کەسایەتییەکم لەناو خۆمدا هەست پێ کرد. کەم کەم خەریك بوو رۆڵەکەی خۆمم دەدۆزییەوە و کاتێك چوومە سەر شانۆ، رۆڵەکە بە تەواوەتی خولقێندرابوو. کاتێك هاتـمە بەردەمی سێنات، لە قارەمانێك دەچووم کە خەریکی بینینی دەورەکەی بێت. هەنگاوی پتەوم هەڵدەگرت و بە گۆچانەکەم هەندێ جووڵەی پێکەنیناویم دەکرد. هەندێك شیرینکاریی و جووڵەی سەرنـجڕاکێش لە مێشکمدا کەڵەکە بووبوون.

نهێنیی سەرکەوتنی مەك سێنات لە شەوق و هەژانە بێ وێنەکەیدا بوو. ئەو سەیرکەرێکی باش بوو و بە شتێك کە بە لایەوە پێکەنیناوی بوو، لە ناخی دڵەوە پێدەکەنی. بە بینینی جووڵەکانی من ئەوەندە پێکەنیبوو خەریك بوو دەبووڕایەوە. ئەوەش هانی دام و دەستم کرد بە باسکردنی کەسایەتیی پاڵەوانەکە و گوتم:

_ وەکوو دەزانن ئەم پاڵەوانە چەندین کەسایەتیی هەیە. ئەو لە هەمان کاتدا هەم وێڵگەڕە و هەمیش نەجیبزادەیە" هەم شاعیرە و هەمیش خەیاڵاوی و گۆشەگیر و بەردەوامیش بیر لە بەسەرهات‌و کارەساتە خەیاڵییەکان دەکاتەوە. دەیەوێت ناچارتان بکات کە دان بەوەدا بنێن کە ئەو کەسێکی بیرمەندە، مۆسیقازانە، «دووك»ە، گۆڵفیش دەزانێت. بەڵام ترسیشی لەوە نییە کە قونچکە جگەرە لە زەوی هەڵبگرێت یان نوقڵی دەسی منداڵێك بڕفێنێت و بێگومان ئەگەر بۆی بڕەخسێت.... . وە دیارە ئەگەر تووڕەش بێت، ترسی لەوە نییە کە شەقێك لە قنگی ژنێك بدات کە بە شەقامێکدا تێدەپەڕێت...

من هەروا بەردەوام و بۆ ماوەی ١٠ خولەك قسەم کرد و سێناتیش بۆ خۆی پێ دەکەنی. ئاخرەکەی گوتی:

_ باشه ئیتر بەسە. ئێستا وەرە سەر شانۆ با بزانم لەوێ چۆن پیاوێکیت! وەك چۆن لە فیلمەکەی لۆرمەندا دەربارەی ناوەڕۆکی فیلمەکە هیچم نەدەزانی، لێرەشدا بە هەمان شێوە لە ناوەڕۆکی فیلمەکە بێ ئاگا بووم و تەنیا ئەوەم دەزانیی کە مابێل نۆرماند هەندێ کێشەی لەگەڵ مێردەکەی و هەروەها لەگەڵ هاوڕێ داوێن پیسەکەیدا هەیە.

لە نواندنی کۆمێدیدا ئەو شێوازەی کە ئەکتەر دەیگرێتەبەر زۆر گرینگە و دۆزینەوەی ئەو شێوازەش هەمیشە ئاسان نییە. هەرچۆنێك بێت لە بەرهەیوانی ئەو هۆتێلەدا هەستم بەوە دەکرد کە مرۆڤێکی زیادەم و گەرەکمە خۆم وەك مشتەرییەك بسەپێنم، لە کاتێکدا تەنیا وێڵگەڕێکی بێ ماڵ و حاڵ بووم و هەر ئەوەم مەبەست بوو شوێنێکم هەبێت تێیدا پاڵ کەوم ﴿و بـحەسێمەوە﴾. چوومە ناو هۆتێلەوە و بەدەم لەتر لێدانەوە قاچم دای لە قاچی ژنێك. گەڕامەوە و بۆ داوای لێبوردن کڵاوەکەم لەسەرم هەڵگرت و دیسان کەوتـمەڕێ و ئەمـجارەیان قاچم دای لە سەتڵە زبڵێك(تەنەکەی خۆڵ). دیسان گەڕامەوە و بۆ داوای لێبوردن لە سەتڵەکە کڵاوەکەم لەسەرم هەڵگرت!! ئەوانەی کە لە پشت کامێراوە بوون، ئەوەندە پێکەنیبوون بوورانەوە.

لە پڕێکدا دیم خەڵکێکی زۆر لە دەورمان کۆ بووەتەوە کە زۆربەشیان ئەکتەری گرووپەکانی دیکە بوون کە بۆ سەیرکردنی ئێمە، تەمرینەکانی خۆیانیان جێ هێشتبوو و هەروەها هەندێکیشیان بەرپرسی مەکینەکان و دارتاشەکان و بەرپرسانی کەلوپەلی سەر شانۆ بوون. کاتێکش تەمرینەکەمان تەواو بوو، خەڵکێکی زۆر بۆ سەیرکردنـمان کۆ بوبووەوە و هەمووشیان بە قاقا پێدەکەنین. زۆری نەخایاند فۆرد ئسترلینگم بینی. ئەویش لەسەر شانی خەڵکەکەدا راوەستابوو و تەماشای ئێمەی دەکرد. کاتێك کارەکەمان تەواو بوو، زانیم حەشرم کردووە.

لە کۆتایی ڕۆژدا کاتێك گەڕامەوە بۆ ژوورەکەی خۆم، چاوم بە فۆرد ئسترلینگ و ڕۆسکۆئارباکێل کەوت کە خەریکی پاککردنەوەی گریـمەکانیان بوون. تەنیا چەند وشەیەك پێکەوە قسەمان کرد کە ئەویش زیاتر لە تانە و توانج دەچوو. فۆرد و ڕۆسکۆ هەردووکیان خۆشیان دەویستم بەڵام من بە ئاشکرا هەستم بەوە دەکرد کە پارادۆکسێك لە ئیحساساتیاندا هەیە. رووبەری شانۆکە زۆر بەرفراوان بوو و ٧٥ فووت دەبوو. ئاغای سێنات و ئاغای لۆرمەن دوای تەمرینەکە باسیان ئەوەیان دەکرد کە ئاخۆ رووبەری شانۆکە وەك خۆی بهێڵنەوە یان کەمتری بکەنەوە، چونکە رووبەری پێویست بۆ کۆمێدیی بە دەگمەن لە ١٠ فووت تێپەڕی دەکرد. من گوتم:



_ ئەگەر نواندن بە راستی پێکەنیناوی بێت دیارە رووبەری شانۆ گرینگییەکی ئەوتۆی نییە؟

ئەوەش وای لێکردن هەمان ٧٥ فووتەکە بهێڵنەوە. ئەو جلەش کە بۆخۆمم هەڵبژاردبوو، وام هەست دەکرد کەسایەتییەکی پێ بەخشیبووم هەربۆیە بڕیارم دا کە لە هەموو شانۆیەك و لە هەر بارودۆخێکدا کەڵکی لێ وەربگرم.

ئەو شەوە لەگەڵ یەکێك لە هاوڕێ ئەکتەرەکانـمدا بە شەمەندەفەر گەڕامەوە بۆ ماڵەوە. لەناو رێگەدا هاوڕێکەم پێی گوتم:

_ هاوڕێ! ئەوەی راستی بێت تۆ ئەمڕۆ شتێکت دۆزییەوە. تا ئێستا هیچ کەس تەنانەت فۆرد ئسترلینگیش نەیتوانیوە لەسەر تەمرین ئەوەندە خەڵك بێنێتە پێکەنین..ئەگەر چاوت لێ دەبوو ئسترلینگ کاتێك تەماشای دەکردی چی لێ هاتبوو...ئەوەی دێنا تەماشایەکی بکەیت.

منیش بۆ ئەوەی کە بەسەر ئەو هەموو شەوق و هەژانەی خۆمدا زاڵ ببم، لە وەڵامدا گوتم:

_ هیوادارم لە هۆڵی سینەماشدا بینەران ئەوەندە پێ بکەنن.

***

چەند ڕۆژ دواتر لە باڕی ئەلکساندردا، فۆرد ئسترلینگم نەکاوگیر کرد کە خەریك بوو ڕۆڵەکی منی بۆ هاوڕێ هاوبەشەکەمان واتە ئەلـمەرئەلسورس دەگێڕایەوە و دەیگوت:

_ ئەو کوڕە پانتۆڵێکی پان و پۆڕی لە پێدایە و بەو قاچە پانانەیەوە سیمایەکی وەها داماو و بێچارە بە خۆوە دەگرێت کە تا ئێستا لەوە داماوتر هەر نەبینراوە. جووڵەکانی خێرا و کتوپڕ و پچڕپچڕن، وەك بڵێی قرژانگ قەپی پێوە دەکات.... بەڵام بە راستی ئینسانێکی پێکەنیناوییە.

کەسایەتیی من هەندێ جیاوازیی هەبوو لەگەڵ ئەو شتانەی ئەو باسی دەکرد، بەڵام ئامریکاییەکان ئەوەیان نەدەزانی و تازە بۆ خۆشم نەمدەزانی. بەهەرحاڵ بەو جڵانەی کە بۆ خۆمم هەڵبژاردبوو، هەستم دەکرد کەسایەتییەکی راستەقینە و بوونەوەرێکی زیندووە. ئەوەی راستیی بێت ئەو جڵانە چەندین بیرۆکەی پێکەنیناویی لە مندا دەورووژاند کە تا پێش گریم و لەبەرکردنی جلوبەرگ بە شێوەی ئینسانێکی وێڵگەڕ، هەرگیز بە مێشکمدا نەهاتبوو.

من لەگەڵ ئەکتەرێکی پلە دوودا بووبوومە هاوڕێ و هەموو شەوێك کە بە شەمەندەفەر دەگەڕاینەوە بۆ ماڵەوە، هەندێ زانیاریی دەربارەی راوبۆچوونی بەشداربووانی ستۆدیۆی پێ دەدام و پێکەوە قسەمان لەسەر ئەو بیرۆکە پێکەنیناوییانە دەکرد کە بە مێشکماندا دەهات. بۆ نـموونە

دەیوت:«ئەو جوولەیەی تۆ زۆر جوان و پێکەنیناوییە کە پەنجەکانت لەناو ئاودا تەڕ کرد و پاشانیش بە ردێنی فائۆریی پیرەمێردەکە پاکت کردنەوە.... تەماشاچییەکان هەرگیز شتی لەو جۆرەیان نەبینیوە»“ هەر بەوجۆرە درێژەی بە پیاهەڵدانی جوولەکانی من دەدا و منیش لەناو خۆشحاڵییدا نوقم دەبووم.

لە ژێر چاودێریی سێناتدا هەستم بە ئارامی دەکرد چونکە هەموو شتێك بە کتوپڕیی لەسەر شانۆدا دەخولقێندرا. لەبەر ئەوەی کە هیچ کەس لە خۆی دڵنیا نەبوو(تەنانەت دیکۆراتۆر) بەو دەرەنجامە گەییشتم کە زانیاریی من ﴿لەوانی تر تەنانەت﴾لەوەی تەنیشتم کەمتر نییە و هەر ئەوەش دڵگەرمی دەکردم. کەم کەم هەندێ بیروڕام دەربڕی کە سێنات بە خۆشحاڵییەوە قبووڵی دەکردن. بەمجۆرە ئەو فکرەیە لە مندا هاتە ئاراوە کە خاوەن زەوق و بەهرەیەکی داهێنەرانەم و دەتوانم سناریۆکانی خۆم بنووسم. ئەو بیرۆکەیەش بە هۆی سێناتەوە کەوتبووە مێشکمەوە. ئەگەرچی سێنات منی بەلاوە پەسەند بوو، بەڵام هێشتا مابووی بە لای خەڵکیشەوە پەسەند بم.

بۆ فیلمی دواتر دیسان منیان سپاردەوە دەستی لۆرمەن. ئەو قەرار بوو سێنات بەجێ بیڵێت و لەگەڵ فۆرد ئسترلینگدا بڕوات، بەڵام بۆ ئەوی کە خزمەتێکی بە سێنات کردبێت، دوو حەفتە زیاتر لە ماوەی گرێبەستەکەی خۆی مایەوە و کاری کرد. کاتێك لەگەڵ ئەودا دەستم بە کار کرد، هێشتا هەزاران راوبۆچوونم هەبوو کە دەمویست دەریان ببڕم. ئەویش دەم بە بزەوە گوێی لە قسەکانم دەگرت بەڵام هیچکامی قبووڵ نەدەکردن و دەیوت:

_ رەنگە ئەوە﴿ی تۆ دەیڵێی﴾بۆ سەر شانۆ شانۆی پێکەنیناویی و سەرنجڕاکێش بن بەڵام ئێمە لە سینەمادا کاتی خۆخەریك کردن بەو شتانەمان نییە. لە سینەمادا پێویستمان بە جوولە هەیە:کۆمێدیی تەنیا بیانوویەکە بۆ درێژەدان بە نواندن و داهێنانی.

من لەو رووەوە لەگەڵیدا هاوڕا نەبووم و لە وەڵامدا گوتم:

_جوولەی پێکەنیناویی پێکەنیناوییە جا چ لە سینەمادا بێت یاخود لە شانۆدا.

بەڵام ئەو سوور بوو لەسەر ئەو میتۆدەی کە تا ئەو دەمە لە ستۆدیۆی کیستۆندا باو بووبوو. هەموو جوولەیەك دەبێ خێرا بێت:بە واتایەکی تر دەبێ رابکەیت و بە خێرایی بچیتە سەربانی ماڵەکان و بپەڕیتە سەر میچی شەمەندەفەر و خۆ هەڵبدەیتە ناو رووبارەکان و لەسەر سەکۆی مەلەوانگەکانەوە خۆ هەڵباویتە ناو ئاوەوە و نابێ چرکەیەك کات بە فیڕۆ بدەیت. من سەرەڕای بیروڕاکانی ئەو سەبارەت



بە کۆمێدیی، هەندێ جار دەمتوانی بڕێك لە جوولە کۆمێدییە پێکەنیناوییەکانی خۆم تێکەڵی دەستوور و فرمانەکانی ئەو بکەم، بەڵام ئەویش وەکوو هەمیشە لە کاتی مۆنتاژدا دەیقرتاندن.

پێم وانییە لۆرمەن هەرگیز لە لای سێناتدا وەسفی ﴿تواناییەکانی﴾ منی کردبێت. پاش چوونی لۆرمەن، منیان سپارد بە دەرهێنەرێکی تر بە ناوی ئاغای«نیکۆڵس»کە پیاوێك بوو تەمەنی نزیکەی ٦٠ ساڵ دەبوو و هەر لە سەرەتای دەسپێکردنی سینەماوە لەناو ئەو کارەدا بووبوو. لەگەڵ ئەویشدا هەمان کێشەکانی جارانم هەبوو. ئەو بیجگە لە جوولەیەکی پێکەنیناویی هیچی تری نەدەزانی و ئەویش بریتی بوو لە گرتنی ملی ئەکتەر و پاڵ پێوەنانی لە دیمەنێکەوە بۆ دیمەنێکی تر. من هەوڵم دا تەکنیکێکی جوانتر و پێکەنیناویتری فێر بکەم بەڵام ئەویش هەرگیز قبووڵی نەکرد.

قیڕاندی بە سەرمدا و گوتی:

_ کاکە! ئێمە کەی کاتی ئەو کارانەمان هەیە.

تەنیا شتێك کە ئەو لە منی دەویست ئەوە بوو کە بێ سێ و دوو لاسایی فۆرد ئسترلینگ بکەمەوە. هەرچەند من بە نهێنیی و لە پشتەسەردا نارەزاییم دەردەبڕی، بەڵام ئاخرەکەی ئاغای نیکۆڵس قسەکانی منی گێڕابووەوە و پێی وتبوو کە کارکردن لەگەڵ مندا کارێکی سەخت و تاقەت پڕووکێن و قێزەونە.

هەر لەو کاتانەدا سێنات، فیلمێکی دەرهێنابوو بە ناوی«بەسەرهاتە سەیرەکەی مابێل» کە لە شاردا نمایش دەکرا. من بە ترس و لەرزەوە تێکەڵی خەڵکەکەی تر دەبووم و دەچووم بۆ بینینی. کاتێك فۆرد ئسترلینگ لەسەر پەردە دەردەکەوت، شەپۆلێکی شادی و خۆشی و پێکەنین خەڵکەکەی دەگرتەوە و هەموو دەیاندا لە قاقای پێکەنین، بەڵام بە هاتنی من جەماوەر بێدەنگ دەبوو و پێشوازییەکی ئەوتۆم لێ نەدەکرا. هەموو ئەو شیرینکارییانەی کە لە بەردەم هۆتێلەکەدا کردبووم، بە سەختیی بزەیەکی دەخستە سەر دەمی خەڵك. بەڵام کە وردە وردە فیلمەکە درێژەی دەکێشا چەندین پێکەنینی قەتیس ماو لە گەرووەکاندا، لەناو هۆڵی سینەماکەدا دەنگی دایەوە، پاشان پێکەنین بەرزتر و ئاشکراتر بوو و لە کۆتایی فیلمەکەشدا دەنگی پێکەنینی هەرە بەرز دەبیسترا. لەوێدا زانیم کە تەماشاچی دەکرێت لە ئاست کەسێکی تازە دەرکەوتوودا بێ لایەن بێت.

گومانم لەوە هەیە کە ئەم کارەی یەکەمم توانیبێتی چاوەڕوانیی سێنات بێنێتە دی و تەنانەت وابزانم دڵساردیش بووەوە. یەك دوو رۆژ دواتر هات بۆ لام و بە راشکاوانە پێی گوتم:

_ گوێ بگرە! لەوە دەچێت کارکردن لەگەڵ تۆدا ئاسان نەبێت.

هەوڵم دا تێی بگەیەنم کە من ئینسانێکی بە ویژدانم و جگە لە هەوڵدان بۆ باشتر کردنی فیلم، بیر لە شتی تر ناکەمەوە. بەڵام ئەو بە دەنگێکی نزمەوە دیسان گوتی:

_ کەواتە تەنیا ئەو شتە ئەنجام بدە کە داوات لێ دەکەن. حەتمەن رازیی دەبیت.

بەڵام رۆژی دواتریش لەگەڵ ئاغای نیکۆڵسدا هەرایەکی ترمان لێ کەوتەوە. ناچار بەسەریدا قیڕاندم و گوتم:

_ هەر رەشە ئەکتەرێك کە رۆژێك ٣ دۆلاری بدەنێ دەتوانێت ئەو کارەی کە ئێوە لێی داوا بکەن ئەنجام بدات. من دەمەوێ شتێك پێشکەش بکەم کە نرخی خۆی هەبێت، نەك ئەوەی کە خۆم زەحمەت بدەم و لەسەر شەمەندەفەر خۆم هەڵباوێمە خوارەوە. من حەفتەی ١٥٠ دۆلار وەرناگرم بۆ ئەوەی تەنیا کاری لەو جۆرە بکەم.

بابا نیکۆڵس ئەو پیرە پیاوە داماوە(ئێمە پێمان دەوت بابا نیکۆڵس) دیارە زۆر دڵتەنگ و شێواو بوو. لەو حاڵەدا بە مینگە مینگ گوتی:

_ من زیاتر لە ١٠ ساڵە ئەو کارە دەکەم. تۆ چووزانیت؟

ویستم بە بەڵگەوە بۆی بسەلمێنم، بەڵام فایدەی نەبوو. ویستم بە بەڵگەوە لەگەڵ ئەندامانی گرووپدا قسە بکەم و تێیان بگەیەنم، بەڵام ئەوانیش ناکۆك بوون لەگەڵمدا. ئەکتەرێکی پیر گوتی:

_ کاکە واز بێنە! تۆ دەڵێی چی! ئەم پیاوە زۆر شارەزایە و چەندین ساڵە ئەوە کاریەتی.

هەرچەندمۆنتێرەکانی هۆڵی سینەما، فیلمەکانیان پارچەپارچە دەکرد، بەڵام لەدوو سێ فیلمدا توانیم هەندێ لە شیرینکارییەکانم لە کاتی چوونە ژوورەوە یان هاتنە دەرەوەدا ئەنجام بدەم، چونکە قرتاندنی فیلم لەو شوێنانەدا بۆیان دژوار دەبوو. من لە هەموو دەرفەتێك بۆ فێربوونی کارەکەم کەڵکم وەردەگرت. لە ژووری دابەشکردنی فیلمەوە دەچوومە ژووری مۆنتاژکردنی فیلم و تەماشای دەستی مۆنتێرەکانم دەکرد.

لەوە بەدوا حەزم دەکرد خۆم سناریۆی کۆمێدیی بنووسم و خۆشم بیانبەمە سەر شانۆ و لەگەڵ ئاغای سێناتیشدا باسی ئەو حەزەی خۆمم کرد بەڵام ئەو قبووڵی نەکرد و لە جیاتی ئەوەی کە ئیجازەی ئەو کارەم بداتێ، بە پێچەوانەوە دامیە دەستی مابێل نۆرماند کە تازە دەستی کردبوو بە نمایشکردنی فیلمەکانی. ئەو هەڵسوکەوتەم زۆر بەلاوە ناخۆش بوو چونکە هەرچەند مابێل زۆر جوان



و شۆخ و شەنگ بوو، بەڵام ئەوم بە دەرهێنەرێکی بەتوانا نەدەزانی. هەر ئەوەش وای کرد ئەو شتەی کە نەدەبوو روویدابایە رووی دا. لە دەرەوەی ستۆدیۆدا واتە لە گوندەکانی دەوروبەری لۆس ئانجلێسدا کاری وێنەگرتنمان دەکرد و بۆ یەکێك لە سێکانسەکانی فیلمەکە مابێل پێی گوتم کە شلەنگێك هەڵبگرم و لە ناوەڕاستی جادەدا راوەستم و جادەکە تەڕ بکەم تا ئوتۆمبێلی ئەو خائینەی کە بە دوایەوە بووین، لەسەر جادەکە بخلیسکێت و وەرگەڕێت. من پێشنیارم کرد کە بەسەر سۆندەکەدا بڕۆم و نەشهڵێم ئاوی لێ بێتە دەرێ و پاشانیش بە بیانووی ئەوەی کە سەری بۆڕییەکە تاقی دەکەمەوە کە ئاخۆ بۆچی ئاوی لێ نایەت و سەری بۆڕیەکەشم گرتوە بەر لووتم و بێ ئەوەی بە خۆم بزانم قاچم لەسەر بۆڕییەکە لا دەبەم و ئاوەکە لە دەموچاوم دەپژێت. بەڵام مابێل گوتی بێدەنگ بم و هەروەها گوتیشی:

_ ئێمە کاتی زۆرمان نییە! کاتمان نییە! هەرچییەکیان گوت هەر ئەوە بکە و هیچی تر! .

ئیتر تەواو تووڕە بووم و لەوە زیاتر نەمدەتوانی تەحەمول بکەم...بە تایبەت کچێکی جوانی وەك مابێل.

تۆزێك خۆم گۆڕی و گوتم:

_ بە داخەوەم خانمی مابێل، من لەو کەسانە نیم هەرچییەکم پێ بڵێن بیکەم و پێشم وا نییە تۆ شیاوی ئەوە بیت پێم بڵێیت چی بکەم و چی نەکەم! .

ئەو شتە رێك لە ناوەڕاستی جادەدا رووی دا. من چووم و لە شۆستەکەدا دانیشتم. مابێلی نازەنین! لەو کاتەدا تەمەنی تەنیا ٢٠ ساڵ بوو و زۆریش جوان و لەبەردڵان بوو. هەمووان خۆشیان دەویست و گوڵی خۆشەویستی ناو ئەو تاقمە بوو. ئەویش لە تەنیشت کامێرای وێنەگرتنەکەدا دانیشت و حاڵەتێکی دۆشداماوی و سەرسووڕمانی بە خۆوە گرتبوو. تا ئەو کاتە کەس بەو تووڕەییەوە قسەی لەگەڵ نەکردبوو. منیش زۆر حەزم لە جوانییەکەی بوو و لە ناخی دڵەوە خۆشم دەویست، بەڵام کارەکەشم بەلاوە گرینگ بوو. دەسبەجێ تەکنسیەنەکان و ئەکتەرەکانی گرووپ، لە دەوری مابێل کۆ بوونەوە و دەستیان کرد بە قسە و باسکردن. مابێل دواتر بۆی گێڕامەوە کە یەك دوو کەس لە رەشە ئەکتەرەکان ویستوویانە بە مستەکۆڵە چەناگەم بشکێنن بەڵام ئەو نەیهێشتووە. دوای ئەو رووداوە مابێل یاریدەدەرەکانی خۆی ناردە لام تا پرسیارم لێ بکەن ئاخۆ حازرم سەرلەنوێ وێنەگرتنەکە دەس

پێ بکەینەوە یان نا؟ منیش لە جادە پەڕیــمەوە و چوومە لای مابێل و بە دەنگێك کە داوای لێبوردنی تێدا دیار بوو، گوتم:

_ داوای لێبوردن دەکەم. ئەگەر رەفتارێکی وام کرد تەنیا لەبەر ئەوە بوو کە من ئەو کارە، نە بە پێکەنیناویی دەزانم، نە سەرنــجڕاکێش. بەڵام ئەگەر مۆڵەتم بدەنێ من چەند جووڵەیەکی پێکەنیناویتان پێ پێشنیار دەکەم....

ئەو تەنانەت حازر نەبوو گوێم لێ بگرێت و گوتی:

_ باشە، ئەگەر تۆ ئەو شتەی کە پێت دەڵێن ئەنــجام نادەیت کەواتە با بگەڕێینەوە بۆ ستۆدیۆ!
.

بارودۆخێکی نالەبار هاتبووە ئاراوە، بەڵام من چۆکم دادا و بە ناچار شانێکم هەڵخست. کاتی زۆرمان بە فیڕۆ چووبوو، چونکە لە کاتژمێر ٩ ی بەیانییەوە دەستمان بە وێنەگرتن کردبوو و کاتژمێر لە ٥ ی ئێوارە لای دابوو و رۆژیش خەریك بوو ئاوا دەبوو.

لە ستۆدیۆدا خەریکی پاککردنەوەی مکیاج(گریــم)ەکەم بووم کە سێنات بە بۆڵەبۆڵ هاتە ناو ژوورەکەم و گوتی:

_ هەی چەتیو! ئەم ئاژاوەیە چییە ناوتەتەوە.

ویستم بۆی روون بکەمەوە و گوتم:

_ چیرۆکەکە پێویستی بە هەندێ شیرینکاریی تر هەیە بەڵام خانــمی نۆرماند ئامادە نییە هیچ را و بۆچوونێك قبووڵ بکات.

گوتی:

_ یان ئەو شتەی کە پێت دەڵێن بێ سێ و دوو بیکە، یان ملت بشکێنە و بڕۆ! . گرێبەستیشت هەیە یان نیتە چاوت دەرهات. تێ گەییشتی! .

من هەروا بە ئارامیی دانیشتبووم. گوتم:

_ ئاغای سێنات! من پێش ئەوەش بێم بۆ ئێرە نانی خۆمم پەیدا دەکرد و برسی نەبووم. دەتەوێ دەرم بکەیت، باشە، بکە! بەڵام ئەوەش بزانە کە من ئینسانێکی بە ویژدان و دڵسۆزم و هێندەی خودی خۆت حەز دەکەم فیلمی چاك بەرهەم بێنین.

ئەویش بێ ئەوەی هیچ قسەیەك بکات دەرگاکەی بە یەکدا دا و چووە دەرەوە.



ئەو شەوە کاتێك لەگەڵ هاوڕێکەمدا بە شەمەندەفەر دەهاتینەوە بۆ شار ئەو بەسەرهاتانەم بۆ گێڕایەوە. پێی گوتم:

_ بەداخەوەم کە شتی وا رووی داوە. کەواتە تۆ تەپ و تۆزت کردووە! .

لەبەر ئەوەی کە دڵەڕاوکێ و نیگەرانیەکەشم شاردبێتەوە، خۆم وەك کەسێکی شاد پیشان دا و گوتم :

_ باشە تۆ پێت وایە دەرم دەکەن؟

گوتی:

_ ئەگەر دەرت بکەن جێی سەرسووڕمان نییە. کاتێك سێنات لە ژوورەکەت هاتە دەرەوە زۆر تووڕە دەهاتە بەرچاو.

وتم:

_ بە دەرەك کە دەرم دەکەن! من ١٥٠٠ دۆلارم پاشەکەوت کردووە و ئەو پارەیە بەشی گەڕانەوەم بۆ بەریتانیا دەکات و زیاتریش. بەهەرحاڵ سبەینێش دێم بۆ ستۆدیۆ" ئەگەر نەیانویست ئیتر چارە نییە، بە جێی دێڵم.

کاتژمێر ٨ ی بەیانیی رۆژی دواتر دەبوایە هەموومان لە ستۆدیۆدا ئامادە بین. من نەمدەزانی دەبێ چی بکەم. لە ژوورەکەی خۆمدا دانیشتم بەڵام گریــم نەکرد. ١٠ خولەکی مابوو بۆ کاتژمێر هەشت، سێنات سەری لە درزی دەرگای ژوورەکەمەوە هێنایە ناوەوە و بە دەنگێکی دۆستانە و دڵۆڤانانەوە گوتی:

_ چارلی! دەمەوێ قسەت لەگەڵدا بکەم. وەرە بچین بۆ ژوورەکەی مابێل.

من هەستابوومەوە سەر پێ، دوای کەوتم و گوتم:

_ باشە ئاغای سێنات.

مابێل لە ژوورەکەی خۆیدا نەبوو و لە ژووری مۆنتاژدا خەریکی بینینی ئەو فیلمانە بوو کە وێنە گیرابوون.

کاتێك دانیشتین مەك سێنات گوتی:

_ گوێ بگرە چارلی! مابێل تۆی زۆر خۆش دەوێ، ئێمەش هەموومان تۆمان زۆر خۆش دەوێ و پێمان وایە تۆ ئەکتەرێکی گەورە و بەڕێزیت.

من كە تەواو سەرم لەو گۆڕانە كتوپڕە سووڕ مابوو، دەسبەجێ سفرەی دڵم كردەوە و گوتم:

_ بێگومان من ڕێزی تایبەتیم بۆ خانـمی نۆرماند هەیە و زۆریش دەسخۆشیی لێ دەكەم بەڵام پێم وا نییە ئەو كەسێكی شیاو و شایستە بێت بۆ ڕازاندنەوەی دیكۆر و دەرهێنانی فیلم... جیا لە هەمموو ئەمانەش، ئەو زۆر گەنـجە.

سێنات دەستی خستە سەر شانم و گوتی:

_ تۆ چۆن بیر دەكەیتەوە ئازادیت، بەڵام ئەو كەڵلەڕەقییەت بـخە لاوە و بیر لە هاوكاریی و هاریكاریی بكەرەوە! .

_ جا ئەوە ڕێك ئەو شتەیە كە من دەیكەم.

_ كەواتە هەوڵ بدە لەگەڵ مابێلدا ڕێك بكەویت.

من پێشنیارم كرد گو وتم:

_ گوێ بگرن! :ئەگەر ئێوە مۆڵەتم بدەنێ خۆم كاری دەرهێنان بكەم، بەڵێنتان دەدەمێ هیچ كێشەیەكتان بۆ دروست نابێت.

مەك چركەیەك بێدەنگ بوو و دواجار گوتی:

_ ئەگەر هیچ كڕیارێك فیلمەكەی بە دڵ نەبوو، كێ خەرجی فیلمەكە دەدات؟

گوتم:

_ من! من ئامادەم هەر ئێستاكە ١٥٠٠ دۆلار وەكوو بارمتە لە بانكێكدا دابنێم و ئەگەر فیلمەكە نەفرۆشرا، ئێوە ئەو پارەیە بۆ خۆتان هەڵگرن.

مەك بڕێك بیری كردەوە و گوتی:

_ هیچ سناریۆیەكت بۆ فیلمەكە هەیە؟

_ بەڵێ هەمە. تا حەز بكەیت.

مەك گوتی:

_ باشە تۆ ئەم فیلمە لەگەڵ مابێلدا تەواو بكە تا من بیری لێ بكەمەوە.

زۆر میهرەبانانە دەستمان نایە ناو دەستی یەكدیی. دوای ئەوەش یەكسەر چووم بۆ لای مابێل و زۆر داوای لێبووردنم لێ كرد. ئەو شەوە سێنات هەردووكمانی داوەتی نانی ئێوارە كرد. بەیانیی ڕۆژی دواتر مابێل ئەوەندە بەئەدەب و مێهرەبان بووبوو كە هەر نەبێتەوە. تەنانەت میهرەبانییەكەشی



گەییشتە ڕادەیەك كە داوای لێ كردم بیر و بۆچوونەكانم بە ڕاشكاوانە پێشكەش بكەم. هەر ئەوەش وای كرد كە لەناو حەپەساویی و سەرسووڕمانی تەكنسیەنەكان و ئەندامانی تری گرووپەكەدا و بە بێ ئەوەی هیچ دەنگە دەنگێك بكەین، فیلمەكەمان تەواو كرد. بەڵام من بە هۆی ئەو وەرچەرخانە ڕەفتارییەی سێناتەوە تەواو سەرم سووڕ مابوو. دیارە چەندین مانگ دواتر بەوەم زانی كە سێنات بڕیاری دابوو لە كۆتایی ئەو حەفتەیەدا دەرم بكات، بەڵام ڕۆژێك دوای ئەو كێشەیەی نێوان من و مابێل، تەلگرافێكی لە ئۆفیسی نیویۆركەوە بۆ هاتبوو بەم ناوەڕۆكە: هەر چۆنێك بووە زۆرترین فیلم لە چارلی چاپلین دروست بكە، چونكە داواكاریی زۆرمان بۆ فیلمەكانی هەیە.

ژمارەی ئەو نوسخانەی كە بۆ فیلمێكی كۆمێدیی داوایان دەكرد، ٢٠ دانە بوو و ئەگەر بگەیشتایەتە ٣٠ دانە، ئەوە بە سەركەوتنێكی گەورە لە قەڵەم دەدرا. دوایین فیلم واتە فیلمی چوارەم كە لە منیان دروست كرد، دواكاریی ٤٥ دانەی لەسەر بوو و هێشتا بەردەوام داواكاریی تازەش دەهات. لە ڕاستیدا هۆی ڕەفتارە خۆشەكەی مەك سێنات دوای وەرگرتنی ئەو تەلگرافەش هەر ئەوە بوو.

بنەما و چۆنیەتیی دەرهێنان﴿ی فیلم﴾ لەو سەردەمەدا زۆر ئاسان بوو، هێندەی كە بۆ چوونەژوورەوەكان و هاتنە دەرەوەكان ئەوەندەت بەس بوو دەسی چەپ و ڕاستی خۆت بناسیت. هەركاتێك لە كۆتایی سێكانسێكدا لە لای ڕاستەوە بهاتنایە دەرەوە، بۆ سێكانسی دوایی لە لای چەپەوە دەچوونە ژوورەوە. هەركاتێك بەرەڕووی كامێرا دەچوونە دەرەوە، لە كاتی هاتنە ناوەوەدا دەبوایە پشتیان لە كامێرا بوایە و دیارە هەر ئەم شتانەش بنەڕەتییترین بنەما و چوارچێوەكان بوون.

بەڵام كاتێك ئەزموونم زیاتر بوو، لەو مەسەلەیە تێگەییشتم كە شوێنی كامێرا تەنیا دەورێكی سایكۆلۆژیكی نییە بەڵكوو بە گرینگترین كۆڵەكەی شانۆ دێتە ئەژمار. لەڕاستییدا شوێنی كامێرا، بنەما و بنەڕەتی شێوازی سینەماییە. بۆ نـموونە ئەگەر كامێرا دوورتر یان نزیكتر بێت، هەر ئەوە بەسە بۆ ئەوەی بەرهەمێك باش دەربچێت یان خراپ. لەبەر ئەوەی كە دەس پێوەگرتن لە جووڵاندا زۆر گرینگە، هەر بۆیە گونـجاو نییە ئەكتەرێك بێهوودە و بە بێ هیچ ئامانـجێكی دیاریكراو بە ڕێگەدا بڕوات، چونكە بەڕێگەداچوون خۆی لە خۆیدا كارێكی سەرنـجڕاكێش و دراماتیك نییە. كەواتە دەبێ كامێرا لە شوێنێكدا بێت كە كۆمپۆزیسیۆن پێك بهێنێت و ئەو دەرفەتەش بە ئەكتەر بدات كە لە باشترین حاڵەتدا بچێتە سەر شانۆ. لەڕاستیدا شوێنی كامێرا، شێوەزاری زمانی سینەماییە. بە گشتیی ناتوانین ئیدیعای ئەوە بكەین وێنەیەكی نزیك، زیاتر لە وێنەیەكی دوور، نـمایشی دیـمەنێك

زەقتر نیشان دەدات. ئەمە مەسەلەیەکە پێوەندیی بە هەستەوەرەکانەوە هەیە بەم واتایە کە هەندێ جار وێنەیەکی دوور، شتەکان بەرجستەتر و جوانتر نیشان دەدات.

بۆ نموونە ئەوەندە بەسە ئاماژە بە یەکێك لە کۆمێدییە سەرەتاییەکانی خۆم بکەم بە ناوی«شارلۆت یاریی خلیسکێن دەکات». کەسێکی خوێڕیی دەچێتە ناو دیمەنی خلیسکێنەکەوە و دەست دەکات بە خلیسکان. قاچێکی بەرز کردۆتەوە و دەخلیسکێ و دەسووڕێتەوە و خۆی فڕێ دەداتە سەر ئینسانەکانی تر، یان پاڵیان پێوە دەنێ و قرم و قاڵێك لەو ناوە دروست دەکات و دواجار هەموو خەڵکەکە گێج و سەرسام دەخاتە بەردەم کامێرا و خۆشی بەرەو کۆتایی گۆڕەپانێك دەخلیسکێت و دەڕوات. بە دوور کەوتنەوەشی، کەم کەم لە تارماییەك زیاتر هیچی لێ نامێنێت و دواجار خۆشی دەبێت بە یەکێك لە تەماشاچییەکان و بە شێوەیەکی کزۆڵانە چاو لەو ئاژاوە و هەرایە دەکات کە خۆی پێکی هێناوە. لەو دیمەنەدا تارماییە بچووکە دوورەکە، زۆر پێکەنیناویترە لەو کاتەی کە زۆر گەورە و نزیکە.

کاتێك من دەستم کرد بە رازاندنەوەی دیکۆر و دەرهێنانی یەکەم فیلمی خۆم، تۆزێك ڕاڕا بووم و وەك پێشووتر دڵنیا و دڵ قایم نەبووم و تەنانەت بڕێکیش ترسابووم، بەڵام کاتێك ئاغای مەك سێنات ئەنجامی ڕۆژی یەکەمی وێنەگرتنەکەی بینی، دڵ خۆش بووم. ناوی فیلمەکە ئەمە بوو:«کاوت لە ژێر باراندا». دیارە ئەو فیلمە لە ئاستی خۆیدا شاکار نەبوو بەڵام زۆر پێکەنیناوی بوو و پێشوازیی باشیشی لێ کرا. کاتێك فیلمەکەم تەواو کرد، زۆر پەلەم بوو بزانم هەڵوێستی سێنات لەو بارەیەوە چییە. لە بەردەم دەرگای هاتنەدەرەوەی سینەمادا چاوەڕێی بووم تا لە کاتی هاتنە دەرەوەیدا ببیبنم. پێی گوتم:

_ باشە، حازریت فیلمێکی تر دەربهێنیت؟

لەوە بە دوا خۆم هەموو کۆمێدییەکانی خۆمم دەنووسی و خۆشم کاری دەرهێنانم بۆ دەکردن. سێنات بۆ هاندانی من، دوای تەواوبوونی هەر فیلمێك، ٢٥ دۆلاری وەکوو خەڵات پێ دەدام.

ئیتر لەوە بەدوا بە کردەوە دانی بە مندا نابوو و هەموو شەوێك دەعوەتی نانی ئێوارەی دەکردم. دەربارەی سناریۆی گرووپەکانی تر قسەی لەگەڵ دەکردم و منیش هەندێ بیروڕای سەیروسەمەرە و شێتانەم دەردەبڕی و دەشمزانی ڕەنگە کۆمەڵانی خەڵك لێیان تێ نەگەن. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا سێنات بەدەم پێکەنینەوە هەموو ڕا و بۆچوونەکانمی قبووڵ دەکرد.

کاتێك لەگەڵ جەماوەردا دادەنیشتم و تەماشای فیلمەکانی خۆم دەکردەوە، ئیتر تەماشاچییەکان وەکوو ڕۆژانی یەکەم نەبوون. ئیتر ڕاگەیاندنی نمایشی فیلمێك لە لایەن کۆمپانیای کۆمێدیی



کیستۆنەوە، شەپۆلێکی هەژان و خرۆشانی کەیف و خۆشیی خەڵکی لێ دەکەوتەوە و کاتێك من لەسەر پەردەکە دەردەکەوتم، تەنانەت بە بێ ئەوەی کە هێشتا هیچ کارێکم ئەنجام دابێت، بەزم و خۆشیی و قیژەقیژێکی بێوێنەی لێ دەکەوتەوە. هەموو ئەو شتانەش ئیتر بۆ خەڵك بووبوو بە شتێکی ئاسایی و پێی ڕاهاتبوون. خۆزگە دەمتوانی درێژە بەوجۆرە ژیانە بدەم و بە ڕاستی جگە لەوەش هیچی ترم نەدەویست. لەوەبەدوا بەو پاداشتیشە کە پێیان دەدام، حەفتەیەك ٢٠٠ دۆلار داهاتم هەبوو.

لەو ڕۆژەوەی کە دڵم بەو کارەی خۆم داوە، ئیتر کاتێکی وام نەبوو لە باڕی ئەلکساندریادا بە فیڕۆی بدەم، یان چاوم بەو هاوڕێ ناحەز و خوێنتاڵەم «ئەلمەر ئەلسورس» بکەوێت. دیارە چەند حەفتە دواتر لە بازاڕدا چاوم پێ کەوت. پێی گوتم:

_ ئۆە...چەتیو! لەم ڕۆژانەدا فیلمەکانی تۆم بینی و پێم وایە کەسێکی بەزم خۆش و سەرنجڕاکێشیت، دەزانی؟ تۆ شتێکت لەوانی تر زیاترە! گاڵتە ناکەم...ها! تۆ ئەکتەرێکی پێکەنیناوییت! ئەی بۆچی هەر ئەو ڕۆژانەی یەکەم پێت نەگوتم؟!

دیارە لەوەبەدوا بووینە هاوڕێیی نزیکی یەکدی. من زۆر شت لە کیستۆنەوە فێر بووم و فێری زۆر شتیشم کردن. لەو سەردەمەدا ئەوان شتێکی ئەوتۆیان دەربارەی تەکنیکی دیزاینی دیکۆراسیۆن نەدەزانی و هیچیشیان لەو جووڵانە نەدەزانی کە من لە شانۆوە بۆم هینابوون. لە پانتۆمیمیش هیچیان نەدەزانی. کاری دەرهێنەر هەر ئەوە بوو لە دیمەنێکی بەرتەسکدا بە خۆی و سێ چوار ئەکتەری هیچ و پووچەوە خۆیان لەبەر کامێرادا ریز بکەن. ئنجا لە ڕێگەی هەندێ جووڵە و جرت و فرتەوە، نمایشی خۆیان دەکرد. بۆ نموونە کاتێك ئەکتەرێك دەیویست بڵێ:«من دەمەوێ لەگەڵ کچەکەتدا ژیانی هاوبەش پێك بێنم»، سەرەتا خۆی نیشان دەدا و پاشان ئەنگوستیلە و ئنجا کچە گەنجەکە. شێوازی ئەدا و جووڵەکانیان هیچ جۆرە جوانیی و تواناییەکیان تێدا نەبوو، بۆیە من حەشرم دەکرد. لە فیلمە بەراییەکاندا من ئەوەم دەزانی کە لەوانی تر سەرترم و وەك زەویناسێك پێم ناوەتە زەوییەکی پڕپیت و بەرەکەت و دەست لێ نەدراو و نەدۆزراوەوە. بێگومان ئەو سەردەمەش پڕ هەژانترین و خۆشترین سەردەمی کارکردنم بوو، چونکە گەیبیشتبوومە سەرەتای کارێکی سەرسووڕهێنەر و سەرنجڕاکێشەوە.

سەرکەوتن، سۆز و خۆشەویستیی دەخولقێنێت و منیش لەگەڵ هەموو ئەو کەسانەی کە لە ستۆدیۆدا بوون، بووینە هاوڕێیی یەکتری. من ئیتر لەوە بە دوا لای ڕەشە ئەکتەرەکان و بەرپرسی

